

# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

ژمارە (٢٦) ساڵی ٢٠١٣

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی – القسم العربي



### English part– بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییيەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، کە گۆڤارێکی زانستیی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، دوای ئەوەی هەڵسەنگاندنی زانستییان بۆ دەکرێت، بڵاو دەکاتەوە، بۆیە دەبێ هەموو مەرجەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستییان تێدا رەچاو کرابێت. لێکۆڵینەوەکەش، کە مەرجە لە بارەی کێشەیەکی زانستییەوە بێت و بیرۆکە و لێکدانەوەی نوێی تێدا بێ، دەبێ لە هیچ شوێنێکی تر بڵاو نەکرابێتەوە، یا بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی کوردی زمانی سەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ، بەڵام ڕێگەش دەدرێ لێکۆڵینەوەی بە نرخ بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبکرێنەوە..

٣. هەر بابەتێک کە بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەنێردرێ ، پێویستە ناوونیشانی باس، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤. دەبێ پوختەیەکی باس، بە هەردوو زمانەکەی دی، لە کۆتایی باسەکەدا بنووسرێت. ناشبێ پوختەکە لە ١٥٠ وشە زیاتر بێت و پێویستیشە توێژەر لەو پوختەیەدا گرنگی و ئەنجامەکانی باسەکە بخاتە ڕوو.

٥- هەر کاتێ باس، لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، بە ئەرێنی گەڕایەوە، ئەوا دەستەی نووسەران ڕەزامەندینامەی بڵاوکردنەوە بە توێژەرەکەی دەدات.

٦- هەموو باسەکان بیر و بۆچوونی نووسەرەکانیانن و مەرج نییە بیروڕای دەستەی نووسەران بن.

٧- بۆ ئەوەی بابەت لەگەڵ ڕێنمایی و شێوازی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەدا کۆکبێ، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەربڕین و دەستەواژەی هەیە، ئەوەش بە مەرجێ واتاو بیرۆکەی سەرەکیی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٨ـ ئەگەر باسەكە لە بارەی پەیدۆزیی (تحقیق)ی هەر دەستنووسێكەوە بێت، ئەوا بنەماو ڕێبازە زانستییەكانی ئەم بوارە پەیڕەو دەكرێن و شەش لاپەڕەی كۆپیكراو لە دەستنووسەكە لەگەڵ باسەكەدا هاوپێچ دەكرێن.

٩ـ پەیڕەوكردنی ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باس، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەكارهێنانی سەرچاوە و ڕێكخستنی پەراوێزەكان مەرجی بڵاوكردنەوەیە. هەر باسێك ئەم بنەما زانستییانەی تێدا فەرامۆش كرابێت، لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردیدا بڵاوناكرێتەوە.

١٠ـ باسەكە، لە پاڵ دانەیەكی سەر CD، بە سێ دانە لە سەر كاغەزی (A٤) چاپ دەكرێت بە مەرجێ ژمارەی لاپەڕەكانی، بە وێنە و نەخشە و لیستی سەرچاوەكانییەوە، لە (٢٥ ) لاپەڕە زیاتر نەبن و بە فۆنتی (١٥)بن و بە Ali-K- Sahifa نووسرابن.

١١ـ ئەگەر بابەتەكە وەرگێڕدرا بوو، دەبێ پەیوەندی بە لایەنێكی كولتووری كوردییەوە هەبێت (زمان، ئەدەب، مێژوو، ... هتد). مەرجیشە كە وەرگێڕانەكە لەو زمانەوە بێت كە لە بنەڕەتدا بابەتەكەی پێ نووسراوە. پێویستە دەقە ئەسڵەكەش هاوپێچ بكرێت.

١٢ـ لەكاتی پێویستدا گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی بەشێكی تەرخان دەكات بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو كتێبانەی لەبارەی كورد و كولتووری كوردییەوە نووسراون چ بە كوردی یان بە هەر زمانێكی دیكە، بە مەرجێك نووسەر ڕەچاوی پێوەرو ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی تیایدا بكات.

# بکەرنادیاری مۆرفۆسینتاکسی

**پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین**
**زانکۆی بەغداد**
**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی**

له زمانی کوردیدا [1] یەك دەستە ڕاناوی جـودا و دوو دەسـتە ڕانـاوی لکـاو هەیە. دابەشبوونیان بە پێی کەس و ژمارە لەم خشتەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

| ژمارە | کەس | ڕاناوی جودا | ڕاناوی لکاو A | ڕاناوی لکاو B |
|---|---|---|---|---|
| تاك | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | × / ێت [٢] |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

له داڕشتەی مۆرفۆسینتاکسیدا:
دەستەی (A) به یەکەم پێشگرەوە دەلکێ ئەگەر کارەکە پێشگردار بوو.
دەستەی (B) هەمیشە وەك پاشگر بە ڕەگی کارەکەوە دەلکێ. [٣]... یاسا ژ١
ئەرکیان لەگەڵ کاری تێپەڕدا لەم خشتەیەدا خراوەتە ڕوو:

| ئەرك | کات: ڕابردوو | کات: داهاتوو |
|---|---|---|
| بکەر | A | B |
| بەرکار | B | A |

یاسا ژ٢

**واتا**

ا) – لەگەڵ کاتی ڕابردوودا دەستەی (A) ئەرکی بکەری و دەستەی (B) ئەرکی بەرکاری دەبینن:

دە – ی – نارد – ین (ئەو ئێمەی دەنارد).
A ڕابردوو B
بکەر بەرکار

٢) – لەگەڵ کاتی داهاتوودا دەستەی (B) ئەرکی بکەری و دەستەی (A) ئەرکی بەرکاری دەبینن:

دە – مان – نێر – یت (تۆ ئێمە دەنێریت).
A داهاتوو B
بەرکار بکەر

**یاسای گوێزانەوەی ڕستەی مۆرفۆسینتاکسی بۆ بکەر نادیار**[٤]

١ – ئەو ڕاناوە لکاوەی ئەرکی بکەری دەبینێ لادەبرێ.

٢ – ڕەگی داهاتووی کارەکە وەردەگیرێ.

٣ – نیشانەی نادیاری (ر) دەخرێتە سەر ڕەگی کارەکە.

٤ – ئەگەر کاتی کارەکە ڕابردوو بێت (ا) ی دەخرێتە سەر. ئەگەر داهاتوو بێت (ێ) ی دەخرێتە سەر.

٥ – ئەگەر کاتی کارەکە داهاتوو بێت ، دەستەی (A) وەك بەرکار دەردەکەوێ. کە ڕستەکە دەکرێتە بکەرنادیار ڕاناوەکە دەگۆڕێ بە ڕاناوی بەرانبەر لە دەستەی (B) دا.

| بکەر نادیار | بکەر دیار |
|---|---|
| B دەبێتە | A |
| | |
| م | م |
| یت | ت |
| ێت | ی |
| ین | مان |
| ن | تان |
| ن | یان |

یاسا ژ ٣

٦ – ئەگەر کاتەکەی ڕابردوو بێت بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە دەستەی (B) یەوە دەبێ. کە ڕستەکە دەکرێتە بکەرنادیار ڕاناوەکە دەگۆڕێ بە ڕاناوی بەرانبەر لە دەستەی (A) دا.

| بکەر نادیار | بکەر دیار |
|---|---|
| A دەبێتە | B |
| | |
| م | م |
| ت | یت |
| ی | ێت |
| مان | ین |
| تان | ن |
| یان | ن |

یاسا ژ ٤

هەردوو یاساکە تێکدەچرژێنرێن:

| داهاتوو | | ڕابردوو | |
|---|---|---|---|
| بکەر نادیار | بکەر دیار | بکەر نادیار | بکەر دیار |
| B | دەبێتە A | A | دەبێتە B |

یاسا ژ ٥

لە ڕستەی:

**دەیناردین** . (ئەو ئێمەی دەنارد).

**دە ـ یـ ـ نارد ـ ین**

(ی) لە دەستەی (A) یەوەیە ( بکەر)ە.

(ین) لە دەستەی (B) یەوەیە (بەرکار)ە.

(نارد) ڕەگی ڕابردووی کارەکەیە.

دە – ی – نارد – ین

A ڕابردوو B

بکەر بەرکار

بۆ گوێزانەوەی ئەم ڕستەیە بۆ بکەرنادیار:

١ – (ی) ی بکەر لادەبرێ.

دە – – نارد – ین

٢ – ڕەگی کاتی داهاتووی کارەکە وەردەگیرێ. دەبێتە (نێر).

دە نێر – ین

٣ – نیشانەی نادیاری (ر) ، دەخرێتە سەر ڕەگی کارەکە:

دە نێر + ڕ – ین

٤ – کاتی کارەکە (نارد) ڕابردووە (ا) ی دەخرێتە سەر.

دە نێر ڕ + ا – ین

ڕستەکە دەبێتە

**دەنێر + ڕ + ا + ین**

**دەنێرراین**

لە ڕستەی

**دەماننێریت** (تۆ ئێمە دەنێریت).

**دە ـ مان ـ نێر ـ یت**

(مان) لە دەستەی (A) یەوەیە ( بەرکار)ە.

(یت) لە دەستەی (B) یەوەیە (بکەر)ە.

(نێر) ڕەگی کارەکەیە.کاتەکەی داهاتووە.

دە – مان – نێر – یت (تۆ ئێمە دەنێریت).

A B

بەرکار بکەر

١ – (یت) ی بکەر لادەبرێ.

دە ـ مان ـ نێر ـ

٢ – ڕەگی کاتی داهاتووی کارەکە وەردەگیرێ. خۆی داهاتووە:

دە ـ مان ـ نێر ـ

٣ – نیشانەی نادیاری (ر) دەخرێتە سەر ڕەگی کارەکە:

دە ـ مان ـ نێر + ڕ ـ

٤ – کاتی کارەکە داهاتووە (ێ) ی دەخرێتە سەر.

دە ـ مان ـ نێر ڕ + ێ

٥ – بە پێی یاسا (ژ٣) ڕاناوەکە ، کە لە دەستەی (A) یەوەیە دەگۆڕێ بە ڕاناوی بەرانبەر لە دەستەی (B) ، (مان) دەبێتە (ین)

دە – (ین) – نێر ڕ ێ

بە پێی یاسا ژ ١ دەستەی (B) هەمیشە وەك پاشگر بەڕەگی کارەکەوە دەلکێ ، ڕستەکە دەبێتە :

دە – نێر + ڕ + ێ – ین

دەنێررێین

## بکەر نادیار لە مۆرفۆسینتاکسی پێشبەندی

مۆرفۆسینتاکسی پێشبەندی ئەو دارشتەیەیە کە تێیدا (بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ) بە ڕاناوی لکاو دەربڕابن. یاسای ڕیزبوونی کەرەسە ڕێزمانییەکانیان بەم جۆرە دەبێ:

**یەکەم – ئەگەر کاتی کارەکە ڕابردوو بێ:**

**پێشبەند – بکەر A { ڕەگی ڕابردوو – بەرکاری ڕاستەوخۆ B – بەرکاری ناڕاستەوخۆ B } ...یاسا ژ ٦**

بۆمان ناردنیت (ئێمە ئەوانمان بۆ تۆ نارد)

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بۆ | – | مان | نارد | – | ن | – | یت |
| | | A | | | B | | B |
| پێشبەند | | بکەر | | | ب.ر | | ب.ن |

دووەم – ئەگەر کاتی کارەکە داهاتوو بێ:

**پێشبەند – بەرکاری ناڕاستەوخۆ A – بەرکاری ڕاستەوخۆ A { ڕەگی داهاتوو – بکەر B } ....یاسا ژ ٧**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بۆ - | تان - | ی | دەنێر - | ین | ( ئێمە ئەوتان بۆ دەنێرین ) |
| پێشبەند | ب.ن | ب.ر | کار | بکەر | |

**بۆ گوێزانەوەی ئەم جۆرە ڕستانە بۆ بکەرنادیار وەك لە گوێزانەوەی ڕستەی ئاساییدا:**

١ – بکەر لادەبرێ.

٢ – ڕەگی داهاتووی کارەکە (ڕ.د) وەردەگیرێ.

٣ – (ر) ی بکەر نادیاری و ئامرازی کاتی دەخرێتە سەر ، (ا) بۆ ڕابردوو و (ێ) بۆ داهاتوو.

ئەگەر کاتی کارەکە ڕابردوو بێ کە تێیدا بکەر بە ڕاناوی لکاوی دەستەی A و هەردوو بەرکار بە دەستەی B دەردەبڕێن. بەرکارە ڕاستەوخۆکە (ب.ر) لە

شوێنی خۆی دەمینێ و بەرکارە ناڕاستەوخۆکە (ب.ن) دەگۆڕێ بە ڕاناوی لکاوی دەستەیِ A ی بەرانبەر و دەچێتە سەر پێشبەندەکە.




وەك لە ڕستەی:

بۆت ناردنین. ( تۆ ئەوانت بۆ ئێمە نارد)

**بۆ ـ ت نارد ـ ن ـ ین.**

بۆ – پێشبەندە

ت – بکەرە سەر بە کۆمەڵی A یە.

نارد ـ کارە لە ڕابردوودایە.

ن – بەرکاری ڕاستەوخۆیە سەر بە دەستەی B یە.

ین – بەرکاری ناڕاستەوخۆیە سەر بە کۆمەڵی B یە.

**بۆ گوێزانەوەی بۆ بکەرنادیار:**

١ ـ بکەر (ت) لادەبرێ. (X)

٢ – بەرکاری ڕاستەوخۆ (ن) لە شوێنی خۆی دەمینێ.

٣ – ڕەگی داهاتووی (ڕ.د) کارەکە وەردەگیرێ. لێرە (نێر) ـە

٤ – کاتی کارەکە ڕابردووە (ا) ی دەچێتەسەر.

٥ – بەرکاری ناڕاستەوخۆکە، کە (ین) ـە، سەر بە دەستەی B یە، دەگۆڕێ بە هی بەرانبەری لە دەستەی A کە (مان) ـە و دەچێتە سەر پێشبەندەکە ، بەم جۆرە:




له ئەنجامدا ڕستەکە دەبێتە:

**بۆمان نێرران.**

ئەگەر کاتی کارەکە داهاتوو بێ کە تێیدا بکەر بە ڕاناوی لکاوی کۆمەڵی B و هەردوو بەرکار بە کۆمەڵیِ A دەردەبڕێن ، بەرکارە ڕاستەوخۆکە (ب.ر) لە شوێنی خۆی دەمینێ و بەرکارە ناڕاستەوخۆکە (ب.ن) دەگۆڕێ بە ڕاناوی لکاوی دەستەیِ B ی بەرانبەر و دەچێتە سەر کارەکە.

**پێشبەند – بەرکاری ناڕاستەوخۆ A – بەرکاری ڕاستەوخۆ A ڕەگی کار – بکەر B**

**کە دەگوێزرێتە نادیاری:**

١ – بکەر کە سەر بە B یە لادەبرێ. (X).

٢ – ڕەگی داهاتووی کارەکە وەردەگیرێ و هەموو کەرەسە ئەسپێکتییەکان لە شوێنی خۆیان دەمینێنەوە.

٣ – (ڕ) ی بکەرنادیاریی دەخرێتە سەر.

٣ – کاتی کارەکە داهاتووە (ێ ) ی دەچێتە سەر.

٤ – بەرکاری ناڕاستەوخۆ کە سەر بە A یە ، لە شوێنی خۆی دەمینێ.

٥ – بەرکاری ڕاستەوخۆ کە سەر بە A یە دەگۆڕێ بە هی بەرانبەری لە B دا و دەچێتە سەر ڕەگی کارەکە.




یاسا ژ ٩

وەك لە ڕستەی :

بۆتانی دەنێرین ( ئێمە ئەو بۆ ئێوە دەنێرین)




بە سەپاندنی یاسای فۆنۆلۆجیی بوونی دوو (ێ) بە یەك ( ێ + ێ = ێ ) ڕستەکە دەبێتە:

**بۆتان دەنێررێت**

بە پێی پێڕەوی collapsing دەشێ هەموو یاساکانی گوێزانەوەی ڕستەی مۆرفۆسینتاکسی تێك بچڕژێنرێن ، بکرێن بە یەك. بەم جۆرە:




......یاسا ژ ١٠

**واتا:**

دوای وەرگرتنی ڕەگی داهاتوو و خستنەسەریی نیشانەی بکەر نادیاری و کات، ڕاناوە لکاوەکانی بەرکاری ڕاستەوخۆ لە داهاتوودا و بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە ڕابردوودا، سێتەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن و بەپێی یاساکانی شوێن، شوێنی خۆیان داگیردەکەن.

**تێبینی**

لە گوێزانەوەدا ، هەر پاشگر و پێشگرێکی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی کە لەگەڵ کارەکەدابێ ، لە شوێنی خۆیاندا دەمێنێنەوە. وەك لە:

**پێی ڕانەسپاردبوونین** . ( ئەو ئەوانی بە ئێمە ڕانەسپاردبوو)

لەم ڕستەیەدا:

( ڕا ) پێشگرە مۆرفیمێکی مۆرفۆلۆجییە.

( نە ) پێشگرە ئامرازی نەرێیە. مۆرفیمێکی ڕێزمانییە.

( بوو) پاشگرە نیشانەی کاتی ڕابردووی تەواوە. مۆڕفیمێکی ڕێزمانییە.
بە سەپاندنی یاسای گوێزانەوەی بکەرنادیاری بەسەر ئەم ڕستەیەدا:




**ڕستەکە دەبێتە:**

**پێی ڕانەسپاردبوونین**

هـــەموو پێشـــگر و پاشـــگرەکان ( ڕا — نـــە — بـــوو) لـــە شـــوێنی خۆیـــان دەمێننەوە.

## پەراوێزەکان

١ – کرمانجیی خواروو.

٢ – (x) نیشانەیە بۆ نەبوونی هیچ شێوەیێك (مۆرفیمی سیفر). یا لابردنی کەرەسەیێك.

ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی کات داهاتوو گەلێ ئەلەمۆرفی هەیە . لەم باسە تەنیا ئەم دوو ئەلەمۆرفە خراونەتە ڕوو ( x ـ ێت ) چونکە لە داڕشتەی مۆرفۆسینتاکسیدا هەر ئەم دووە دەردەکەون .

بۆ ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

وریا عومەر ئەمین ( ١٩٨٧ ) کەی (ات) و کەی (ێت) ؟ . گ.ڕۆژی کوردستان. ژ ٧٠

________ ( ١٩٩٨) کەسی سێیەمی تاك. ڕۆژنامەی هاوکاری ژ ٢٨٦١ ڕۆژی ١٩٩٨/٣/٨

________ (٢٠٠٢) لێکۆڵینەوەیێکی مۆرفۆفۆنیمی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق ـ دەستەی کورد. ژ (٢٩ و ٣٠ ) ل ٢٩١ ـ ٢٩٧.

٣ – یەکەم جار یاساکانی شوێنی ڕاناوە لکاوەکان لە لاپەڕە (٦٦ – ٦٩) ی ئەم نامەیەدا خراوەتە ڕوو.

Amin , W.O. (1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. Thesis Presented to the University of London. Published by Kurdish Academy. Series No. 114. Hawler.

٤ – ئەم یاسایە بۆ یەکەم جار لەم وتارەمدا خراوەتە ڕوو:

وریا عومەر ئەمین (١٩٩١) ڕاناوی لکاو لە بکەر نادیاردا. ڕۆژنامەی (العراق) ٤٦٤٧ ی ١٩٩١/٤/١٥.

* سوپاس بۆ مامۆستا (فەیسەڵ غازی محەمەد)ی بەشی کوردیی زانکۆی بەغداد بۆ هاریکاری.

## سەرچاوەکان

1 – Amin , W.O. (1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. Thesis Presented to the University of London. Published by Kurdish Academy. Series No. 114. Hawler.

٢ – وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. ز. ژ ١٤٧. بەغداد.

٣ – ________ (١٩٩١) ڕاناوی لکاو لە بکەر نادیاردا. ڕۆژنامەی (العراق) ٤٦٤٧ ی ١٥–٤–١٩٩١

٤ – ________ ( ١٩٩٢) لە پەیوەندییەکانی بکەر نادیار . گ. ڕۆشنبیری نوێ. دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی . ز ژ ١٢٩ ل ١٨ – ٢٢.

## ملخص البحث

اللغة الكردية من اللغات الصرفنحوية المعقدة التي يمكن فيها صياغة جملة تظهر فيها الفاعل والمفعول المباشر والغير مباشر بضمائر متصلة تتبادل أدوارها بتغير الزمن من الماضي إلى المضارع وبالعكس. هناك مجموعتان من الضمائر المتصلة في اللغة الكردية ، ترمزان بـ (A) وتشمل (م – ت – ى – مان – تان – يان) و (B) وتشمل (م – يت – x / يَت – ين – ن – ن ).. مجموعة A التي تظهر كفاعل مع المتعدي الماضي ، تظهر كمفعول (مباشر وغير مباشر) مع المتعدي المضارع. مجموعة B التي تظهر كفاعل مع المتعدي المضارع ، تظهر كمفعول مع المتعدي الماضي وكما موضح في الجدول الآتي:

| الدور | زمن الفعل | |
|---|---|---|
| | ماضي | مضارع |
| فاعل | A | B |
| مفعول | B | A |

لتحويل جملة المبني للمعلوم للتركيب (الصرفنحوي) إلى المبني للمجهول:

١ – يحذف الضمير ألفاعلي.

٢ – يشتق الجذر المضارع للفعل.

٣ – يضاف علامة المبني للمجهول ( ـ رِ ) إلى الفعل.

٤ – **إذا كان زمن الفعل في الماضي:**

أ – يضاف علامة الزمن الماضي ( ـ ا ) للفعل.

ب – يستبدل ضمير المفعول الغير مباشر من مجموعة (B) إلى (A) الذي يتحرك ويتصل بحرف الجرpreposition.

**إذا كان زمن الفعل في المضارع:**

أ – يضاف علامة الزمن الماضي ( يَـ ) للفعل.

ب – يستبدل ضمير المفعول الغير مباشر من مجموعة (A) إلى (B) الذي يتحرك ويتصل بجذر الفعل.

هذا البحث محاولة لتبيان القوانين التي تتحكم بهذا الجانب من اللغة الكردية.

## Abstract

In Kurdish language two different sets of personal suffixes are identified .. Set (A) (m – t – i: - ma:n – ta:n – ya:n ) and set (B) (m – i:t – 0/ a:t / e:t - i:n – n – n).

They perform two different tasks in opposite tenses, as shown in the following diagram::

| Function | Tense | |
|---|---|---|
| | Past | Present |
| Subject | A | B |
| Object | B | A |

To transfer a Morphosyntactic construction in which the subject, direct object and indirect object are expressed by personal suffix pronouns:

1 – The subject personal suffix pronoun is deleted.
2 – The present stem of the verb is taken.
3 – The passive marker ( -r ) is added.
4 – If the tense of the verb was in past:
  a – The past tens marker ( - a: ) is suffixed to the stem of the verb.
  b – The indirect personal pronoun suffix, which is from set (B), will be replaced

by its counterpart from set (A) and will move to attach the preposition.

If the tense of the verb was in present:
  a – The present tens marker ( - e ) is suffixed to the stem of the verb.
  b – The direct personal pronoun suffix, which is from set (A), will be replaced by

its counterpart from set (B) and will move to attach the verb stem.

This paper is an attempt to show the rules that govern this phenomenon.

# بڵاوبوونەوەی زار و زمانەکان
# لەژێر ڕۆشنایی تیۆری شەپۆڵەکاندا


پ.ی.د. فەرەیدوون عەبدوول بەرزنجی
زانکۆی سلێمانی

پ. ی.د. سەباح ڕەشید
زانکۆی ڕا پەڕین


**پێشەکی:**

بە درێژایی مێژوو لـە گـۆڕان و بڵاوبوونـەوەی زار و زمانەکانـدا گـەلێك تیـۆر و بۆچـوونی جیـاواز هاتنـە کایـە، سـەبارەت بـە متبـوونی زمانێـك و چـالاکبوون و بڵاوبوونەوەی زمانێکی تر، هەر بۆچوون و تیۆرێکیش بەپێی سـەدە و فەلسـەفەی ئەو سەردەمەی زمانرێژ کراون، درەختی خێزانەکان، یـان پـۆلکردنی وەچـەیی بـە دەسـتپێکی ئـەو بۆچـوونانە دادەنـرێ، کـە زیـاتر لـە سـەر دەسـتی زمانەوانـە بەراوردکارەکان، یان فیلۆلۆژیی بەراوردکاری پـەرەی سـەند، بـەلاّم ئـەو ڕەخنـەی لێیان دەگیرێ دەکرێ لە چەند خاڵێ کۆیان بکەینەوە :

١. لە سەر یەك بنەما جێگیر نـەبوون سـەبارەت بـەوەی کـام زمـان بکـەن بـە سەرچاوەی هەموو زمانەکان.

٢. لە پۆلێنکردنەکانـدا، کـەلێنی زۆری لێ بـەدی دەکـرێ سـەبارەت بەهەنـدێ زمانی وەکو سومەری، باسك، کە بەر هیچ پۆلێك لەو دوو درەختە ناکەون.

٣. هەر جـارەو پـەنا دەبەنـە بـەر پێوەرێـك بـۆ دوور و نزیکـی زمانـەکان، بـۆ نموونـە سـەبارەت بـە زمـانی ئینگلیـزی، وێلـزی کـە پـەنا دەبەنـە بـەر پێـوەری دۆخەکان، ئەو دوو زمانە لێك نزیـك دەبنـەوە، کـە هـەر ئـەو زمـان کـە پێوەرەکـە دەگۆڕێ لێك دوور دەکەونەوە و بەر دوو پۆلی زمانی زۆر لێك دوور دەکەون.

٤. بەراوردکارەکان پێیان وایە کە زمانێك یـان زارێـك کـە لـە زمـانی سـەرەکی دادەبڕێت (بە هەر هۆیەك بێت) کاریگەرییەکەیان بەسەر یەکـەوە نامێنێـت (بڕوانـە crystal 1971:). ئێمـە لێـرەدا بـە تەنگەبـەری دووڕیانێکـدا تێدەپـەڕین ئـەویش

ئەوەیە دوو زمان بەهۆی شەڕو شۆڕ و داگیرکاری و بازرگانی و کۆچکردنەوە لە یەکتر دادەبڕێن، یان تێکەڵ دەبن و دەکەونە ململانێی تاوەکو یەکیان دەبێتە سەر دەستە و ئەوەی تر بۆ ماوەیەك لە کار دەخات و سستی دەکات، یان ئەوەتا دەیکات بە پاشماوەی زمانێکی ترو لە قۆناغێکی تر وەکو زمانێك سەر هەڵدەداتەوە، یان ئەوەتە ململانێکە بە هیچ لایەك داناکەوێ و هەردوو زمانە ناکۆکەکە سەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن و ئەمەش بە هۆکاری جیاواز ڕوودەدات، کە دواتر لێی دەدوێین. ئەم باسەی ئێمە دابەشی سەر دوو بەش بووە، بەشی یەکەم: ڕوونکردنەوەی تیۆری شەپۆڵەکانە. بەشی دووەم: ئەو ناوچانەی ئەو تیۆرەی لەسەر جێبەجێ دەکرێ، دوای خستنەڕووی ئەنجامەکان، ڕیزکردنی سەرچاوەکان، و کورتەی باسەکەی بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بەدوادا دێت .

## بەشی یەکەم: تیۆری شەپۆڵەکان:

١: **پێناسە و ناسین:** ئەم تیۆرە لە بنچینەدا لەسەر کەم و کورتییەکانی تیۆری درەختی خێزانەکان هاتە کایە، ئەم تیۆرە لە چوارگۆشەیەکی بەتاڵ نەهاتە کایە، بەڵکو سوودی لە هەندێ لایەنی تیۆرەکەی پێش خۆی وەرگرت، زاراوەی شەپۆڵەکان لە بواری زمانەوانی مێژوویی، و کۆ– زمانەوانی بۆ ئاماژەکردن بەو مۆدێلە داینەمیکییەت کە لەگۆڕانی زمانەکان دەدوێ. تیۆری شەپۆلەکان ئەوە دەخاتە ڕوو، کەوا گۆڕانی ئاخاوتن، واتە ئەو گۆڕانانەی بەسەر زمانێکدا دێن لە ڕووکارێکی زمانەوانییەوە، یان ڕووبەرێکی زمانەوانییەوە دەست پێدەکات، واتە لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەست پێدەکات و کاریگەری بەسەر زمانەکانی دەوروبەریانەوە دەبێ، بەلأم چەند لەو خاڵەوە دوورکەوینەوە بڕی کاریگەرییەکەی کەمتر دەبێت. (crystal: 2003: 498) هەموو زمانێك لە جیهان قورسایی چالاکییەکانی خۆی دەهاوێژێتە هەرێمێکی تایبەتەوە، دەکرێ وەکو پایتەختی هەرێمی زمانی سەیر بکرێ، گڕ و تینی زمانەکە لەوێ کۆ دەبێتەوە و هەر ئەویش شەڕی پاراستنی سیما سەرەکییەکانی زمانەکە دەکات و پاراوتر دەبێت لە ڕووی بەکارهێنانی زمانەکەوە، بەلأم گەر ئێمە لە بنچینەی سەرهەڵدانی ئەم تیۆرە بکۆڵینەوە، دەتوانین وەکو کاریگەری و کاردانەوە بۆ بۆچوونەکانی ڕێزماننووسە گەنجەکانی بگێڕینەوە، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەڵمانیا پەیدابوون، بەلأم

هەنـدێ لـە ڕێزماننووسـەکانی ئـەو سـەردەمە کـۆك نـەبوون لەگـەڵ بۆچـوونی گەنجـەکان، لـەوەی کـە گۆڕانـە دەنگییـەکان لـە زمانـدا بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێـك ڕوودەدات و دەکرێ لـە زمانەکانـدا پێشـبینی بکـرێ و یاسـای بـۆ دابڕێـژرێ. ئـەو ڕێزماننووسـانەی دژ بـە بۆچـوونەکانی گـەنجان وەسـتان زۆربـەیان لـە دیالێکـت ناسەکان بوون dialectologists لە پـاڵ دژایـەتیکردنی ئـەم بۆچـوونەی گـەنجان، نموونەی درەختە خێزانەکان کە زیاتر بەناوی شلایخەرەوە Schleicher گرێدراوە و بــەر لــە دەرکــەوتنی ڕێزماننووســە گەنجــەکان، بــەلاّم بۆچــوونی درەختــە خێزانییەکان زیاتر وابەستەی ئەدەبیاتی ڕێبازی بەراوردکاری و دواتر بە بۆچـوونی ڕێزماننووسە گەنجەکان گرێدرا کە سەبارەت بەگۆڕانی دەنگە زمانییەکان خستیانە ڕوو. دژ وەستانەکەی ئەوان لەوەدا بـوو، کـەوا هـەموو وشـەیەك مێـژووی تایبـەتی خۆی هەیە (Aronof: 2000: 92) مەبەستیان زیاتر ئەوە بوو ئەو گۆڕانەدەنگییەی ئـەوان باسـی دەکـەن بـە مێـژووی گۆڕانـەکانی وشـەوە گرێـی بـدەن، لێـرەدا بەناڕاستەوخۆ باوەڕیان بەگۆڕانە دەنگییەکان لە زماندا هێناوە، بەلاّم ئـەو گۆڕانـە دەبەنە ئاستی مۆرفۆلۆجی و بەتایبەتی لە چوارچێوەی سـایکۆلۆژی و لەوێشـەوە بۆ ناو بۆنەی ئەو زانستە نوێیەی کە ئەو کاتە سەری هەڵدا بـە نـاوی etymology واتە، گەڕان بەدوای ئەسڵی وشەدا، بۆ نموونە کە ئێمە لـە وشـەیەکی وەك (بـاوك) دەدوێین، دەبێ لە دوو ڕوانگەوە سەیری بکەین:

١– لــە ڕووی مۆرفۆلۆژییــەوە وشــەی بــاوك لــە (بــاو) + سوفیکســی (ك) سازکراوە، ئەویش هەروەکو دایك کە سوفیکسی (ك) کە بەمەبەستی خۆشەویستی و ناسك و نازداری دراوەتە پاڵ (باو)، ئێستا بـووە بـە بەشـێك لێـی و لـە ڕێزمانـدا وەك وشـەیەکی یـەك پارچـە و لەقالبـدراو هەڵسـوکەوت دەکـات. (فـاروق عومـەر: ٢٠١١: ٢٤٣، ٢٥٥)

٢– ئەگەر لە ڕووی گۆڕانی دەنگییەوە لێی بکۆڵینـەوە، ئـەو کاتـە دەکەوێتـە بازنەی لێکدانەوەی لەدەستدانی دەنگ، بۆ نموونە لـە ناوچـەی ڕەوانـدز و سـۆران پێی دەڵێن (باو) واتە گەڕاونەتەوە سەر ئەسڵی وشەکەی ناوچـەی هـەولێر (بـاب)، کەرکوك (باوك) سلێمانی (باوکە: لـە کـاتی بانگهێشـتندا) بـەم پێیـە وشـەکان لـە چوارچـێوەی مۆرفۆلـۆجی (بـاو)دا دەخولێنـەوە، بـەلاّم گـۆڕانی دەنگـی بەسـەردا هاتووە.

**٢- بنەما جیاوازەکان:** لەبری نموونەی درەختە خێزانییەکان، کە سەرەتاکەی بۆ ئۆگست شلایخەر دەگێڕنەوە نموونەی شەپۆڵەکان wave theory هاتە کایە، کە لە سەردەستی J. 1878 Schmidt و1868 Hugo Schuchardt کە هەردووکیان قوتابی شلایخەر بوون. هەروەها لە ماوەی (١٩٠٢ —١٩١٠) ئەتڵەسی زاراوەکانی زمانی فەرەنسی لە لایەن Hugo دەرچوو ئەمانە هەموو هاوکار بوون بۆ ڕێگە خۆشکردن بۆ ئەم تیۆرەی دوایی (Radford: 2000: 15).

بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو گۆڕانە زمانییانە دەکات، کە لەئەنجامی کارلێکردنی زمانەکان یان زارەکان لەیەکتر دێتە کایەوە. بەمەش ئێمە بەرامبەر چەند بنەمایەك دەوەستین لەوانەیە تێکەڵبوونێك لە چالاکی و ڕاستگۆیی بنەماکان بێتە کایە.

**یەکەم: بنەمای چەندایەتی و چۆنایەتی:**

بەو هۆیانەی کە لە پێشەکی باسمان کردن، هەردوو زمان بەهەر هۆیەك لەیەکتر نزیك بکەونەوە دەکەونە ململانێ بۆ ئەوەی یەکیان بەسەر ئەوی تردا زاڵ بێت، بەڵام هەندێ مەرجی سەرەکی هەن دەبێت لە یەکلاکردنەوەی ململانێکەدا ڕۆڵیان هەبێ:

١. دەبێ تێکەڵبوونەکە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت و ململانێکە بەلایەنی کەمی دوو سەدە بەسەر بەرێ .

٢. دەبێ خاوەنی یەکێك لە زمانەکان بپەڕێتەوە بۆ سنووری ئەوی تر و تێکەڵبن.

٣. لەکاتی تێکەڵبوونی لایەنی مادی و ڕۆشنبیری و کەلتووری بگرێتەوە.

٤. ئەو زمانانە چاکتروایە لە یەك بنەچەی زمانی بن.

لێرەدا دەکەوینە بەرامبەر دوو بارەوە:

باری یەکەم: سەرکەوتنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا، زمانی براوە دەبێتە زمانی ئەو وڵاتە بەمیوان و خاوەن ماڵەوە. لێرە ئەگەر خاوەن هەردوو زمانەکە لە ڕووی شارستانییەوە نزم بوون ئەو کاتە بنەمای چەندایەتی ڕۆڵ لەو سەرکەوتنە

دەگێڕێ لەوەی لەو دوو نەتەوە لە ڕووی ژمارەوە زۆرتر بن، ئەو کاتـە سـەرکەوتن بۆ ئەوان دەبێ (ئەمە بنەمای چەندایەتییە).

بـەڵام ئـەو ئەنجامـە نایەتـە کایـە ئەگـەر ئـەو مەرجـەیان تێـدا نـەبێ، یـان هـەردووکیان لەیـەك خێزانـە زمـان بـن، بـۆ نموونـە ئینگلیـزە سەکسـۆنەکان لـە ناوەڕاستی ئەورووپاوە خزان بۆ ئینگلتەرە زمانەکەیان بەسەر زمانی (سـەلتی)، کـە زمـانی خـەڵکی ناوچـەکە بـوو. ژمـارەی سـەلتییەکان زۆر کـەم بـوون هـەردوو نەتەوەکەش سەکسۆن و ئینگلیزەکان خاوەن هیچ جۆرە شارستانییەتێك نەبوون، هەردوو زمانەکە سـەر بـەخێزانی زمانـە هیندۆئەورووپییـەکان بـوون. یـان شکسـتی بولگارییەکان کە هاتنە ناوچەی بەڵقان شکست هێنانیان بەرامبەر سەقالبەکان.

باری دووەم: کاتێك یەکێك لـە نەتـەوەکان خـاوەن شارسـتانییەتێکی بـەرزن، هەرچەندە لە ڕووی ژمـارەوە کـەمیش بـن لـەو جـۆرە ململانێیـەدا سـەرکەوتن بـۆ زمانی خاوەن شارستانی دەبێ (ئەمەش بنەمای چۆنایەتییە).

نموونە بۆ ئەم جۆرەیان: سەرکەوتنی زمانی ڕۆمانەکان (لاتینی) بەسەر زمانی ئیتالی و ئیسپانی و وڵاتی گۆڵ (فەرەنسـا)، هەرچـەندە ڕۆمانـەکان لەچـاو زمـانی نیشتەجێی ئەو وڵاتانە کەمینە بوون. (علي عبدالله مروان ١٩٣٠ : ٢٣٠)

## دووەم: بنەمای کاریگەری هێمنانە:

جاری وا دەبێ دوو زمـان، یـان دوو زار، یـان شـێوەزار تێکـەڵ بەیـەك دەبـن، هیچیان لە خەیاڵی ململانێ و بەدەستهێنانی سـەرکەوتن نـین، بـەڵام لـە ئـەنجامی تێکەڵبوون و گۆڕینەوەی بەرژەوەندییەکان دوو ئاڕاستە پەیدا دەبێت. (ئاڕاسـتەی ئەوەی هەردوو زمانەکە دەکەونە ژێر کاریگەریی یەکەوە و ئەو کاریگەرییـە بەسـەر دەکـەوێت بـۆ گشـت ئاسـتەکانی (دەنگسـازی، وشەسـازی، سـینتاکس، خواستن...هتد) بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەین، ئەمەش زیاتر دەچێتە ناو بازنەی گەشە و گۆڕان لـە زمانـدا، بـۆ نموونـە وەرگرتنـی دەنگـی (ڤ)، (ت)ی قەڵـەو (ر)ی سووك لە کرمانجی سەروودا، یان وەرگرتنی وشەی (دەڤەر)، (ئاریشە)، (ڕاڤە) لـە کرمانجی سەروو، پێچەوانەکەشی ڕاستە، بۆ نموونە لـە ئـەنجامی ئـەو تێکەڵبوونـە هەندێ کاریگەریی کرمانجی ناوەڕاست دەپەڕێتەوە ئەودیو، بۆ نموونـە لاوازبـوونی

کەیسەکان لە کرمانجی سەروودا، یان جیانەکردنەوەی تەواوی ڕەگەز لەلای ئەوان.

٢. دەرکەوتنی زارێك یان شێوەزارێك لەو ناوەڕاستەدا، کە هەلگری سیمای هەردوو زمان یان شێوە زارەکەیە، ئەگەر ئەو ناوچە زمانییە دروست بوو وەکو زمان زیاتر دەچێتە ناو تیۆری تێکەڵکردن لە زماندا، ئەمە زۆرتر لە زۆربەی پایەختەکانی دونیا ڕوودەدات، وەکو نموونەی مێژووی دروستبوونی زمانی (ئەسینا) باشترین نموونەیە. لە نموونەی ئێستادا، شاری هەولێر کە لە تێکەڵکردنێك لە زمانی تورکی و عەرەبی و کوردی هاتۆتە کایە، بەلام گەر بمانەوێ ئەمە بەرینە بواری زارەکانی ناوچەکانی نێوان زارە سەرەکییەکان سیمای ئەو جۆرە تێکەڵبوونە پێناسە دەکەن.

**سێیەم: بنەمای گۆڕانەکان:**

ئەگەرچی گۆڕانە دەنگییەکان زیاتر هەستی پێدەکرێ، بەلام مەرج نییە هەموو گۆڕانێك بۆ تێکشکاندنی کۆتە دەنگییەکان بگەڕێتەوە، چونکە گۆڕانی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی بە هەمان ڕێگە دێتە کایە. بۆیە چاکترین ڕێگە بۆ شارەزابوون لە دۆخەکانی زمانێك، پەیڕەوکردنی بنەمایەکە کە پێی دەڵێن مێژووی ناوەوەی زمان internal history، بەپێی ئەم بنەمایە دەبێ بە ڕۆنانی زمانەکەدا بچینەوە بەپێی قۆناغەکان و لە ڕێگەی بەراوردکاری لەنێوان ئەو قۆناغانەدا و چۆنیەتی گۆڕان و هۆی گۆڕانەکان لە ئاستی ڕۆنانی زمانەکەدا بخەینە ڕوو .

جۆری دووەمی گۆڕانەکان: گۆڕانی دەرەکی لە سروشتی زمانەکەدا، ئەم جۆرەیان لە میانەی قەرزکردنی زمانی دێتە کایە، ئەم جۆرە گۆڕانە کە لە دیالێکتێکی ترەوە، یان زمانێکی ترەوە، بەدەست دێت، زۆر ڕوون و بەرچاوترە بەلایەنی کەمەوە لەچاو ئەو گۆڕانانەی کە لە ڕۆنانی ناوەوە سەر هەڵدەدەن، هەروەها دەکرێت نیشانە بکرێت، چونکە ئەوانە بە زەقی دەبنە exotic objects واتە بابەتی وەرگیراو، بۆ نموونە وشەی بێجامە pajamas ، kangaroo کەنگەر، دەکرێ بوترێ ئەم جۆرە گۆڕانکارییە زیاتر پێی لەسەر وشەکان دادەگرێ (wordhaugh:1999: 188) ئەگەر ئێمە بمانەوێ تەنیا لەئاستی وشە بدوێین

سەبارەت بە گۆڕانی یەکەم دەبێ پەیڕەوی بنەماکانی etymology بکەین، بۆ نموونە وشەی (سوخرە) سەرەتا لە ئاوێستا بە واتای (سوور)، دێت، لە فارسی ناوەڕاست ماوەتەوە گۆڕاوە بە (سورخ)، لای ئێمە گۆڕاوە بە سوور، لای هەولێریش بۆتە سۆر، گەرمیان (سویر). گۆڕانەکان دەشکێنن، بەلاّم دەکرێ بە گۆڕانی ڕۆنانی لە قەڵەم بدرێت، لە ڕێگەی ئیتیمۆلۆجی زمانەکەوە بەدەردەکەوێ.

ئەم جۆرە گۆڕانەی سەرەوە، ئەگەر لە بازنەی ئیتیمۆلۆجی وەدەری بێنین، بە گۆڕانی فۆنەتیکی یان فۆنۆلۆجی لە قەڵەم دەدرێ. زۆرجار بەهۆی کارلێکەری ژینگەی دەنگی دێتە کایە، بەلاّم کە زۆر دووبارە دەبێتەوە، دەبێتە دیاردەیەکی جێگر و فۆرمە دەنگییە ڕاستەقینەکەی خۆی دەگۆڕێ بەو فۆرمە تازەیە، بۆ نموونە گۆڕان و کرتاندن، نموونە بۆ کرتان:

لەو گۆڕانەدا یەکێك لە بڕگەکانی وشەیەك لەناو دەچێ یان دەکەوێ، وەکو:

لە – ئەم – بەر – ← لەمبەر

سەبارەت بە تواندنەوە:

مەهاباد ––––– مەهابات: گۆڕانی د ← ت

ئێستا وای لێ هاتووە ئەو گۆڕانە تەنیا لە دەربڕیندا بەرچاو ناکەوێت، چونکە قسەکەر لە کاتی نووسین گوێ لە خۆی و بەرامبەر ڕادەگرێ، بۆیە وەکو مەهابات، بونیات. وشەکە دەنووسێ (محمد معروف فتاح: ٢٠١١: ١١٩)

## بەشی دووەم : بنەماکانی تیۆری شەپۆڵەکان

**The basis of wave theory**

یەکێك لە بنەماکانی نموونەی درەختی خێزانەکان خستنەڕووی پەیوەندیی نێوان خێزانە زمانییەکان، و چۆنیەتی و کاتی لێکدابڕانیان بوو، دەکرێ هەر هەمان نموونە وەرگرین بۆ دەستنیشانی هێڵی نێوان زارەکان، یان هێڵی دابەشبوونی زار و زمانەکان. خێزانی زمانەکان لەسەر ئەو درەختە زۆر بەڕوونی دیارە، بەڵام ئایا دەتوانین بە لق و گرێی ئەو درەختانەدا ڕۆبچین و بگەین بە ڕەگی درەختەکان و تیایدا بچینەوە سەر سەرەتای لەدایکبوونی زمانەکە و تا دەگەینە بچووکترین دەستەی زار و زمانەکان تا دەگەینە زمانی گەڕەکەکان، و زمانی تاکە کەسی idiolect. ئەوەی درەختەکان پێیان نەکرا و وەکو کەموکوڕی لێیان وەرگیرا تیۆری شەپۆڵەکان هەوڵی دا ڕێگەپاکی لێ بکات و نموونەیەکی لەبارتر بێنێتە کایە.

ئەم نموونەیە لەسەر دەستی زمانەوانی وەکو جیمس بیلی ١٩٧٣ و بیکرتۆن ١٩٧٥ و دیکامب ١٩٧٠ گەشەیان پێدا، بۆچوونەکانیان دەچێتە چوارچێوەی زمانەوانیی مێژوویی و کۆزمانەوانی. تیۆری شەپۆڵەکان هەوڵی ئەوە دەدات، کە بەیەکداچوون و تێکچڕژانی دیالێکتەکان بخاتە ڕوو لە ڕێگەی گریمانەکردنی تیشکۆی جوگرافییە Geographical foci جیاوازەکان بۆ بڵاوبوونەوەی یەکە زمانییە جیاوازەکان. بۆ نموونە وەرگرتنی یەکەیەکی فەرهەنگی وەکو بەفر دەکرێ بەدوایدا بچیت تاکو لەو شوێنەی دەبێ بە بەرف سنووری زارێك دەستنیشان بکەیت و دەستپێکردنی زارێکی تر دەستنیشان بکەی.

ئەم تیۆرە لە بنچینەدا بە هەرێمی زمانەکان بە گۆمێکی ئاو دەچوێنێ کاتێك بەردێك هەڵدەدرێتە ناو ئاو، ئەو شوێنەی کە بەردەکەی تێ دەکەوێ بە خاڵی چەقی هەرێمی زمانییەکە ئەژمار دەکرێ (Hudson: 1980: 63)، دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا زیاتر بۆچوونەکە ڕوون بکەینەوە:

١. هەر بەردێك سەنتەری زمانێك دەگەیەنێ، بۆ نموونە ئەگەر هەولێر وەکو شوێنی کەوتنەوەی بەردەکە دابنرێ، ئەوا دەبێتە سەنتەری زاری سۆرانی، و بۆ

نموونە ئاکرێ دەبێتە سەنتەری هەرێمی زارێکی تر، واتە شوێنی کەوتنەوەی بەردێکی تر لەناو گۆمەکە.

٢. بەهۆی ئەوەی شەپۆلی ئاو بە شێوەیەکی بازنەیی بە هەموو لایەکی دەوروبەری خۆی بڵاو دەبێتەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کاریگەریی زار و زمانەکان بەسەر یەکەوە یان ئاڕاستەی تیرئاسا وەرناگرێ، بەڵکو وەکو شەپۆلی ئاو بە هەموو لایەك بڵاو دەبێتەوە. شەپۆلەکان لە چەقدا بەهێزن بەڵام تا لە چەق دوورکەونەوە لاواز دەبن.




٣. گەورەیی و بچووکی بەردەکە لەنێوان دوو زاردا ئاماژەیە بۆ زۆری و کەمیی ژمارەی قسەپێکەرانی ئەو زار و شێوەزارە، لێرەدا ژمارەکان بەو شێوەیە دیاردەخەین:




٤. قووڵایی گۆمە ئاوەکە لایەنی قووڵیی شارستانی و کەلتووریی ئەو شێوەزارە دەگەیەنێ، چونکە بەردەکە چەند زیاتر بە قووڵایی ئاوەکەدا ڕۆبچێت، ئەستووری هێڵی بازنەیی شەپۆڵەکان ئەستوورتر دەبێت و دەتوانێت مەودایەکی دوورتر لە گۆمە ئاوەکە ببڕێت، تێکشکانی ئەو شەپۆڵە ئەگەری کەمتر دەبێت.




٥. ئەو شوێنەی کە لە بەیەکداچوونی هەردوو شەپۆڵەکە دێتە کایە دوو سیمای لیَ دەکەوێتەوە.




٦. ئەم سیمایانە لە بیرکاری وەرگیراون، لە یەکتربڕینی دوو کۆمەڵەی جیاواز ئەو شوێنەی کە یەکتر دەبڕن هەندێ دانەی تێدا دەبێت بۆ هەردوو زمانەکە دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە یان ئەو ناوچانەی دەکەونە ناو چەند شێوەزارێك لەگەڵ یەکتریدا کارلێك دەکەن و زارەکە لە ناویەکتریدا دەتوێنەوە، وەکو زاری کۆیە، لەم نموونەیەدا دیارە:



هەولێر: خیندن

کۆیە: خوندن

سلێمانی: خوێندن

یەکگرتنی دوو ناوچە لە شوێنێکدا سیمای هاوبەشی هەردوو ناوچەکە دەگەیەنێ، واتە دروستبوونی ناوچەیەك لە زمانی هاوبەش دەگەیەنێ .




بۆ نموونە جێناوە کەسییەکانیان بۆ هەردوو شێوەزار دەگەڕێتەوە

ئەمن ئەز ———◄ ئەمن ( ئەز)

ئەتو ئەتو – ئەنگۆ (تاك ، کۆ)

ئەو (دەستەی یەکەم)، ئەوا (دەستەی دووەم).

بۆ نموونە: ئەو هات (کاری تێنەپەڕ).

ئەوا ئەمە نارد (کاری تێپەڕ).

٧. بڵاوبوونەوەی زمان و زارەکان بەپێی ئەو تیۆرە ئاسۆیی دەبێت و دەچێتە بواری لێکۆڵینەوەی ئێستایی زمان، چونکە مامەڵە لەگەڵ ئەو دیاردە زمانییە دەکات، کە ئێستا لەناو دوو زارەکەدا هەن، نەك هەبوون، کەچی درەختە خێزانییەکان بڵاوبوونەوەکەیان ستوونییە و پەیڕەوی ڕێبازی مێژوویی دەکەن.

٨. ئەو تیۆرە یەکتربڕینی کاریگەرییەکانی تێدایە، کەچی درەختی خێزانەکان بەهۆی ئەوەی لقەکان یەکتر نابڕن لەگەڵ یەکەم جیابوونەوە جارێکی تر هیچ کاریگەرییان بەسەر یەکەوە نامێنێ.

٩. وشـکبوونی هـەر گۆمـە ئاوێـك مـردن و لەناوچـوونی زارێـك یـان زمانێـك دەگەیەنێ.

١٠. دروسـتبوونی ناوچـەی هاوبـەش هـەموو لایـەك دەگرێتـەوە، بـۆ نموونـە: ئەگەر ئەو ناوچەیەی کە شـوێنی یەکتربڕینەکـە نیشـان دەدات (O) بـوو واتـە ئـەو کاریگەرییە شتێکی ئەوتۆ نییە کە باس بکرێـت. ئەمـە زیـاتر دەچـێتە بـواری ئـەو ڕاستییە کە پێی دەوترێ تیۆری (کردەکانی جەختکردن لەسەر ناسنامە) ئەوانـەی خۆیـان دەپـارێزن لـە کەوتنـە ژێـر کاریگـەری زارەکـانی تـر، بـۆ خۆپاراسـتن لـە دۆڕاندنی ناسنامەکەی خۆیان (Hudson: 1980: 207) دەبێ ئەوەش بـوترێ هـیچ ڕێگەیەك لەوە نییە کەوا یەکەیەکی زمانی لـە بـەکارهێنان بکـەوێت یـان وشـەیەکی نوێ جێگەی بگرێتەوە، چونکە چـالاکیی بـەکارهێنانی ئـەو وشـەی کـە وەرگـیراوە دەوەستێتە سەر ئەو کۆمەڵە زمانییەی کە وشەکان بەکار دێنن پێگە، شـوێنی پـێ (مکانە).

ئەمــەش ڕێ لــەوە نــاگرێ کــە هێڵــی نێــوان زارەکــان لــە ڕێگــەی یەکــە فەرهەنگییەکانەوە دەستنیشان بکرێـت، بـۆ نموونـە ئـەمریکای بـاکوور لـە وشـەی (farm)دا گـۆکردنی دەنگـی (r) دەبێتــە مایــەی لێکدابڕانــدنی دوو زار. (هدســن: ٧٧: ١٩٨٧).

هەروەکو سۆسـێر ئامـاژەی بـۆ دەکـات، کـەوا ڕێبـازی ئێسـتا و مێـژوویی لـە لێکۆڵینەوەکانـدا تەواوکـەری یـەکترن و نـاکرێ قوربـانی بەیـەکیان بـدەین لەسـەر ئەستۆی ئەوی تریان، لەبەر ئـەوە هـەردوو نموونـە درەختـە خێزانـەکان و تیـۆری شەپۆڵەکان پێویستن بۆ هەر لێکۆڵینەوەیەك کـە بچـێتە ئاسـتی کۆزمانەوانییـەوە، چونکە ئەو کاتە دەکرێ لە ڕۆنانی ئاسۆیی و ستوونی دیاردەکە بکۆڵینەوە.

## ئەنجام

ئەم باسە ئەو بۆچوونانەی لێ دەکەوێتەوە:

١. تیۆری شەپۆڵەکان سەرکەوتووە بۆ دیاریکردنی هەرێمە ناوەندەکانی دوو زمان، کە وەکو ناوچەی یەکتربڕیی زمانەکان ناومان بردن، بەڵام دووچاری بەربەستی (تیۆری کردەکانی پاراستنی ناسنامەکان) دەبێت، بەتایبەتی لەناو زارێك یان زمانێك کە کۆمەڵێك یان دەستەیەك ڕابەرایەتی زمانێك یان زارێکی پەتی دەکەن، لێرەدا ئەسڵی وشەکان ون دەبێ و ڕەوتی گەشەکردنی وشەکان لەدەست دەچن.

٢. تیۆری شەپۆڵەکان دەچێتە ئاستی لێکۆڵینەوە ئێستاییەکانی زار و زمانەکانەوە بەپێچەوانەی درەختی خێزانەکان، کە ڕێبازی مێژوویی دەستەبەر دەکات، بۆیە هەردووکیان پێویستن، لەلایەکی ترەوە لقەکانی درەختە خێزانییەکان یەکتربڕینی تێدا نییە و بازنەی شەپۆڵەکان یەکتربڕینی تێدایە، یەکتربڕین = کاریگەری. دەگەیەنێ.

٣. دەکرێ درەختە خێزانییەکان وەکو گۆڕانی دەرەکی یان مێژووی دەرەکی external change سەیر بکرێت و تیۆری شەپۆڵەکان وەکو مێژووی ناوەکیی زمان (internal change) سەیر بکرێت، بەهۆی ئەوەی لە ڕەوت و ڕوونانی ناوەوەی زمانەکە و گۆڕانکارییەکانی دەکۆڵێتەوە.

٤. تیۆری شەپۆڵەکان دوا تیۆر نییە، بەڵکو دوای ئەو تیۆری ڕووەکەکان هاتە کایە، کە لە زۆر ڕووەوە لە تیۆری شەپۆڵەکان سەرکەوتووترە، لەوەی پەنا دەباتە بەر بنەمای بۆماوە لەوەی ئەو تۆیانەی توانای بڵاوبوونەوەیان نییە زمانەکە لەگەڵ خۆیان دەپووکێننەوە، ئەم تیۆرە هەردوو ڕێبازی مێژوویی و ئێستایی لە یەك کاتدا دەستەبەر دەکات .

## سەرچاوەکان

**به زمانی کوردی :**

١. فاروق عومەر سدیق (٢٠١١) لەدایکبوونی وشە، کۆڕی زانیاری کورد: بەغدا .

٢. محەمەد مەعروف فەتاح (٢٠١١) زمانەوانی، حاجی هاشم، چاپی سێیەم، هەولێر.

**به زمانی عەرەبی :**

٣. علی عبدالله مروان (١٩٣٠)، علم اللغة،

٤. هدسن (١٩٨٧) علم اللغة الاجتماعي، ترجمة د. محمود عبدالغني عياد، دار الشؤون الثقافية، بغداد.

به زمانی ئینگلیزی

5.Crystal,D (1971) Linguistics ,Pelican , original, London

6.Crystal,D (2004) Adictionary of Linguistics and phonetics : Blackwell publish

7.Hudson.R.S (1980) SocioLinguistics :Cambridge University Press

8.Aronoff .M,and Miller .J,R(2000)The Handbook of Linguistics: Blackwell publish .

9.Wardhaugh,R (1990)An Introduction to Sociolinguistics: Ltd Oxford .

## ملخص البحث

على المدى الطويل لتاريخ تطور اللغات، ظهرت آراء ونظريات مختلفة لتفسير الظواهر اللغوية، وكوامن التأثيرات والصراعات التي تحدث بين اللغات واللهجات وشروط هذه الصراعات وقيودها. نظرية الموجات هي إحدى هذه النظريات، والتي قد أعطت حلولاً مناسبة لحدود التأثيرات اللغوية واللهجاتية تشبيهاً لرمي الحجر في بركة ماء. ويمكن القول بأن هذه النظرية قد بُنيَتْ على أطلال نظرية نموذج الشجرة الاسرية كون نظرية الموجات قد استفادتْ من المآخذ التي أُخذت على النظرية السابقة، يقع البحث في فصلين: أرتأى الباحث في الفصل الاول عرض تفاصيل سيرة تاريخية حول الافكار التي سبقت نظرية الموجات وبعض تطبيقاتها، أما الفصل الثاني فينحصر على عرض المبادىء الاساسية لنظرية الموجات ومشبهاتها، بعد عرض المراجع تتبعها الخلاصتين باللغتين العربية والانگليزيه.

## Abstract

Throughout the long history of language development, various opinions and theories have appeared to account for the linguistic phenomena, the hidden effects and conflicts that occur between languages and dialects, and the conditions and restrictions for these conflicts.

Wave theory is one among such theories which has provided appropriate solutions to the limits of language and dialectal effects on the analogy of a stone being thrown into a pool. This theory can be said to have been built from the consequences of the genealogical tree model since the former has capitalized on the weak points of the latter.

The study falls into two parts: the first presents a historical development of the theories that preceded wave theory with some applications whilst the second part demonstrates the basic principles of wave theory and its likes. At the end of the study comes the bibliography followed by abstracts in Kurdish and Arabic.

# پێکهاتە زمانییەکانی مانشێت لە رۆژنامەگەریی کوردیدا

د. کەوسەر عەزیز ئەحمەد
زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر

**پوختە**

مانشێت یان سەردێر، کە بەشێکی سەرەکی هەواڵە و لە سەرەتای هەموو هەواڵێکی رۆژنامەگەریدا دەردەکەوێت، فۆرم و پێکهاتەی زمانی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ دیاریکردن و ناسینەوەی سیما و پێکهاتە زمانییەکانی مانشێت، کە تیشك دەخاتە سەر فۆرم و لایەنە زمانییە جیاوازەکانی مانشێت لە رۆژنامەگەریی کوردیدا. بۆ ئەم مەبەستە رێبازی شیکردنەوەی ناوەڕۆك، بە هەردوو شێوازی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە، بەکارهێنراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە داتاکان. ئامانج لە توێژینەوەکە ئەوەیە کە بزانین رۆژنامەگەریی هاوچەرخی کوردی تا چەند پابەندە بە فۆرم و بنەما زمانییە ناسراوەکانی رۆژنامەگەری و تا چەند رۆژنامەنووسانی کورد پرۆفیشناڵانە کاری نووسینی رۆژنامەوانی ئەنجام دەدەن.

کە باس لە پێکهاتە زمانییەکانی مانشێت دەکرێت تەنیا لایەنی گوتەیی زمان، لە وشە و فرێز و رستە و یەکەکانی تری زمان، ناگرێتەوە، بەڵکو لایەنە ناگوتەییەکانیش دەگرێتەوە لە فۆرم و دیزاینی لاپەڕەکان. فۆرمی رۆژنامەکان رۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە گواستنەوەی پەیامەکان، بۆیە دەبینین مانشێتەکان بە چەند فۆرمێکی جیاواز و سەرنجڕاکێش دەنووسرێن و هەتا لە رووی فۆنتیشەوە لە جەستەی هەواڵەکان جیان.

دیارە مانشێت لە هەموو شێوەکانی میدیادا هەیە بە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی و نووسراوەوە، بەڵام ئەم توێژینەوەیە تەنیا جەخت لەسەر مانشێتی رۆژنامەکان دەکاتەوە. داتای توێژینەوەکە بریتییە لە ژمارەکانی ساڵی ٢٠٠٧ی دوو رۆژنامەی

کوردیی هاوچەرخ، کە ئـەوانیش بـریتین لـە ڕۆژنامـەی هـاولاتی و هـەولێر پۆسـت. مەسحێك بۆ ژمارەکانی یەك ساڵی ئەم دوو ڕۆژنامەیە کراوە و لە ڕوووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە نموونەی پێویست وەرگیراوە.

توێژینەوەکە دابەش کراوە بۆ دوو تەوەری سەرەکی. تەوەری یەکەم باس لـە فۆرمە سـەرەکییەکانی نووسـینی مانشـێت دەکـات کـە بـریتین لـە هەشـت جـۆری سـەرەکی و بـۆ هـەر جۆرێـك نموونـەی پێویسـت دابـین کـراوە و پاشـانیش لـە خشتەیەکدا بەکارهێنانی هەر یەك لەم جۆرانە لە دوو ڕۆژنامەکە ڕوون کراوەتـەوە. تـەوەری دووەم تایبەتـە بـە سـیما زمانییـەکانی مانشـێت، کـە تیایـدا بـاس لـە تەکنیکەکانی بڕین و لابردنی هەندێ یەکەی زمانی و بەکارهێنانی وشەی تایبـەت و دەمکاتەکان و ئیدیۆم و پەندە کوردییەکان و خاڵبەندی کراوە.

### تەوەری یەکەم: فۆرمەکانی مانشێت

مانشێت بە گرنگترین بەشی هـەواڵ دادەنرێـت، بۆیـە دەبێـت بـە فـۆرمێکی وا بنووسـرێت کـە بتوانێـت نـاوەڕۆکی هەواڵەکـە لـەخۆ بگرێـت و وێنـەی هەواڵەکـە پێشکەش بە خوێنەر بکات، بە شێوەیەك کە خوێنەران بتوانن بـە چاوخشـاندنێکی خێـرا بـەناو لاپـەڕەکانی ڕۆژنامەکـە ئاگـاداری هـەموو هەواڵـەکانی ئـەو ڕۆژە بـن، (ڕەمەزان، ٢٠٠٩: ١٢٠). مانشێت بـە چـەندین فـۆرمی جیـاواز دەنووسـرێت و هـەر ڕۆژنامەیەك بە شێوە و دیزاین و ڕێنووس و فۆنتی جیاواز دەینووسێت.

وەسانی ( ٢٠١١: ٩٢) پێی وایە کە واچاکترە ناونیشان یـان مانشـێتی هـەواڵی ڕۆژنامەنووسی دوای لێبوونەوە لە داڕشتنەوە و نووسـینەوەی هـەواڵ بنووسـرێت، چونکە ناونیشان دەروازەی ڕاستەقینەی هەواڵ و پاشماوەی چیرۆکە هەواڵە، هـەر بۆیـە پێویسـتە لـە ڕووی زمانەوانییـەوە ڕوون و پوخـت بێـت. وەك لـە جیهـانی ڕۆژنامەگەریـدا زانـراوە، ناونیشـانەکان زمـانێکی چـڕ و پێڕاگەیەنـەری تایبـەت بەخۆیان هەیـە و کـە پشـت بـە دەربڕینـی کـورت و وتـەی ورووژاو دەبەسـتن، کـە سەرنجی خوێنـەران ڕادەکێشـن و پاڵیـان پێـوەدەنێن بـۆ خوێندنـەوە یـان کڕینـی ڕۆژنامە.

سەپان (٢٠٠٥: ١١٢) ئەوە دەخەنە روو کە رۆڵی سەردێر لە رۆڵی وێنە کەمتر نییە چونکە هەموو نووسین و بڵاوکراوەیەك لە رۆژنامە و گۆڤاردا بەهۆی سەردێرەوە دەناسرێتەوە. سەردێر دەکاتە کلیل یان کۆدی نووسین کە خوێنەر نووسینەکەی پێ دەناسێتەوە. سەردێر لە نووسیندا لەگەڵ وێنە لە لاپەڕەی رۆژنامەی چاپکراودا زۆرترین سەرنجی خوێنەر بۆ خۆیان رادەکێشن. لەم سەنجراکێشانەدا نەك تەنیا زمان بەڵکو فۆرمیش رۆڵێکی گرنگی هەیە.

چەند بنەمایەکی گرنگ هەن کە بۆ نووسینی مانشێت پێویستن و نووسەرانی ئەم بوارە پێویستە لەبەرچاوی بگرن، (محەمەد، ٢٠١٠: ١٣١):

١. ناوەڕۆکی مانشێتەکە لەگەڵ بابەتی هەواڵەکە بگونجێت.

٢. کورت و روون و ئاسان و بێ گرێوگۆڵ بێت.

٣. فرمانی گونجاوی تێدا بێت، وا چاکتریشە فەرمانەکە رانەبردوو و پۆزەتیڤ بێت.

٤. وشە و دەستەواژەی دووبارەی تێدا نەبێت.

٥. تا بکرێت وشە ئەرکییە رێزمانییەکانی تیادا نەبێت.

٦. مانشێت بە فۆنتێکی تۆخ و گەورەتر لە جەستەی هەواڵەکە دەنووسرێت، (ویلکۆکس & نۆتس، ١٩٩٧: ١٢٣).

لە رووی فۆرم و دیزاینەوە پسپۆڕانی بواری میدیا مانشێت بۆ چەند جۆرێك پۆلێن دەکەن، ( ئەبدول، ٢٠٠٦: Crump، ١٩٧٤: عەبدولکەریم، ٢٠٠٧). لە خوارەوە باسی گرنگترینیان دەکەین:

### ١,١ مانشێتی وەرگێراو

رەمەزان (٢٠٠٩: ١٢١) بەم جۆرە مانشێتە دەڵێن مانشێتی خوازراو. ئەم فۆرمە بریتییە لە گێڕانەوەی وتەی کەسێکی تر و زەقکردنەوەی ناوەڕۆکی وتەکە بە بەکارهێنانی خاڵبەندی و دانانی لەنێوان کۆمای سەراوژێر، وەکو ئەم نموونەی خوارەوە:

(١)" *مادەی ١٤٠ ئەستەمە جێبەجێ بکرێت*" ( هەولێر پۆست، ١٣٥، ٢٠٠٧).

*(٢) کۆسرەت رەسول*

*من پێم وابوو کاک نەوشێروان دەبوایە نەڕوا*، ( هاولاتی، ٣٤٤، ٢٠٠٧)

وەکو دیارە لە نموونەی (١) لە مانشێتەکەدا ئاماژە بە ناوی قسەکەرەکەوە نەدراوە، خوێنەر دەبێت هەواڵەکە بخوێنێتەوە تا بزانێت کێ خاوەنی ئەم وتەیەیە، بەلام لە نموونەی (٢) ئاماژە بە ناوی قسەکەرەکە دراوە کە کۆسرەت رەسولە و مانشێتەکەش لە دوو دێر پێکهاتووە، کە دێری یەکەم تەنیا ناوی قسەکەرەکەی تێدایە و دێری دووەمیش وتە وەرگێراوەکەی تێدایە. جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هاوشێوەی مانشێتی نموونەی یەکەم لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا زۆر کەمە، بەلام هاوشێوەی مانشێتی دووەم زۆرە.

## ٢,١ مانشێتی پرسیارکردن

ئەم جۆرە مانشێتە بریتییە لە رستەیەکی پرسیاری و پرسیار لە شتێك دەکات و خوێنەر هاندەدات بۆ ئەوەی هەواڵەکە بخوێنێتەوە تا وەڵامی پرسیارەکەی دەست بکەوێت. ئەم جۆرە مانشێتە ڕووداوەکان لەشێوەی پرسیار دەخاتە روو، بە مەبەستی وورووژاندنی خوێنەر بۆ ئەوەی بەدوای وەلامی پرسیارەکەدا بگەڕێت، ( رەمەزان، ٢٠٠٩: ١٢٠)، وەکو ئەم نموونەیەی خوارەوە:

(٣) *ئایا تەنگەژەی ئابووری کار لە هەرێمی کوردستان دەکات؟* ( هاولاتی، ٣٢٦، ٢٠٠٧).

(٤) *شین بۆ دوعا یان بۆ هەریسە؟* ( هەمان ژمارەی پێشوو)

## ٣,١ مانشێتی راست

محەمەد ( ٢٠١٠: ١٥٧) بەم جۆرە مانشێتە دەڵێن مانشێتی یەك دێری. ئەم فۆرمەی مانشێت بریتییە لە فرێزێك یان رستەیەك کە بە هێڵێکی راست دەنووسرێت. دەکرێت رستەکە هەموو دێرەکە پڕبکاتەوە یان نیوەی یەکەمی دێرەکە یان لە ناوەڕاستی دێرەکە بنووسرێت، ( Crump، ١٩٧٤)، وەکو ئەم نموونەی خوارەوە:

(٥) *سەرۆك وەزیرانی عێراق سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات*، ( هەولێر پۆست، ١٣٣، ٢٠٠٧).

### ٤,١ مانشێتی پەیژەیی

لەم فۆرمەدا مانشێتەكە بەشێوەی پلەدار یان پەیژە دەنووسرێن. دەكرێت مانشێتەكە دوو دێر یان سێ دێر بێت، دێری یەكەم لە سەرەتای دێرەوە دەست پێ بكات و تا ناوەڕاست بێت، دێری دووەم لە ناوەڕاستی دێرەكە بێت و دێری سێیەمیش، ئەگەر هەبوو، لە كۆتایی دێرەكە بنووسرێت، (Crump، ١٩٧٤). هەندێك لە توێژەران بەم جۆرە مانشێتە دەڵێن مانشێتی پێپلیكانەیی و پێیان وایە كە ئەم فۆرمە بە گشتی بۆ هەواڵە دوو تا سێ ستوونییەكان گونجاوە، كە تیایاندا دوو تا سێ دێر لەژێر یەكتردا دادەنرێن، (محەمەد، ٢٠١٠: ١٥٨). لەبەر ئەوەی لەم دوو رۆژنامەیەی بەردەست هیچ مانشێتێكی لەم جۆرە نەبوو كە بەم فۆرمە نووسرابێتەوە، بۆ پیشاندانی فۆرمەكە هەوڵدەدەین لە خوارەوە مانشێتێك بە فۆرمی پلەدار دابڕێژین:

*(٦) یەكەمین جارە لە مێژوودا*

*كوردێك ببێتە*

*سەرۆك كۆماری عێراق*

### ٥,١ مانشێتی هەڵواسراو

لەم فۆرمەدا مانشێتەكە بە دوو یان سێ دێر دەنووسرێت، دێری یەكەم لە دێری دووەم پانترە و دێری دووەمیش لەوەی سێیەم پانترە. واتە، دێری یەكەم هەموو بۆشاییەكە پڕ دەكاتەوە، بەڵام لە دێری دووەمدا لە سەرەتادا بۆشایی جێ دەهێڵرێت و لە دێری سێیەمیش بە هەمان شێوە، ( مەردان & بەرزنجی، ١٩٩٩: ٦٨)، بەم شێوەیەی خوارەوە:

*(٧) پاش كۆبوونەوەی كورد و شیعە لە بەغدا*

*بۆ جێبەجێكردنی رێكەوتنەكە*

*ئامادەیی تەواو كراوە،* (هەولێر پۆست، ١٣٥، ٢٠٠٧)

جێگەی ئاماژەپێكردنە كە ئەم فۆرمە زۆر بەكەمی لە رۆژنامە كوردییەكاندا بەكاردێت.

### ٦,١ مانشێتی چیرۆك

ئـەم جـۆرە مانشـێتە بریتییـە لـە چـیرۆکێکی کـورتی سـەیر و سـەمەرە و سەرنجڕاکێش. لە ڕۆژنامەگەریی کوردیـدا نموونـەی ئـەم فۆرمـە زۆرە، وەکـو ئـەم نموونانەی خوارەوە:

(٨) *مندالێك بە دوو سەرەوە لە دایك دەبێت*، ( هەولێر پۆست، ١٣٨، ٢٠٠٧)

(٩) *بەسەرهاتی ژنێکی لەشفرۆش*، (هاولاتی، ٣٢٥، ٢٠٠٧).

### ٧,١ مانشێتی دوو بەشی

ئەم جۆرە مانشێتە لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان لە دێری یەکـەم لـە سـەرەوە دەنووسـرێت و بەشـی دووەمـیش لـە ژێـرەوەی بەشـی یەکـەم دەنووسرێت، واتە لە دێری دووەم دەنووسرێت. بەشی دووەم بەشـی یەکـەم ڕوون دەکاتەوە، وەکو ئەم نموونەی خوارەوە:

*(١٠) گەڕانەوە بۆ کوردستان*

*پەنابەرانی کوردی ئەورووپا دەگەڕێنەوە کوردستان*، ( هـەولێر پۆسـت، ١٣٩، ٢٠٠٧)

وەکـو لـە فـۆرمی ئـەم هەواڵـەی سـەرەوە دیـارە مانشـێتەکە لـە دوو بـەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا تەنیا بە گشتی باس لە بابەتەکە دەکات " گەڕانەوە بۆ کوردستان"، لە بەشی دووەم وردەکاریی بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە کـە بریتییـە لە "پەنابەرانی کوردی ئەورووپا دەگەڕێنەوە کوردستان".

### ٨,١ مانشێتی هەرەمی سەراوژێر

فۆرمی ئەم جۆرە مانشێتە لەشێوەی هەرەمێکە کە سەراوژێر دانرابێـت، واتـە بنکەکەی لە سەرەوەیە و لووتکەکەی لە خوارەوەیە. ئەم جۆرە مانشێتە بـە زۆری لە سێ دێر پێکدێت و هەندێ جاریش تەنیا لە دوو دێـر پێکـدێت، دێـری ژێـرەوەی لەوەی سـەرەوە تەسـکترە، یـان بـە واتایـەکی تـر دێـری یەکـەم لـە دێـری دووەم درێژترە و دووەمیش لە سێیەم درێژترە، بەم شێوەیە تا لە کۆتاییدا قووچـەکێکی سەرەوژێر پێکدێنن ( بادۆك، ١٩٨٨ ، مەردان & بەرزنجی، ١٩٩٩). ئـەم فۆرمـەش

لە رۆژنامەگەریی کوردیدا زۆر کەمە، لەبەر نەبوونی نموونەی پێویست لەو رۆژنامانەی لەبەردەستدان بۆ ئەم توێژینەوەیە، هەوڵدەدەین لە خوارەوە نموونەیەك دابرێژین:

(١١) حکومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵەکانی چڕدەکاتەوە
بۆ یارمەتیدانی کریستیانەکانی
ناوەڕاستی عێراق

شایانی باسە کە لە هەندێك سەرچاوەدا ( عەبدولکەریم، ٢٠٠٧) باس لە فۆرمێکی تریش کراوە کە پێی دەگوترێت "مانشێتی چەپە". لەم فۆرمەدا مانشێتەکە لە لای چەپەوە دەست پێدەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی لە رێنووسی کوردی ناوەڕاست یان لە هەرێمی کوردستانی عێراق رێنووسی کوردی لە راستەوە بۆ چەپەیە، بۆیە لەم توێژینەوەیەدا باسی ئەم فۆرمەمان نەکردووە.

بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکمان هەبێت لەسەر ئەوەی تا چەند ئەم فۆرمانە لە رۆژنامەگەریی کوردیدا بەکاردەهێنرێن، لەم خشتەیەی خوارەوە رووپێوی ژمارەی دووبارەبوونەوەی بەکارهێنانی هەر یەك لەم فۆرمانەی مانشێت لە لاپەڕەی یەکەمی هەردوو رۆژنامەی بەردەست روون دەکەینەوە، کە نزیکەی ٦٥٠ مانشێت لەخۆ دەگرێت:

**خشتەی (١) دووبارەبوونەوەی فۆرمەکانی مانشێت**

| فۆرمی مانشێت | هەولێر پۆست | هاوڵاتی |
|---|---|---|
| مانشێتی وەرگێراو | ٤٨ | ٥٩ |
| مانشێتی پرسیارکردن | ٤٤ | ٤٩ |
| مانشێتی راست | ١٠١ | ٩٨ |
| مانشێتی پەیژەیی | ٠ | ٠ |
| مانشێتی هەڵواسراو | ١ | ٠ |
| مانشێتی چیرۆك | ٦٢ | ٤٥ |
| مانشێتی دوو بەشی | ٦٦ | ٧٥ |
| مانشێتی هەرەمی سەراوژێر | ٠ | ٠ |

ئەگەر شیکردنەوەیەك بۆ خشتەی ژمارە (١) بکەین دەبینین زۆربەی جۆری مانشێتەکان لەم دوو ڕۆژنامەیە بەکارهێنراون، تەنیا هەردوو جۆری مانشێتی پەیژەیی و هەرەمی سەراوژێر نەبێت، کە لە ژمارەکانی یەك ساڵی ئەم دوو ڕۆژنامەیە نەبینراون. وەکو لە خشتەکە دیارە فۆرمی مانشێتی ڕاست زیاتر بەکارهێنراوە، لە ڕۆژنامەی هەولێر پۆست ١٠١ جار بەکارهێنراوە و لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیش ٩٨ جار. ئەمەش لەوانەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە نووسینی ئەم جۆرە مانشێتە لە ڕووی فۆرم و دیزاین و زمانیشەوە لە ئەوانی تر ئاسانتر بێت. مانشێتی دوو بەشی بە پلەی دووەم دێت، کە لە ڕۆژنامەی هەولێر پۆست ٦٦ جار و لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیش ٧٥ جار بەکارهاتووە. ژمارەکانی بەکارهێنانی هەر یەك لە فۆرمەکانی مانشێتی وەرگێراو پرسیار و چیرۆك لە یەکترەوە نزیکن. ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە فۆرمە ئاڵۆزەکانی وەکو فۆرمی مانشێتی پەیژەیی و هەڵواسراو زۆر بە کەمی بەکارهێنراون چونکە ئەمانە پێویستییان بە ڕۆژنامەنووسی بە سەلیقە و پرۆفێشناڵ هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی نووسینی فۆرمەکانی تر ئاسانترن زیاتر بەکارهێنراون. ئەگەر باسی جیاوازیی فۆرمی مانشێتەکانی هەر یەك لە دوو ڕۆژنامەکە بکەین، دەبینین جیاوازییەکان زۆر کەمن، جیاوازییەکان لە ١٠ مانشێت تێپەڕ ناکەن، ئەمەش لەوانەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەزموونی ڕۆژنامەنووسانی کورد هاوشێوە و لەیەك نزیك بن. زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژنامەنووسانی کورد دەرچووی کۆلێژ و پەیمانگەی ئەکادیمی نین، یان خولی تایبەت بە مانشێت نووسینیان نەبینیوە. زۆربەی هەرە زۆریان لەوانەیە حەز و خولیایان لەم بوارە هەبووبێت و لەم ڕێگەیەوە هاتبنە نێو بواری ڕۆژنامەنووسییەوە، یان لەوانەیە پێشتر شاعیر و نووسەری بواری تر بووبن، کە زمان و کاری ڕۆژنامەوانی زۆر لە بواری خۆیان دوورە.

**تەوەری دووەم: زمانی مانشێت**

لە سەدەی بیست و یەكەم و سەردەمی تەكنۆلۆژیای زانیارییەكان و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكانی ئینتەرنێت هێشتا ڕۆژنامەوانی بەگشتی و هەواڵ و مانشێت بەتایبەتی ڕۆڵی خۆیان لەدەست نەداوە و خوێنەری خۆیان هەیە، خەڵك بە چەندین مەبەست ڕۆژانە كاتێك تەرخان دەكەن بەلایەنی كەمەوە بۆ خوێندنەوەی مانشێتی ڕۆژنامەكان، (Conboy، ٢٠١٠: ٧١). ئەمڕۆ لە كوردستاندا خەڵكێكی زۆر ڕۆژانە ڕۆژنامە دەكڕێت و دەیخوێنێتەوە، لە دام و دەزگا حكومییەكانیش زۆربەی ڕۆژنامەكان دەست دەكەون و كارمەند و بەڕێوەبەری ئەم دەزگایانە ئەگەر زۆربەی هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەكان نەخوێننەوە ئەوا سەیرێكی مانشێتەكان هەر دەكەن.

مانشێت زمانێكی تایبەت بەخۆی هەیە و گرنگترین بنەماشی بریتییە لە سووكی و ئاسانی و سەرنجڕاكێشی. لەلایەن زمانەوانانەوە زمان چەندین پێناسەی جیاجیای بۆ كراوە، لە زۆربەی پێناسەكاندا ڕەهەندی پێوەندیكردن فەرامۆش نەكراوە، چونكە زمان سیستەمی پێوەندیكردنە لەنێوان دوو لا، ( خۆشناو، ٢٠١٣: ١٤). لەبەر ئەوەی مانشێت بەتایبەتی و هەواڵی ڕۆژنامەوانی بەگشتی بە مەبەستی پێوەندیكردن و گەیاندنی پەیامێك دەنووسرێن، بۆیە زمان بە ڕەگەزێكی سەرەكی گواستنەوەی پەیامەكە دادەنرێت. لە ڕۆژنامەوانیدا ئەركی سەرەكیی زمان گەیاندنی زانیارییەكانە بەشێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا كە گشت خەڵك تێی بگەن. بەمەش ئەم زمانە زمانێكی سادەیە و مەبەست لە سادەییەكەی ئەوەیە كە گشت خەڵك لێی تێبگەن، بۆیە دەكرێ بڵێین زمانی ڕۆژنامەوانی لە زمانی ئاخاوتن و نووسینی خەڵكەوە سەرچاوەی گرتووە، چونكە بەشی زۆری ڕۆژنامەكان بۆ زۆرینەی خەڵك دەنووسرێن و بڵاودەكرێنەوە، ( برزۆ & بابۆلی، ٢٠١٣: ٨٣–٤).

ئەم تەوەرە توێژینەوە لە لایەنە زمانییەكانی مانشێت دەكات. بەشێوەیەكی گشتی زمانی مانشێت زمانێكی تایبەتە و جیایە لە زمانی تێكستە درێژ و ئەدەبی و هەموو جۆرە تێكستەكانی تر، چونكە لە ڕۆژنامەوانیدا بۆشاییەكی زۆر كەم بۆ مانشێت تەرخان كراوە و لەم بۆشاییەدا نووسەر پێویستە بەشێوەیەكی سەرنجڕاكێش مانشێتەكە بنووسێت. دەكرێت بگوترێ كە زمانی مانشێت زمانێكی

ئابوورییانە، نووسەر دەبێت بە چەند وشەیەکی کەم و بە بەکارهێنانی چەند تەکنیکێکی زمانی پەیامەکەی خۆی بگەیەنێت. بۆ ئەم مەبەستە، لەم توێژینەوەدا تەکنیکەکانی بڕین و لابردنی هەندێ یەکەی زمانی و بەکارهێنانی وشەی تایبەت و دەمکاتەکان و ئیدیۆم و پەندە کوردییەکان و خاڵبەندی خراونەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە.

### ١,٢ بڕین و لابردن

یەکێك لە سیما جیاکەرەوەکانی زمانی مانشێت بریتییە لە لابردن یان بڕینی چەند یەکەیەکی زمانی. Reah (1988) پێی وایە کە لە مانشێتدا وشە تەواوەکانی وەکو ناو و کار و ئاوەڵناو و ئاوەڵکار، کە مانای تەواویان هەیە، زیاتر بەکاردەهێنرێن، بەلاّم وشە ئەرکییەکانی وەکو ئامرازەکانی ناسین و ئاماژە و پەیوەندی و کەسێتی کەمتر بەکاردەهێنرێن و زۆرجار لادەبرێن.

(١٢) *بزووتنەوەی ئیسلامی نەیانهێشت عەلی باپیر سەردانیان بکات*، (هاولاّتی، ٣٢٦، ٢٠٠٧)

هەرچەندە مانشێتی (١٢) هێشتا وشەی ئەرکی تیادایە بەلاّم تا رادەیەکی باش هەوڵدراوە بۆ ئەوەی وشەکانی وەکو (کە، بۆ، لە، هتاد) لابرێت، بۆ ئەوەی مانشێتەکە درێژتر نەبێت و رووبەرێکی زیاتر لە رۆژنامەکە داگیر نەکا. دەکرا ئەم مانشێتە بەشێوەیەکی کورتتریش بنووسرایە، بۆ نموونە عەبدولکەریم (٢٠٠٧) پێی وایە کە دەکرا بەم شێوەیەی خوارەوە (١٣) بنووسرایە:

*(١٣) بزووتنەوە عەلی باپیر رەتدەکاتەوە.*

### ٢,٢ بەکارهێنانی وشەی تایبەت

رۆژنامەنووسانی پرۆفیشناڵ لە نووسینی مانشێتدا هەوڵدەدەن وشەی تایبەت و سەرنجڕاکێش بەکاربهێنن. مەبەستیش لە وشەی تایبەت زیاتر بەکارهێنانی وشەی سەرنجڕاکێش و سادە و ئاوازدارە، بۆ نموونە بەکارهێنانی وشەی تاك بڕگەیی لەوانەیە کاریگەری زیاتر بێت و زووتر بچێتە مێشکی خوێنەرەوە نەك وشەی درێژ و چەند بڕگەیی، (Swan, 2005). لە رۆژنامە ئینگلیزییەکاندا زیاتر

فـۆرمی کـورتکراوەی وشـەکان بـەکاردەهێنرێت، بـۆ نموونـە لـەجیاتی " نەتـەوە یەکگرتووەکان کورتکراوەی (UN) بەکاردەهێنرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە کوردیدا بـۆ زۆربـەی چـەمکەکان کـورتکراوە نییـە زۆرجـار وشـە درێـژەکان وەکـو خۆیـان بەکاردەهێنرێنـەوە. لـە کوردیشـدا وشـەی درێـژ و وشـەی کـورت هەیـە. بـۆ روونکردنـەوەی فـۆرمی درێـژ و کـورتی وشـەکان ئـەم خشـتەیەی خـوارەوە (٢) دەخەینـە بەردەسـت کـە لـە نووسـینی بەشـێك لـە مانشـێتەکان هەوڵدراوە وشـە کورتـەکان بـەکاربهێنرێن بـەڵام لـە نووسـینی بەشـێکی زۆری مانشـێتەکان ئەمـە فەرامۆش کراوە.

**خشتەی ژمارە (٢) کورتی و درێژی وشەکان لە مانشێتدا**

| فۆرمی کورتی وشەکان | فۆرمی درێژی وشەکان |
|---|---|
| گرتن | دەستگیرکردن |
| کشانەوە | پاشەکشەکردن |
| پەرلەمان | ئەنجوومەنی نیشتیمانی |
| ئەمریکا | ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا |
| هەیە | لە ئارادایە |
| هاوسەر | ژن و مێرد |
| پشێوی | بێسەروبەری |
| دیمانە | چاوپێکەوتن |
| ئیمارات | یەکێتی ئیماراتە عەرەبییەکان |

کاتێك باس لە وشەی تایبەت دەکرێت، ئەوا تەنیا وشەی کورت و وشەی درێـژ ناگرێتەوە، بەڵکو وشەی هەستیار و ناهەستیاریش دەگرێتەوە. رۆژنامەنووسان لـە نووسینی رۆژنامەوانیدا بەگشتی و لە نووسینی مانشـێتدا بەتایبـەتی هـەوڵی ئـەوە دەدەن کە خۆیان بەدوور بگرن لە بەکارهێنانی وشەی هەستدار کە لەوانەیە ببێتـە هۆی بریندارکردنی هەستی توێژێك لـە توێـژەکانی کۆمەڵگـە، وەکـو توێـژی ژنـان، منداڵان، کەمئەندامان یان هەر توێژێکی تر. بۆ نموونە ئەوان دەزانن کە نابینایـان پێیان خۆش نییـە کـە پێیـان بوترێـت " کـوێرە" یـان ئـەو کەسـانەی دەسـت یـان

قاچیان لەدەستداوە پێیان خۆش نییە پێیان بگوترێت " شەل" یان " گۆج" هتاد، ( عەبدولکەریم، ٢٠٠٧). بۆیە زۆر جار لە مانشێتدا وشەی تایبەتی وەکو "کەمئەندامان" یان " خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان" بۆ ئەم توێژانە بەکاردێت.

**٣,٢ دەمکاتەکان**

زۆربەی دەمکاتەکان لە نووسینی مانشێتدا بەکاردەهێنرێن، بەلاّم بەشێکی زۆری رۆژنامەنووسە بە ئەزموونەکان لە کاتی نووسینی مانشێتدا هەولّی ئەوە دەدەن کە دەمکاتی رانەبردووی سادە بەکاربهێنن، واتە خۆیان بە دوور دەگرن لە بەکارهێنانی دەمکاتی رابردوو و دەمکاتە ئالۆزەکانی وەکو رانەبردووی تەواو و دوور یان رانەبردووی بەردەوام، ئەمەش لەوانەیە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی بگەڕێتەوە. یەکەم: بەکارهێنانی رانەبردووی سادە وا لە خوێنەر دەکات کە هەست بکات هەواڵەکە زۆر نوێیە، کە ئەمەش بەهایەکی تایبەت بە هەواڵەکە دەدات، چونکە ئەگەر رابردوو بێت خوێنەر هەست دەکات هەواڵەکە کۆن بووە و پێویست بە خوێندنەوەی ناکات. دووەم: رانەبردووی سادە تێگەیشتنی ئاسانترە لە دەمکاتە رانەبردووەکانی تری وەکو رانەبردووی بەردەوام. با لەم مانشێتانەی خوارەوە وردبینەوە:

(١٤) *شەڕی تایفی هەڕەشە لە عێراق دەکات*، (هەولێر پۆست، ١٣٧، ٢٠٠٧).

(١٥) *دەوڵەتی عێراقی ئیسلامی هەڕەشە لە ٢٣ کەس دەکات*، ( هاولاّتی، ٣٢٧، ٢٠٠٧).

ئەگەر سەیری ئەم دوو مانشێتەی سەرەوە بکەین دەبینین کە هەردووکیان بە دەمکاتی رانەبردووی سادە نووسراون. ئەگەر مانشێتی ژمارە (١٤) یان ژمارە (١٥) بە دەمکاتی رابردوو بنووسرایە ئەوا هەواڵەکە بەهای خۆی لەدەست دەدا و سەرنجی خوێنەری رانەدەکێشا و خوێنەر هەولّی نەدەدا هەواڵەکە بخوێنێتەوە.

**٤,٢ ئیدیۆم و پەند لە مانشێتدا**

ئیدیۆم و پەند دوو دەستەواژەن کە پەیوەندییان بە کەلتووری گەلە جیاوازەکانەوە هەیە. ئیدیۆم لە چەند وشەیەك پێکدێت کە مانا گشتییەکەیان

جیاوازە لە مانای هەر وشەیەك بە تەنیا، پەندیش بریتییە لە وتەیەك كە ئامۆژگاری و حیكمەتی تێدایە و لەلایەن خەڵكی خاوەن ئەزموونەوە گوتراوە و لەلایەن خەڵكەوە بەرێزەوە سەیر دەكرێت، (Oxford Dictionary، ٢٠٠٤). لەبەر گرنگیی ئەم دەستەواژانە و بۆ زیاتر سەرنجڕاكێشانی خوێنەران، لە نووسینی مانشێتدا ڕۆژنامەنووسان زۆرجار پەنا دەبەنە بەر بەكارهێنانی ئیدیۆم و پەند، وەكو ئەم نموونانەی خوارەوە:

*(١٦)بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی دەست بە كار دەبێت.*

*(١٧)بانێكە و دوو هەوایە. ( هەولێر پۆست، ١٤٢، ٢٠٠٧)*

وەكو دەبینین لە نموونەی ژمارە (١٦) " دەست بە كار" ئیدیۆمێكی كوردییە و لە سێ وشە پێكهاتووە كە هەر یەكەیان بە تەنیا مانای جیاوازیان هەیە. هەروەها نموونەی ژمارە (١٧) یش پەندێكی كوردییە بە مانای ئەوە دێت كە نایەكسانی و ناعەدالەتی هەیە.

**٥،٢ خاڵبەندی لە مانشێتدا**

خاڵبەندی ڕۆڵێكی گرینگی هەیە لە نووسینی مانشێتدا، چونكە یارمەتی نووسەر دەدات لە كورتكردنەوەی مانشێتەكەدا. محەمەد (٢٠١٠: ١٦٢) پێی وایە كە خاڵبەندی لە ڕۆژنامەوانیدا یارمەتی خوێنەر دەدات بۆ ئەوەی بە باشی لە بابەتەكە بگات و تێگەیشتنەكە ئاسانتر دەكات و ئاڵۆزی ناهێڵێت. ئەو پێی وایە كە نیشانەكانی خاڵبەندی مانشێتەكان كورتتر دەكەن و لە ڕووی پەیبردن بە ماناكەیشیانەوە ئاسانتری دەكەن. لەوانەیە هێماییێكی وەكو كۆما (،) یان نیشانەی پرسیار (؟) یان سەرسوڕمان (!) جێگەی چەندین وشە بگرێتەوە، (یاسین، ٢٠٠٤). لە ڕۆژنامە كوردییەكاندا زۆرجار هێمای (: ) بۆ وتەی وەرگیراو لە كەسێكی دیاریكراو بەكاردەهێنرێت، واتە ئەم دوو خاڵە لەجیاتی وشەی " گوتی" بەكاردەهێنرێت، وەكو ئەم نموونانەی خوارەوە:

*(١٨)سەرۆكی حكومەتی هەرێم: ساڵی ئاینده ئابووری كوردستان بەشێوەیەكی بەرچاو گەشە دەكات.*

*(١٩) پسپۆڕێکی ئابووری: ژنان خۆیان لە بواری ئابووری نایەنە پێشەوە، (هاوڵاتی، ٣٢٥، ٢٠٠٧).*

هێمای کۆما یان وێرگول (،) لە مانشێتدا چەندین ئەرکی هەیە. ئەم هێمایە کە مانای وەستانێکی کورت دەگەیەنێت، زۆرجار بۆ ریزکردنی شتەکان بەکاردەهێنرێت و هەندێ جاریش لەجیاتی وشەی هەروەها یان (و) بەکاردەهێنرێت، وەکو ئەم نموونەی خوارەوە:

*(٢٠) باری خەڵك نالەبارە، رژێم لە قەیرانە، ( هاوڵاتی، ٣٢٥، ٢٠٠٧).*

*(٢١) حکومەتی هەرێم، تورکیای بە دەستتێوەردان لە کەرکوك تۆمەتبارکرد، (محەمەد، ٢٠١٠: ١٦٢).*

وەکو دیارە لە نموونەی (٢٠) وێرگولەکە بە مانای هەروەها یان (و) بەکارهێنراوە، بەڵام لە نموونەی (٢١) وێرگولەکە بە مانای وەستانێکی کورت دێت.

نیشانەی وتە گواستنەوە یاخود گیومە (" ") یان کۆمای سەراوژێر لە سەرەتا و کۆتایی وتەی وەرگیراو دادەنرێت و ئەوە پیشان دەدەن کە ئەم رستەیە یان ئەم گوتەیە لە کەسێکی دیاریکراو وەرگیراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە مانشێتدا بواری ئەوە نییە وتەی کەسێکی تر بەدرێژی وەربگیرێت و بگوازرێتەوە، بۆیە گیومە زیاتر بۆ دەستنیشانکردنی زاراوە یاخود دەستەواژەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنرێت، (محەمەد، ٢٠١٠: ١٦٤)، بۆ نموونە:

*(٢٢) هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی رێگەچارەی سیاسی بۆ "کەرکوك"*

*(٢٣) رۆڵی "مافیا" لەنێو سیاسەتمەداران و پۆلیسی عێراقدا*

لە نموونەی (٢٢) وشەی "کەرکوك" و لە نموونەی (٢٣) یش وشەی "مافیا" وشەی تایبەتن و لە مانشێتەکە پێویستییان بەوە هەیە زەق بکرێنەوە بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەران رابکێشن، بۆیە دەبینین کە خراونەتە نێوان دوو نیشانەی گیومە.

ئەمە و نیشانەکانی تری خاڵبەندی لێرەو لەوێ لە مانشێتی رۆژنامەکاندا دەبینرێن و بە مەبەستی جیاجیا بەکاردەهێنرێن، بۆ نموونە لە مانشێتە پرسیارئامێزەکاندا نیشانەی پرسیار (؟) دادەنرێت و لە مانشێتە سەیر و

سەمەرەکاندا، ئەوانەی کە دەبن بە جێگەی سەرسوڕمانی خوێنەران نیشانەی سەرسوڕمان (!) دادەنرێت، هتاد. لێرەدا گرینگ ئەوەیە کە ئەم نیشانە و هێمایانە هەر لەخۆڕا دانانرێن بەڵکو ئەرکی تایبەتی خۆیان هەیە و زیاتریش بە مەبەستی کورتکردنەوە و پتر روونکردنەوە بەکاردەهێنرێن بۆ ئەوەی خوێنەر بتوانێت لە بۆشاییەکی کەمی مانشێتێکدا بە ئاسانی لە ناوەڕۆك و مەبەستی هەواڵەکە بگات، ئەمەش یەکێکە لە لایەنە جیاکەرەوەکانی زمانی رۆژنامەوانی.

پاش رووماڵکردنی نزیکەی ٦٥٠ مانشێتی ژمارەکانی یەك ساڵی هەردوو رۆژنامەی توێژینەوەکە، بە مەبەستی زانینی چەندێتی و چۆنیەتی بەکارهێنانی تەکنیکە زمانییەکان، ئەم خشتەیەی خوارەوە دەخەینە بەردەست، کە تیایدا دووبارەبوونەوەی هەر یەك لەو پێنج تەکنیکەی باسمان کرد روون کراوەتەوە.

**خشتەی ژمارە (٣)**

**دووبارە بوونەوەی تەکنیکە زمانییەکان لە مانشێتدا**

| تەکنیکە زمانییەکە | رۆژنامەی هاوڵاتی | رۆژنامەی هەولێر پۆست |
|---|---|---|
| برین یان لابردن | ٨٨ | ٩١ |
| وشە تایبەتەکان | ٩٠ | ٨٩ |
| دەمکاتی رانەبردووی سادە | ٥٠٣ | ٤٧١ |
| ئیدیۆم یان پەند | ٤٤ | ٣٠ |
| خاڵبەندی | ٤١١ | ٤٠٥ |

ئەگەر شیکردنەوەیەك بۆ خشتەی ژمارە (٣) بکەین، لە دووبارەبوونەوەی تەکنیکە زمانییەکان دەبینین کە هەردوو تەکنیکی دەمکاتی رانەبردوو و خاڵبەندی پشکی شێریان بەرکەوتووە، چونکی زۆربەی مانشێتەکانی ئەو ساڵەی هەردوو رۆژنامەکە بە دەمکاتی رانەبردووی سادە نووسراون و زۆربەشیان خاڵبەندییان تیادا بەکارهاتووە. ئەمەش مانای ئەوەیە لە رووی زمانییەوە رۆژنامەنووسان بە ئاگان و ئەزموونیان هەیە و دەزانن کە بۆ نووسینی هەواڵ دەمکاتی رانەبردوو

باشترین دەمکاتـە، چـونکە ئـەم دەمکاتـە وا دەکـات هەواڵەکـە نـوێ دیـار بێـت و سەرنجی خوێنەران رادەکێشێت بۆ خوێندنـەوەی هەواڵەکـە. هـەروەها نووسـەرانی ئەم مانشێتانە ئەوەشیان زانیوە کە خاڵبەندی تەکنیکی چاکە بۆ ئاسـانتر کـردن و روونترکردنـــەوەی مانشـــێتەکان، هـــەروەها خاڵبەنـــدی یارمەتیدەریشـــە بـــۆ کورتکردنەوەی مانشێتەکان و نووسینیان لە رووبەرێکی کەمتر. لەلایـەکی تـرەوە، وەکو لە خشتەکە دیارە هەردوو تەکنیکی لابردن و وشە تایبەتەکان نزیکەی وەکو یەك بەکارهێنراون، بەڵام تەکنیکی ئیـدیۆم و پەنـد کـەمتر بـەکارهێنراوە، ئەمـەش لەوانەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە شارەزابوون لە بەکارهێنانی ئیدیۆم و پەند کارێکی ئاسـان نییـە و هـەموو رۆژنامەنووسـێك شـارەزایی و ئـەزموونی لـەم بـوارە نییـە، چونکە ئەمانە لایەنی کەلتوورییان هەیە و پێویستییان بە کەسانی پسپۆڕ هەیە.

## ئەنجام:

لــە شــیکردنەوەی داتاکــانی ئــەم توێژینەوەیــە دەگەینــە ئــەم ئەنجامانــەی خوارەوە:

١. فۆرمــە جیاجیاکــانی نووســینی مانشــێتەکان، نــەك تــەنیا زمــان، ڕۆڵێکــی گرینگی هەیە لە سەرنجڕاکێشانی خوێنەران بۆ خوێندنەوەی هەواڵ و ڕاپۆرتــەکانی هەر ڕۆژنامەیەك.

٢. هــەردوو فــۆرمی پەیــژەیی و هــەرەمی ســەراوژێر لــە نووســینی مانشــێتی کوردیــدا کــەمتر بــەکاردەهێنرێن، چــونکە ئــەم فۆرمانــە ئــاڵۆزن و پێویســتییان بــە ڕۆژنامەنووسی بە سەلیقە و پرۆفێشناڵ هەیە، بــەڵام فۆرمــە ســادە و ســاکارەکانی وەکــو فــۆرمی راســت و وتــەی وەرگــێراو و پرســیارکردن و دووبــەش زیــاتر بەکارهێنراون، کە لە ڕووی دیزاین و نووسینەوە لە فۆرمەکانی تر ئاسانترن.

٣. لەبەر ئەوەی ئەرکی سەرەکیی زمان گەیاندنی زانیارییەکانە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا کە گشت خەڵك تێی بگەن، بۆیە زمانی مانشێت زمانێکی سادەیە و مەبەست لــە ســادەیییەکەی ئەوەیــە کــە گشــت خــەڵك لێــی تێبگــەن، بۆیــە زمــانی مانشێت لــە زمــانی ئاخــاوتن و نووســینی خەڵکــەوە سەرچــاوەی گرتــووە، چــونکە بەشی زۆری ڕۆژنامەکان بۆ زۆرینەی خەڵك دەنووسرێن و بڵاودەکرێنەوە.

٤. زۆربــەی هــەرە زۆری تەکنیکــە زمانییــەکان لــە نووســینی مانشــێتدا بــەکاردەهێنرێن، بــەڵام هــەردوو تــەکنیکی دەمکــات و خاڵبەنــدی زیــاتر بەکاردەهێنرێن. بۆ نووسینی هەواڵ دەمکاتی ڕانەبردوو باشترین دەمکاتە، چونکە ئەم دەمکاتە وا دەکات هەواڵەکە نوێ دیار بێت و سەرنجی خوێنەران ڕادەکێشێت. هــەروەها خاڵبەنــدیش تــەکنیکی چــاکە بــۆ ئاســانترکردن و ڕوونترکردنــەوەی مانشێتەکان و یارمەتیدەریشــە بــۆ کورتکردنــەوەی مانشــێتەکان و نووســینیان لــە ڕووبەرێکی کەمتر.

٥. تەکنیکی ئیدیۆم و پەند لــە نووســینی مانشــێتدا کــەمتر بــەکاردەهێنرێت، ئەمەش لەوانەیە بۆ ئــەوە بگەڕێتــەوە کــە شــارەزابوون لــە بــەکارهێنانی ئیــدیۆم و پەند کــارێکی ئاســان نییــە و هــەموو ڕۆژنامەنووســێك شــارەزایی و ئــەزموونی لــەم بوارە نییە، چونکە ئەمانە لایــەنی کــەلتوورییان هەیــە و پێویســتییان بــە کەســانی پسپۆڕ هەیە.

## سەرچاوەکان

### ١. سەرچاوە کوردییەکان


- برزۆ، ئومێد بەرزان & بابۆڵی، محمد ( ٢٠١٣) " زمانی زبر لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، ڕۆژنامەکانی ( کوردستانی نوێ، هاوڵاتی، ڕۆژنامە) وەك نموونە". گۆڤاری زانکۆی کۆیە (زانستە مرۆڤایەتییەکان)، ٢٧.
- سەپان، مەغدید ( ٢٠٠٥) ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠-١٥٠٠. هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.
- خۆشناو، نەریمان عەبدوڵڵا ( ٢٠١٣). زمانی ستانداری کوردی. چاپی یەکەم. هەولێر: چاپخانەی هێڤی.
- عەبدولکەریم، کاوە (٢٠٠٧). "فۆرم و بنەما زمانییەکانی مانشێت". رامان (١٢٢).
- ڕەمەزان، ئازاد (٢٠٠٩). بنەما زمانییەکانی داڕشتنی هەواڵ لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا، لەنێوان ساڵانی ١٩٩١-٢٠٠٠. هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.
- مەردان، عەبدولقادر عەلی & بەرزنجی، ئەحمەد سەید عەلی (١٩٩٩) چاپکردن و نەخشەسازی. هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.
- محەمەد، کارزان ( ٢٠١٠) ڕۆژنامەوانی مۆدێرن. سلێمانی: خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا.
- وەسانی، دڵشاد مستەفا (٢٠١١) هەواڵ و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی. هەولێر: چاپخانەی ڕۆشنبیری.
- یاسین، حەسەن (٢٠٠٤) ٢٤ وانە لە یادی ڕۆژنامەنووسی کوردییەوە. سلێمانی: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان.


### ٢. سەرچاوە ئینگلیزییەکان


- Abdul, Jamal (2006). A Dictionary of Communication. Slemani: Sardam.
- Baddock, B. (1988). Scoop! Communication with British Newspapers. UK: Prentice Hall International.
- Conboy, Martin (2010) The Language of Newspapers: Socio-historical Perspectives. New York: Continuum International Publishing Group.
- Crump, S. (1974). Fundamentals of Journalism. USA: Library of Congress.
- Oxford Wordpower (2006). New York: Oxford University Press.
- Reah, D. (1988). The Language of Newspaper. London: Routledge.
- Swan, M. (2005. Practical English Usage. London: Oxford University Press.
- Wilcox, D. L. and Nolte, L. W. (1997). Public Relations Writing and Media Techniques. (3rd Ed.). New York: Longman.


### پاشکۆی ڕۆژنامەکان:


١. ڕۆژنامەی هاوڵاتی (٢٠٠٧)، ژمارەکانی ٣٠٤ تا ٣٤٤.
٢. ڕۆژنامەی هەولێر پۆست (٢٠٠٧)، ژمارەکانی ١٠٢ تا ١٤٣

## ملخص البحث


يعد المانشيت (أي العنوان الرئيسي) جزءاً مهماً من أجزاء الخبر، ويأتي دائماً على شكل عنوان رئيسي في بدايته، وله شكله ومكوناته اللغوية واللسانية الخاصة به. ويهدف هذا البحث الى التعرف على مختلف الجوانب الشكلية واللغوية للمانشيت في الصحافة الكوردية، وذلك عن طريق استخدام منهج (تحليل المضمون) للبيانات، ومن الناحيتين النوعية والكمية. والهدف الرئيسي هو معرفة مدى التزام الصحافة الكوردية المعاصرة والصحفي الكوردي بالمعايير العالمية والحرفية في استخداماتها للجوانب الشكلية واللغوية للمانشيت.

عندما نتحدث عن المكونات اللغوية للمانشيت، لانعني الجانب المنطوق من اللغة كالكلمة والمقطع والجملة فحسب، وأنما نعني بها الجانب غير المنطوق أيضاً كما الجانب التصميمي للصفحات وموقع الخبر وطوبوغرافيا الصفحة، فمن المؤكد أن لتصميم الصفحات وأحجام الحروف ونوعياتها وألوانها تأثير كبير في عملية إيصال الخبر وجعله جذاباً وملفتاً للنظر.

ومن الواضح أن المانشيت موجود في الصحافتين المطبوعة والالكترونية، ويقتصر هذا البحث على دراسة المانشيت في الصحافة المطبوعة الكوردية لذا تناول إعداد سنة كاملة لصحيفتين وهما (هاولاتی) و(هەولێر پۆست) وأجرينا مسحاً شاملاً لهما محللين مضامين العينات المطلوبة نوعاً وكماً.

يتكون البحث من محورين رئيسيين، أولهما هو بحث نظري عن المانشيت وأنواعه الثمانية وذكر نماذج لكل منهما وتوضيح ذلك في جداول كمية خاصة بالصحيفتين المذكورتين. والمحور الثاني خاص بدراسة نوعية المانشيتات وكيفية التعامل مع الكلمات الخاصة والصيغ والأمثال الكوردية وفنون التنقيط وكل ما يتعلق بها.

## Abstract

Linguistic Components of Kurdish Newspaper Headlines

The headline or title, which is the main part of news that appears at the top of all journalistic news, has its own form and linguistic construction. This paper is an attempt to identify the linguistic characteristics and components of headlines in Kurdish newspapers. Content analysis is used as the methodological tool, both quantitatively and qualitatively, to analyze the data. The study aims at knowing how the modern Kurdish newspapers use the prominent linguistic components of headlines, and how the Kurdish journalists do the task of editing professionally.

The linguistic components of headline do not only include the verbal communication such as words, phrases, sentences and the other linguistic units, but they include the form and the layout of the page. The form of the headline has a critical role in conveying the message, that's why the headlines are usually written in different forms.

Though, all the types of media, whether electronic or written, have headlines, this study focuses on studying newspaper headlines, which is included within written media. The data are taken from the issues of two modern Kurdish newspapers, Hawler Post and Hawlati. The study surveys the issues of one year of these newspapers.

The study is divided into two sections. The first section deals with the main forms of headlines. Eight types of headlines are discussed in this section and examples from the headlines of the two newspapers are provided. The second section deals with the linguistic components of headlines. The linguistic techniques of deletion, using special words, tenses, idioms and proverbs are discussed.

# خەسڵەتەکانی
# زمانی شیعری کوردیی هاوچەرخ
### ( لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ڕەخنەیی پراکتیکییە )


**د. عادل گەرمیانی**
**زانکۆی بەغدا / کۆلێژی زمان**
**بەشی زمانی کوردی**


**پێشەکی**

زمان باشترین کەرەسەی دەربڕینە بەلای مرۆڤەوە بە تایبەتی لای ڕۆشنبیر و ئەدیبەوە، شیعریش بەحوکمی ئەوەی زیاتر بۆ هەست و سۆزی ناخەوەی پەیاموەرگرەکەی دادەڕێژرێت و دەنووسرێت، زیاتر لەڕێی جۆرە زمانێکی هەست دەرخەری واتادارەوە کاریگەریی خۆی بەسەر خوێنەرانی ڕادەگەیەنێت. هەروەها زمان بۆ شیعر کرۆك و ناخە، یان جلوبەرگە بەهۆیەوە خۆی دەڕازێنێتەوە و، سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، بۆیە لە فۆرمی شیعریدا زمان گرنگیی تایبەتیی خۆی هەیە.

سادەترین پێناسەی ئەدەب زمانە، چونکە باشترین کەرەسەکانی ڕازاندنەوەی بەرهەمی ئەدەبی زمانە، شیعریش وەك بەشێکی زۆر گرنگی ئەدەب ڕاستەوخۆ بە زمانەوە خۆی دەڕازێنێتەوە. هەروەها سادەترین پێناسەی ئەدەب دەربڕینێکی جوانە لەڕێی هەڵبژاردنی زمانێکی کاریگەر بۆ ڕاگەیاندنی پەیامەکەی بە پەیاموەرگری دەقەکەیدا. لەم حاڵەتەدا دەقنووس وەك پەیامنێرێك هەوڵدەدات کەرەسەی لەبار هەڵبژێرێت بۆ ڕاگەیاندنی بیر و بۆچوونەکانی لەنێو دەقەکەیدا ئەویش زمانە، کەوا بە بنەمایەکی سەرەکیی ئەدەب دادەنرێ.

پێناسەی زمان لە زانستی زماندا ئەوەیە : کەرەسەیەکە بۆ دەربڕین و هۆیەکە بۆ لێکتری گەیشتن، هەروەها لەم زانستە پێناسەی زمان بەوەش دەکرێ کەوا دیاردەیەکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییە. کەواتە لەم جۆرە پێناسانە ئەرك و

خەسڵەتەکانی زمان ڕوون کراوەتەوە، بەڵام لە بواری زانستی ئەدەبدا چەندین پێناسەی هەمەڕەنگ بۆ زمان کراوە و، زیاتر لە بواری شیعردا جۆراوجۆریی ئەرك و خەسڵەتەکانی زمان خراونەتە ڕوو.

وەك دەوترێ " شیعر هونەرێکە شاعیر لە ڕێگای زمانەوە بە شێوازێکی ڕێك و تەکنیکی هونەری مامەڵەکردنی هونەرەوە، لە پانتایی فەرهەنگی زماندا دەستەبەری دەکات "[1].

هاوکێشەی نێوان شیعر و زمان کاریگەریی خۆی دەبێت لەو کاتەی هۆنیار زمانێکی باڵا هەڵدەبژێرێ بۆ نواندنی کاریگەریی خۆی بەسەر پەیاموەرگرەکەیدا، جیاوازبوونی خۆی هەیە لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی خەڵکیدا، چونکە " شاعیر بە زمانێکی زۆر باڵا و پڕ لە دەسەڵات بۆ بابەت و ناوەڕۆك دەڕوانێت "[2]. زمان وەك دیاردەیەکی مرۆڤایەتی لە گۆڕاندایە بە پێی ڕۆژگاری ئەدەبی هەندێ وشەی تازەتر دروست دەبێت، یان هەندێ وشە سواو و بێ کەڵك دەبێت، ئەم جۆرە دیاردە زمانەوانییە زیاتر لەنێو هەردوو جۆری شیعری کلاسیکی و شیعری نوێ بەرچاو دەکەوێت. ئەمەش بە حوکمی ئەوەی ژیان لە گۆڕاندایە و، زمانیش وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی هەمیشە لە گۆڕاندا دەبێت.

زمانی دەقی شیعری دەبێ جیاواز بێت لە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵکی لەڕووی بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگیی واتادار و کاریگەر، هەروەها بەکارهێنانی دەستەواژەی خاوەن ئیدیۆمی تایبەت و، بەکارهێنانی ڕستەی سەرنجڕاکێشی پڕ لە ئەندێشەی هونەری، بە پێچەوانەی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵکی کەوا پڕە لە وشەی سادە و دەستەواژە و ڕستەی خاوەن واتای ڕاستەوخۆ، بەڵام هۆنیار دەبێ جۆرە زمانێکی پاراو لەنێو دەربڕینی دەقە شیعرییەکەیدا بەکار بهێنێ، هەروەها دەبێ جۆرە زمانێکی ڕازێنراو بەکاربهێنێ بۆ بەخشینی کاریگەری بە پەیامی دەقە شیعرییەکەیدا، چونکە " شیعر پارستاییێکی زمانە، کاریگەریشی زۆر لە زمانی ئاسایی پترە، ئەگەر بەپێی ئەم تێڕوانینە بڕوانین، دەبینین زمانی شیعر بە ڕێگای هەمە جۆر ڕێکخراوە، کاتێك کە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لەسەر شیعر پراکتیك دەکرێت، بەشێوەیەکی گشتی بنەمای ئەو ڕاستییانە دەستدەکەون، کە دەبنە جیاوازیی نێوان بونیاتی ڕێزمانی شیعر و زمانی ئاسایی (ڕۆژانە)"[3].

میتۆدی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانەوانی شیکاری هەڵبژاردەییە و، پێکهاتەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە پێشەکی و دوو تەوەرە و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکانە، لەگەڵ کورتە باسێکی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی. تەوەرەی یەکەممان بۆ چەمك و پێناسەی زمانی شیعری تەرخان کردووە و، تەوەرەی دووەممان بۆ لێدوان بە وردی لەبارەی خەسڵەتەکانی زمانی شیعری کوردیی هاوچەرخ تەرخان کردووە. هیوادارین بەم لێکۆڵینەوەیە کەلێنێکمان لە ڕەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخمان پڕ کردبێتەوە..

## تەوەرەی یەکەم :
## چەمك و پێناسەی زمانی شیعری

زمان لایەنێکی گرینگ و بنەڕەتییە لە شێوازی ئەدەبیدا، چونکە زمان و مۆسیقا و وێنەی هونەری سێکوچکەی بنەڕەتیی شێوازی ئەدەبین و، لە بواری شیعریشدا زمانی شیعر گرنگترین بەشەکانی شێوازی شیعرییە، بە هۆیەوە هۆنیار دەتوانێ جوانی و کاریگەریی شێوازە شیعرییەکەی پێشکێش بکات، هەر لایەنی زمانی شیعری بووەتە جۆرە جیاکردنەوەیەك لەنێوان شێوازی کلاسیکی و شێوازی نوێی شیعر نووسیندا. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین زمانی شیعری دەکرێ ببێتە کەرەستەیەکی لەبار بۆ تۆژینەوەی سیمانتیکی لە نێوان هەردوو بواری تۆژینەوەی زمانی و تۆژینەوەی ئەدەبی، چونکە بە جوانی لە بواری شیعردا ئاستەکانی زمان لە بوارەکانی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیدا خۆی دەنوێنێت، چونکە دەنگی پیتەکان ڕۆڵی خۆیان هەیە لە بەخشینی مۆسیقای شیعری، هەروەها جۆری وشەکان لەڕووی بڕگەسازییەوە ڕۆڵی خۆیان هەیە لە بەخشینی کێشناسی بە شیعرەکە و، لایەنی ڕستەسازی ڕۆڵی خۆی هەیە لە بەخشینی واتای شیعری. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین زمانی شیعر دەچێتە خانەی زمانی باڵاوە (میتازمان) کەوا جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی خەڵکیدا وەك چۆن زمانناسی بەناوبانگ دی سۆسێر جیاوازی لەنێوان هەردوو جۆری زمانی نووسین (language) و زمانی ئاخاوتنی (speak) خەڵکی دیاری کردووە، هەرچەندە " زمانی شیعر بە بەشێك لە پێشکەوتنی زمانی ئاسایی دادەنرێت، ڕەنگدانەوەشی لە بەرهەمی ئەدەبی و

فۆلکلۆری کارێکی ئاسایی و زیندووە بە گۆڕانی شێوازیش دادەنرێت"[٤]. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە شیعری کوردیدا دیاردەی ڕەنگدانەوە و بەکارهێنانی شێوەزاری کوردی بەدی دەکرێت، تەنانەت لایەنی دیالێکت ڕۆڵی مێژوویی خۆی هەیە لە دیاریکردنی قۆناغە مێژووییەکانی شیعری کوردیدا، کەوا سەرەتا بە زاری لوڕی نووسراوە وەك هۆنراوەکانی بابە تاهیری هەمەدانی و پاشتر بە زاری گۆران نووسراوە وەك لە هۆنراوەکانی بێسارانی و صەیدای هەورامی، پاشتریش بە زاری کرمانجیی سەروو وەك لە هۆنراوەکانی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی بەدی دەکرێت، پاشتریش بە شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست هۆنراوەی کوردی نووسراوە وەك لە هۆنراوەکانی نالی و سالم و حاجی قادری کۆیی و مەحوی و گۆران و کامەران موکری و جەلالی میرزا کەریم و شێرکۆ بێکەس و قوبادی جەلیزادە بەدی دەکرێت.

دیارترین لایەنەکانی زمانی شیعری لەوەدایە هۆنیار (شاعیر) بە ئەنقەست هەندێ ڕستە و دەستەواژەی نێو دەقەکەی هەڵدەبژێرێ لەڕووی سەرسوڕمان و پرسیارکردن و ئەرێ و نەرێ و ڕستەی واتادار و جۆرەکانی ڕستەوە، هەروەها هۆنیار وەك دەقنووس لەنێو زمانی دەقەکەیدا سوود لە هەندێ لایەنی دەنگسازی وەك هێز و بڕگە وەردەگرێت، جگە لە سوود بینینی لە لایەنەکانی وشەسازی و ڕستەسازی بۆ بەخشینی جۆرە کاریگەرییەك بە زمانی دەقەکەی. لێرەدا پێویستە بڵێین هەرچەند باری زمان گرانتر بکرێت لە کاتی نووسینی دەقی شیعردا لەڕووی بەکارهێنانی لێڵی و تەمومژی لە بواری واتاسازی و دەستەواژە و ئیدیۆمی ناڕوون، هەروەها لە بواری بەکارهێنانی جۆرە ڕستەیەکی شیعریی درێژدادەر، ئەوەندە باری تێگەیشتن لە چێژی ئەم جۆرە زمانە لای خوێنەری دەقەکە گرانتر دەبێت.

لە توانای زمانی شیعریدا هەیە خوێنەر بباتە نێو ناخی ژیانی کۆمەڵەکەی، یان دووری بخاتەوە لە ڕاستیی ژیانی خۆی، بەپێی ئەو جۆرە زمانە شیعرییە لەنێو جیهانی هۆنراوەکە بەکارهاتووە، واتە زمانی دەقێکی شیعریی سەر بە قوتابخانەی کەتوارییەت (ڕیالیستی) جیاواز دەبێت لە زمانی دەقێکی شیعریی دیکەی سەر بە ڕێبازی ڕۆمانتیکییەت یان سوریالیزم. واتە هەرچەند زمانی هۆنراوەکە سادە و بێ لێڵی بێت ئەوەندە زۆربەی خوێنەرانی دەقە شیعرییەکە

دەکەونە بەر کاریگەریی زمانی شیعرەکە. ئەم بۆچوونەمان مانای ئەوە نییە زمانی هۆنراوەکە ڕاستەوخۆ بێت، یان دوور بێت لە هەندێ لایەنی چۆنێتی بەکارهێنانی هونەریی زمانی شیعری، کەوا ڕۆڵی خۆی هەیە لە بەخشینی چێژی دەق و پێکەوەنانی وێنەی هۆنراوەیی و شێواز و ئەندێشەی هونەریی و چۆنێتی پێشکێشکردنی بابەت و بیری هۆنراوەکە. ئەرکی گەورەی زمانی شیعری زیاتر لایەنی باوەڕ پێهێنانە بە خوێنەری دەقی شیعرەکە، چونکە کاری باوەڕهێنان دەکەوێتە ئەستۆی نووسەری دەق بەرانبەر خوێنەری دەقەکەی ئەمەیش زیاتر لەڕێی پەیامی دەقە شیعرەکەوە دەبێت. لەم بوارەشدا زمانی شیعری ڕۆڵی کاریگەریی خۆی هەیە، چونکە " ئامانجی سەرەکیی زمانی شیعر، گەیاندنی بابەتی (Theme) شیعرە، لەم هەلوێستەدا شیعر نەك ئاکام، بگرە ڕێگاشە، ئەگەر وەك مەبەست مامەڵە لەگەڵ شیعر کرا "(٥).

هەموو ڕێباز و قوتابخانە و شەپۆلەکانی ئەدەب بایەخێکی تایبەت دەدەن بە زمان لەبواری دارشتنی دەقە ئەدەبییەکاندا، هەرچەندە زۆر بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا جۆرە ئەدەبێکی ناوچەیی کوردی پەیدا بووە بایەخ بە زمانی ناوچەیی دەدات نەك بە زمانی کوردیی یەکگرتوو لە بواری نووسینی ئەدەبیدا، مەودای کاریگەریی ئەم جۆرە زمانە خۆماڵییە زۆر فرەوان نابێ، چونکە بۆ خەڵکی ناوچەیەك زیاتر دەشێت و، خەڵکی ناوچەکانی دیکەی کوردستان لەوانەیە بە ئاستەنگ لێی تێبگەن.

ئەم جۆرە کێشەیە بە زەقی لەنێو ئەدەبی کوردیدا لەم ڕۆژگارەدا بەرچاو دەکەوێ، هەر ئەو کێشەیە لە بواری زمان وەك کەرەسەیەکی دەربڕین کاریگەریی خۆی هەیە لەنێو بەرهەمە کوردییە ئەدەبییەکاندا، چونکە زمانی ستاندەر زیاتر دەتوانێ ئەم جۆرە کێشەیە چارەسەر بکات. خەمی نووسین بە زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو یەکێکە لە کێشە سەرەکییەکانی هەموو نووسەرێك لە کاتی دارشتنی دەقی ئەدەبیی خۆیدا.

هەرچەندە شیعر لەڕووی سەرهەڵدانەوە کۆنترین ڕەگەزەکانی ئەدەبە لە جیهاندا، بەڵام وەك مۆسیقا نەبووەتە خاوەن زمانی تایبەتی یەکگرتووی جیهانیی خۆی، کەوا لە پەیمانگا میۆزیکییەکانی جیهاندا مرۆڤ لە هەرکوێ هەبێت دەتوانێ

فێری ببێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعر خاوەن جۆرە زمانێکی هەست دەربەرە تەنیا ئەوانەی خاوەن هەستی جوانن دەتوانن بەکاری بهێنن یان لێی تێبگەن. ئەم بۆچوونە وامان لێدەکات بڵێین هەردوو دەستەواژەی (زمانی شیعر) و (زمانی شیعری) دروستن، چونکە لە هەردوو دەستەواژەکە دیارخەر (زمان) و دیارخراو (شیعر) هەیە، بۆیە ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونە نین کە دەڵێت " زمانی شیعر بوونێکی بەرجەستەی نییە و ڕامانێکی زەینییە وەك (تابلۆی شیعر، سەمای شیعر، وێنەی شیعر،...)، کە هیچ کامیان ئاماژە بۆ دیاردەیەکی زانستی ناکەن و دەربڕینی خوازەیین، بۆیە دەستەواژەی (زمانی شیعری) زانستیترە و لە لێکۆڵینەوەدا دەکەوێتە ژێر تیشکی یاسا زمانییەکان "[٦].

بە حوکمی ئەوەی شیعر کۆنترین جۆرەکانی ئەدەبە تا ئەم ڕۆژگارە پانتایەکی گەورە و فرەوانی لە جیهانی ئەدەبدا داگیر کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك وەك ئەوەی شیعر زمانی ویژدان و سۆزی مرۆڤە، هەروەها ئاسانیی لەبەرکردنی شیعر و کاریگەریی دارشتن و بایەخی شیعر لە هەندێ بۆنەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریدا جگە لەوەی شیعر وەك دەقێکی ئەدەبی پێویستی بە ژمارەیەکی زۆرتر نییە لە وشە وەك ئەوەی لەنێو چیرۆك و ڕۆماندا بەدی دەکرێت، هەروەها جوانیی وشە و کاریگەریی سیماکانی لە نێو شیعردا زیاتر بەرچاو دەکەوێت و، پێویستی هۆنیار بە جۆرە فەرهەنگێکی زمانەوانی لە نێو شیعردا زیاتر دەکەوێتە بەرچاو، هەروەها پێناسەی زمانی شیعری بەوەش دەکرێ کەوا زمانی شیعری جلوبەرگی ڕازێنراوی دەقی شیعرییە.

زمان لە شیعردا وەك کەرەستەیەك لە بواری گێڕانەوە و وێنەکاری و دانووساندنی شیعری بەکاردێت، هەروەها بۆ بەرجەستەکردنی بیری هۆنیاریش لەنێو دەقەکەیدا بەکاردێت و، بەم شێوەیە بەهاکانی زمان لەنێو شیعردا بەرجەستە دەبێت.

زمانی شیعری لەنێو هەردوو جۆری شیعری کلاسیکی و هاوچەرخدا هەندێ جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێ، بۆ نموونە لە شیعری کلاسیکیدا بە حوکمی ئەوەی دەبێ هۆنیار لایەنی ڕەوانبێژی ڕەچاو بکات بۆیە دەبینین هۆنیاری کلاسیکی تووشی هەندێ گیرو گرفتی زمانەوانی دەبێت، چونکە هۆنیاری کلاسیکی دەبێ

خەمی هەڵبژاردنی هەندێ وشەی یەك سەروا بخوات بۆ بەکارهێنانی لە کۆتایی بەیتەکانی هۆنراوەکەی. هەروەها دەبێ هۆنیار هەندێ وشەی فەرهەنگی بە واتای ڕەوانبێژی لە بوارەکانی لێکچوواندن و درکە و خوازە و خواستن بەکاربهێنێت. ئەمە جگە لەوەی زمانی شیعری لە هۆنراوەی کلاسیکیدا توانای شیعریی هۆنیار دەردەخات لە بەکارهێنانی جۆرە زمانێك بە هۆیەوە جیا دەکرێتەوە لە هۆنیارانی دیکە و، لە هۆنراوەی کلاسیکیدا هۆنیار بۆ دەرخستنی لێهاتوویی توانای شیعریی خۆی نەك تەنیا بە زمانی زگماکیی خۆی شیعر دەنووسێت، بەگرە بە چەند زمانی دیکەش شیعر دەنووسێ.

لە شیعری نوێ و پەخشانە شیعردا سروشتی زمان دەقاودەق وەك ئەوەی لەنێو شیعری کلاسیکیدا نییە، چونکە بە حوکمی ئەوەی سەرهەڵدانی شیعری نوێ بە جۆرە نوێکردنەوەیەکی ڕەوتی شیعر دادەنرێ. هەروەها لەدایکبوونی پەخشانە شیعریش لەم ڕۆژگارەدا بە هەنگاوێکی تازەتری نوێکردنەوەی شیعر دادەنرێت، بۆیە زمانی شیعری لە هەردوو جۆری شیعری نوێ و پەخشانە شیعر ئەرکە قورسەکەی لایەنی ڕەوانبێژی بەسەر کۆڵییەوە ئاسانتر بووەتەوە و، زمانی شیعری لەم دوو جۆرە شیعرەدا زیاتر بە نواندنی دەقی شیعری هەڵدەستێ و هەوڵدەدات وەك جلوبەرگێکی تازەی دەقە شیعرییەکە خۆی بنوێنێ. ئەمە جگە لەوەی وەك شیعری کلاسیکی زمانی شیعر لە هەردوو جۆری شیعری نوێ و پەخشانە شیعر بە ئەرکەکانی بەرجەستەکردنی بیر و وەسف و وێنەکێشانی حاڵەت و ناوەڕۆك و بابەتەکانی شیعر هەڵدەستێ لەگەڵ ڕۆڵ نواندنی لە هەردوو بواری گێڕانەوە و دانووساندنی شیعری کەوا لە شیعری نوێ و پەخشانە شیعردا زیاتر بەکار هاتوون.

زمانی شیعری لە پەخشانە شیعردا هەندێ ئاڵۆزی و بارگرانی بە خۆیەوە دەبینێ، چونکە زمانی شیعریی پەخشانە شیعر زیاتر وەك زمانێکی هێمایی خۆی دەنوێنێ بە حوکمی ئەوەی دەقی پەخشانە شیعر زیاتر دەقێکی مەعریفییە هەوڵدەدات چەندین لایەنی ئەفسانەیی و سیمبولی و مەعریفی و ڕۆشنبیری پێشکێش بکات و، زمانی شیعریی پەخشانە شیعر لەنێوان هەردوو زمانی سۆز و عەقڵ دادەنرێت. بۆیە پەخشانە شیعر بە ئاسانی لەبەر ناکرێت، بەڵکو زیاتر بۆ خوێندنەوەی مەعریفی دەنووسرێت و ئەم لایەنە کێشەی کەمتر کاریگەری و بڵاوبوونەوەی لەنێو خوێنەرانی شیعردا بە خۆیەوە دەبینێت.

## تەوەرەی دووەم :
## خەسڵەتەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی

زمانی دەقی شیعری کلاسیکیی کوردی زیاتر مۆرکی ڕەوانبێژی بەسەریەوە زاڵ بــوو لــەڕووی ڕەگــەز دۆزی و لــەف و نەشــر و خواســتن و خــوازە و ئیدیۆمــەوە بەشێوەیەك خوێنەر پێویستی بە جۆرە شارەزاییەکی ڕۆشنبیری هەیە تا لە واتای شاراوەی هەندێ وشەی نێو هۆنراوەکە تێبگات. بۆ نموونە نالی لە بەیتە شیعرێکدا دەڵێت :

**بڕۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین**

**ئەمەندە چینە، قوربان، پێم بڵێ چین** ؟![7]

ئەم جۆرە زیرەکییە نالی لەبواری ڕەگەز دۆزی نواندوویەتی لە بەکارهێنانی وشەی (چین)، هەروەها لە بەکارهێنانی پێچ و پەخش (لەف و نەشر) لەم بەیتەی خوارەوە بەڵگەن گەواهی دەدەن بۆ وەستایی نالی لە گەمەی زمانی نێو دەقە شیعرییەکانی بەشێوەیەك تا ئێستا هیچ هۆنیارێکی دیکە نەیتوانیوە تێپەڕی بکات:

**یا توربەتی یا غوربەتی (باری) بشکێنن**

**هەر مونتەزیرە نالی ئەگەر مرد و ئەگەر ما**

لێرەدا هەردوو وشەی (توربەت و مرد) و (غوربەت و ما) جۆرە پێچ و پەخشن لە ڕێی هەڵبژاردنی هەندێ وشە بە ئەنقەست لە لایەن هۆنیارەوە کراوە. بە ڕاستی نالی باشترین هۆنیارانی کلاسیکی کوردییە توانیویەتی زمانی هۆنراوەکانی بەچەندین وشەی کوردیی پەتی بڕازێنێتەوە و، لە گەمەی زمانی شیعریی خۆیدا بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش بیانمەزرێنێ، بۆیە دەکرێ ئێمەیش بڵێین نالی " وەك پەپوولە و هەنگێك بووە، بەناو گوڵزاری وشەی جوان و ڕەسەنی کوردی کەوتووە و لەهەر گوڵە هەڵاڵەی شیرینی وەرگرتووە و هەنگوینی شیعرەکانی پێ دروست کردووە "[8]. ئەم جۆرە لایەنانە لە زمانی شیعری کلاسیکیمان بەرچاو دەکەوێت بە حوکمی ئەوەی زیاتر بۆ دەرخستنی توانای شیعریی هۆنیار بەکار دەهێنرێت، بەڵام لە شیعری کوردیی نوێ کەمتر لایەنی

شانازی بەرچاو دەکەوێت بەحوکمی ئـەوەی شـیعری نـوێی کـوردی زیـاتر خـاوەن پـەیامی کۆمەلأیـەتی و ڕامیـاریی خۆیـەتی. شـیعری هاوچـەرخیش زیـاتر شـیعری مەعریفییە زمان دەکاتە ئامرازی خۆنواندن.

زمـانی شـیعری نـوێی کـوردی لەسـەر دەسـتی گـۆران و هاوەڵـەکانی زیـاتر ئاسانکاری بـۆ تێگەیشـتنی خوێنـەری دەدا، چـونکە خـودی هۆنراوەکـە خـۆی بـە خاوەن پەیامێك دەزانی بۆ بەرجەستەکردنی کێشەیەکی سەردەمی هۆنراوەکە. بـۆ نموونـە گـۆران لـە هـۆنراوەی (حـوزنی پەچـە) هەوڵـدەدات کێشـەی ئـافرەتێکی چەوساوە و لێقـەوماومان بـۆ بەرجەسـتە بکـات، بۆیـە ئـەم جـۆرە زمانـە سـادە و ساکار و ئاسانەی لەنێو هۆنراوەکەی بەکارهێناوە :

**ژنێکی شۆخ لە چاوی بەڵەك بە مەئیووسی**
**خلی ئەکردەوە هۆن هۆن دڵۆپی مرواری**
**بە ئاو ئەبوو دڵی بەردین لە ئاه و ئەفسووسی،**
**بە ئاوی ساردی پەتی نا، بە مایيعی ناری!**

**وتم: فیدایی جەماڵت بم ئەی پەری شێوە!**
**ئەوا توایەوە هەستم بە سۆزشی گریەت :**
**چییە کە هەیکەلی مەڕمەڕ، غوباری وا پێوە،**
**قەمەر شکات و سکالأ ئەکا لە هەوری خەفەت ؟**

**سەری بە عیشوە لەقان و بە لەهجەیەکی حەزین**
**وتی : بچۆوە بپرسە لە جینسی پیاوی برات،**
**کە کەوتە گۆشەیی گیرفان گوڵێکی ئاوریشمین**
**چییە تەفاوتی بوون و نەبوونی، قیمەتی لات؟**[9]

شـێخ نـووری شـێخ سـاڵحی هۆنیـار و هـاوەڵی گـۆران، بەهـەمان شـێوەی گـۆران زمانێکی سادە و ڕەوانی لە هۆنراوەی (پەچە) بۆ خستنەڕووی کێشەی ئافرەت لـە ڕۆژگاری خۆیدا لەگەڵ پەچە بۆ داپۆشینی ڕوخسار، واتە زمـانی شـیعری کراوەتـە کەرەسەیەك بۆ دەربڕینی بیرورا:

**گوێم لەناڵینی کچێ بوو، دوێنێ ئەیلاوانەوە**
**وا بە تەئسیر و بە سۆز ئەیوت، دڵی ئەتوانەوە**
**دەنگ و ڕەنگی وا نەبیستراوە و نەبینراوە لە کەس**
**کۆنە قەتماغەی برینی ناو دڵی ئەکولانەوە**
**ئەیوت، ئەم ڕووپۆشە تەنیا ڕووی نەپۆشین و بەس**
**ڕووبەڕووی خۆمان، حقوقی نایەنە ناو نسیانەوە**
**قەت نەبوو ڕۆژێ بە سەربەستی حەقێ داوا بکەین**
**بۆ بەشی خۆمان بچینە ساحە و مەیدانەوە**
**ئەوەڵ و ئاخر، خەتای ئەم ڕوو ڕەشەی ڕووپۆشە بوو**
**بوو بە مەنعمان نەچووینە کۆمەڵی پیاوانەوە**
**دایگرن توخوا فڕێی دەن، بیخەنە تەنوورەوە**
**حەیفە ڕۆژی ڕوو، ئەنێنە ناو شەوی دەیجوورەوە**(١٠)

شیعر هەرچەند زمانەکەی ناسکتر بێت و لەگەڵ هەستی ناخەوەی مرۆڤدا بدوێ ئەوەندە زمانی ئەم جۆرە بەرهەمانە دەبێتە خاوەن تایبەتمەندیی خۆی. بۆ نموونە ئەگەر بڕوانینە زمانی ئەم کۆپلە شیعرەی بێسارانی بۆمان دەردەکەوێت چەند زمانەکەی ناسك و کاریگەرە :

**گیانە لە پرخەی خەوی خەومدا**
**پێ بنێ وەبان هەردوو چاومدا**
**مەڵێ برژانگت تیژە وەك چقڵ**
**ئەچەقێتە پێی ناسکتر لە گوڵ**
**من بەو برژانگە بۆیە خۆش حاڵم**
**خاکی بەر پێی تۆی پێ ئەماڵم**

ئەم جۆرە زمانە سادە و ساکار و ئاسانە لە شیعری کوردیی هاوچەرخدا بەهەمان شێوەی جارانی نەما، چونکە شیعری کوردیی هاوچەرخ زیاتر شیعری مەعریفییە، زیاتر تێیدا هۆنیار کۆمەڵێك هێما و ڕەمزی ئەفسانەیی بەکاردەهێنێ. لەم حاڵەتە جۆری زمانەکەش بووەتە خاوەن جۆرە تەمومژییەك و، بەئاسانی لەبەر ناکرێت، باشترین نموونەش هۆنراوەکانی (هاشم سەڕاج و ئەنوەر مەسیفی و

سەباح ڕەنجدەر و جەلال بەرزنجی و دڵشاد عەبدوڵلاَ.. تاد). لە ساڵانی هەشـتاکان و نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا. مەسعوود محەمەد، بیرمەندی گەورەی کـورد لـە سەدەی بیستەهەم، لەبارەی لێڵی و تەمومژیی زمان و واتای نێو شـیعری کـوردیی هاوچەرخ، دەڵێت " هی وایان تێدایە، بێ موبالەغە، کەس تێیان ناگا. تاك تاکەیان تێدایە، هێندە هێمایی و دەروونی و (تجرید) بن لەوانەن بەلای خاوەنەکانیشیانەوە واتاییێکی یەکجارەکی (نهائی)یان نەبێ و بـەپێی گـۆڕانی بـاری نەفسـی و زیهنـی و دەوروبەری خۆیانـەوە (تصـور)یان بـۆ واتـای ئـەو تـاك تاکانـە بگۆڕێـت "[11]. بـۆ نموونە خوێنەری ئەم پارچە شیعرەی هۆنراوەی (دیداری خوداوەندە ناکامەکان)ی سەباح ڕەنجدەر بە ئاسانی لە واتا شاراوەکانی پشت وشە و دێڕەکان تـێ ناگـات، بەڵکو زۆر جار وەك دەوترێت خوێنەرێك لـە دۆڵێـك سـەری تەقـەی دێـت و هۆنیـار مەبەستی دیکەی هەیە :

**زەوی مەیی خانەدانی خواردووەتەوە**

**قسەی دڵم دەزانێ و هەمیشە تاجی بیرکردنەوە و پشوودانیم**

**پیاڵەیەك مەیم لە زەویی خانەدان وەرگرت**

**لە ڕۆژێکی نزیکدا دێت**

**دەستی سێبووری و پڕختووکەی لەسەر دڵم دادەنێ**

**بە ترپەی دەڵێت پشوو بدە ماندووی[12]**

وەك دەزانـین زمـان کەرەسـەیەکی زۆر گرینگـی وێنـە کێشـانی شـیعرییە لـە هـۆنراوەی کلاسـیکی کوردیـدا، چـونکە وێنـە شـیعرییەکە بـە جـۆرە زمـانێکی سەرنجڕاکێش خۆی دەڕازێنێتەوە، تا بە هۆیەوە کاریگەریی خـۆی هـەبێت بەسـەر خوێنەرانیدا. بۆ نموونە نالی بەم جۆرە زمانە شـیعرییە وێنـەی جلوبـەرگ و سـنگی کچە سەرنجڕاکێشەکەیمان بۆ دەکێشێت :

**لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان**

**بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان**

**لە خەوق طەلعەتی ڕۆژ هەروەکو شێت**

**بە ڕوو زەردی هەلاَت و کەوتە کێوان[13]**

ئەم جۆرە بایەخدانە بە زمان لەنێو وێنـەی هـۆنراوەیی هاوچەرخیشـدا بەرچـاو دەکەوێ بەشێوەیەك نەك تەنیا زمانی شیعریی دەبێتە کەرەسەیەکی گرینگی وێنە هۆنراوەییەکە، بەڵکو دەبێتـە جلوبـەرگێکی جـوان بـۆ ڕازاندنـەوەی چوارچـێوەی هۆنراوەکە، بۆ نموونە شێرکۆ بێکەس وەك هۆنیـارێکی ناوبـانگی شـیعری کـوردیی هاوچــەرخ زۆر بــە جــوانی و ســەرنجڕاکێش زمــانی شــیعری دەکاتــە کەرەســەی وێنەکێشانی ئەم حاڵەتە دەروونییەی نێو هۆنراوەکەی :

**ڕائەکشێم**
**پەتوویەك ئەدەم بە شەوما**
**لە پەتوودا وێنەی پڵنگێکی تیایە**
**ئەو درێژ و پڵنگ درێژ**
**تل ئەدەم و ئەویش لەگەڵمدا تل ئەدا**
**لە ژێرەوە سەرنج ئەدەم**
**کەڵبەکانی لەسەر ملمن**
**ترسی خەت خەت لێم ئەنیشێ**
**هەردوو چاوم ئەنووقێنم**
**هەتا خەوم لێ ئەکەوێ**
**((لە دەشتێکدام**
**خۆم ئەبینم بووم بە مامز**
**پڵنگەکە بەدیم ئەکا و دوام ئەکەوێ**
**ڕائەکەم و ڕائەکەم و پڵنگ هەر دێ**
**دێت و دێت و هەتا سێبەرمان تێکەڵ ئەبێ**
**دێت و دێت و لە پشتەوە**
**بستێك ماوە بمگرێ**
**لە پڕێکدا**
**دائەچڵەکم**
**ئارەقێکی سارد دەرئەدەم**
**پەتوو لەسەر خۆم لائەدەم**
**ماڵەوەیە؟!**

**ورد ئەبمەوە**
**پڵنگ لەبەر قاچەکانما**
**تێکشکاوە و گەمۆڵەیە!**

لە شیعری نوێ و پەخشانە شیعردا وشەی شیعری جۆرە بارگاوییێکی واتایی بە خۆیەوە دەبینێت، ئەمەش لەڕێی بەخشینی مۆرکێکی سیمبۆلی و واتایەکی ڕەمزی بە وشە شیعرییەکە، یان لەڕێی دووبارەکردنەوەی وشەکە لە نێو دێڕە شیعرەکە، یان دووبارەکردنەوەی دەستەواژە شیعرییەکە و ڕستە شیعرییەکە لە چەند شوێنێکی ناو هۆنراوەکە. ئەمەش لە پێناو دروستکردنی حاڵەتێکی دەروونی لای خوێنەر و گوێگری هۆنراوەکەیە بە هۆی جەختکردن لەسەر ئەو جۆرە وشە هەڵبژێراوانە کەوا لە ئەنجامدا ڕۆڵی کاریگەریی خۆیان هەیە لە بەخشینی جۆرە واتایەك بە دەقە شیعرییەکە لەنێو زمانی شیعریدا. هۆنیار هەندێ وشە بۆ هەندێ ئەرکی واتایی هەڵدەبژێرێت، بۆ نموونە لە زمانی شیعریدا هەندێ وشە وەك (ئاسا، چۆن، وەك، وەکو، میسل، مانەند ) بە ئەرکی لێچواندن هەڵدەستێت، چونکە ئەم جۆرە وشانە بە ئەوزاری لێچواندن لەنێو ڕەوانبێژی کوردیدا هەڵدەستن و، ئەم جۆرە وشانە دەبنە مایەی دروستکردنی وێنەی لێکچواندن لەنێو بابەتی شیعریدا. هەرچەندە لە زمانی شیعری کلاسیکیدا ئەم جۆرە دیاردەیە بەدی دەکرێت، بەڵام هۆنیاری هاوچەرخیش پێویستی بە مەزراندنی وێنەی لێکچواندن هەیە بۆ ئەوەی داهێنان و توانای شیعریی خۆی بخاتە ڕوو، لەگەڵ هەوڵدانی بۆ بەخشینی جۆرە چێژێکی شیعری بە هۆنراوەکەی.

زمانی شیعری کوردیی هاوچەرخی ئەو چەند ساڵەی سەرەتای سەدەی بیست و یەك زیاتر چڕ کراوەتەوە، بەشێوەیەك هۆنیار ژمارەیەکی کەم لە وشە هەڵدەبژێرێت بۆ بینای ساختمانی واتای هۆنراوەکە و وێنە هۆنراوەییەکەی، کەوا لە ڕووی زاراوەی ڕەخنەییەوە پێی دەوترێت پۆستەرە شیعر. ئەم جۆرە پۆستەرە شیعرەی لای خۆمان جیاوازە لە شیعری وێنەیی ئیزرا پاوەند و هاوەڵەکانی لە قوتابخانەی وێناکاری لە شیعری ئینگلیزیی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، هەروەها جیاوازە لە شیعری هایکۆی ژاپۆنیی پاش جەنگی دووەمی جیهانی. لێرەدا ئێمەیش وەك د. ئازاد ئەحمەد مەحموود دەڵێین " قەسیدە تا

کورتتر و خەستتر بێت، زمانی شیعری بۆ دۆزینەوەی چەقی واتا و ئاشکرابوون بیَ ئـەرکتر دەبێـت. تێکسـتی شـیعری کـورت لـە بەراییـدا، ماوەیـەکی سـنووردار بـۆ چـالاکیی خـۆی دەستنیشـان دەکـات، پـاش لـەدایکبوونی لـە ئاقـارێکی بچـووك و تایبەتدا، زمانی شیعر دەلالەت و ئێستێتیکای خۆی ئاشکرا دەکات "[١٤].

سامی شۆڕش، عەبدوڵلا پەشێو و قوبادی جەلیزادە و تا ڕادەیـەك شـێرکۆ بێکـەس باشـترین هۆنیـارانی پۆسـتەرە شـیعری کـوردیی هاوچـەرخن. بـۆ نموونـە قوبادی جەلیزادە لە هۆنراوەی (مەمك) دەڵێت :

**ئێستە مەمکت..**
**دوو پشیلەی خڕیماڵین.**
**هەتا زیتر،**
**دەستیان بەسەر سەرا بێنم**
**پتر چاوی حەز لێك دەنێن.**
**کەچی دوێنیَ،**
**دووبارە کەوی کێوی بوون**
**هەتا شاباڵیم هەڵکشان**
**سەد دەنووکیان دا لە دەستم !![١٥]**

هۆنیار لەم پۆستەرە شیعرەیدا زۆر بە جوانی بەو چـەند وشـەیە مەبەسـتی پێکـاوە و، وێنەیـەکی هـۆنراوەیی سەرنجڕاکێشـی پێشـکێش کـردووە، بـەلاَم لـە هۆنراوەیەکی دیکەدا بەناونیشانی (زبلَ) بـەو چـەند وشـەیە نـەیتوانیوە وێنەیـەکی هۆنراوەیی سەرنجڕاکێشی پێشکێش نەکردووە :

**زبلَ... زبلَ**
**دەستەکانم ترسنۆکن،**
**هەردوو دەستی خۆی بڕییەوە و**
**نایە هەگبەی زبلَ ڕێژێك![١٦]**

شیعری تـاك دێـڕی (سـەباح ڕەنجـدەر) هێناویەتـە نـاو شـیعری کـوردی و بەکاری هێناوە. بڕوانە ئەم شیعرە تاك دێرییـە لـە گۆڤـاری کـاروان، ژمـارە (٨)ی ساڵی ١٩٩٣، (**تەرمێك لەسەر شۆستە پاکـەت دەفرۆشـیَ**). بـەلاَم (عـەباس عەبـدوڵلا یووسف) زیاتر کاری لەسەر ئەو داهێنان و بنەڕەتەی (سـەباح ڕەنجـدەر) کـردووە

وەك شێوە و شێوازێك پەرەی پێدا و ناساندی. عەباس عەبدوڵڵا یووسف، وەك هۆنیارێکی خاوەن ئەزموونێکی باشی نوێخوازی لە شیعری کوردیدا، دەیەوێ لەڕێی چەند وشەیەکی نێو تاك دێڕە شیعرییەکانی، وەك شێوازێکی نوێی دارشتنی شیعری کوردیی هاوچەرخ، واتای هۆنراوەیەکی تەواو بەکۆڵ بەسەر هۆنراوە تاك دێڕەکانی بدات، بێ ڕەچاوکردنی توانای دیارکراوی وشە بۆ بەخشینی واتای فەرهەنگی. واتە کەمیی ژمارەی وشەکانی نێو هۆنراوە تاك دێڕەکانی زۆر جار بووەتە بارگرانی بەسەر زمانی ئەم جۆرە هۆنراوانە، بەمەش ئەم جۆرە هۆنراوە تاك دێڕانە زیاتر لە قسەی نەستەق نزیك دەبنەوە و، لەوە دوور دەکەونەوە بتوانن بە چەند دێڕ و بەیتێك هەستی ناسکی ناخەوەی مرۆڤمان بۆ بەرجەستە بکەن، تەنانەت زمانی شیعریی ئەم جۆرە هۆنراوە تاك دێڕانە لە خەسڵەت و ئەرکی ڕاستەقینەی خۆیان بێ ناز ماونەتەوە، بۆ نموونە:

- **کامیان بخەمە نێو کەوانەوە، ئێرە یا ئەوێ یان ئێرەوێ.**
- **چاوم شازارە، وێنە خۆرێکی بێهاوتایە.**
- **نووسایکۆیە، بنهۆشی بنهۆشە و ناخەکەشی ئەتلانتسە.**
- **شاعیر بم دەنووسم، پەپوولە لە ئەژدیهایە، داروینیش بم دەنووسم : لە گوڵە.**
- **لە گرژگە ڕایکرد، دوور دوور بوو، بە تیشکە دەنگ گرژتر کرا.**
- **ماسییە... لە کلکەوە بە قولاب بگیرێ، تریتۆنە !**

ئەوەی لێرەدا شایانی وتنە، هەندێ لەم جۆرە هۆنراوانەی لە سنووری تاك دێڕی دەردەچن و دەبنە دوو دێڕ، وەك لەم نموونانەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت :

- **قرقراگەی سەت مرۆڤ لێکبەستی دەبێتە پیرە عەنتەرناشێك و ترەتر تێماندەگەینێ هەر خۆی پەیکەری پەیکەرانە.. هەرخۆی دەنگی دەنگانە !**
- **پۆستکۆلۆنیالیزمە، لە مێژە ئافرەتێکی شەبقە لەسەر شۆرتلەبەر هات و نوشتەکانی داپیرمی برد، بڵێ ئەمرۆ بمداتەوە ؟**

- **كە پێیحەسا بەسەر لەشیدا، لە شوونی قەمچیی نچچە و خامۆشـی رلكـە دەگەڕێم، لۆ سالۆمی هستریانە ڤیژاندی: دەرچە...هەی ملۆزمەی مێملـی سەر جەستە!!!** (١٧)

هــەروەها هاشـم سـەڕاجیش لـەڕێی شـیعری نـانۆ دەیـەوێت بـاری زمـانی شـیعرەكانی گـرانتر بكـات بەشـێوەیەك چـەند وشـەیەكی زۆر كـەم ژمارەیـان لـە ژمارەی پەنجەكانی دەست تێناپەڕن ببێتە باشترین كەرەسە بۆ دەربڕینی هەنـدێ بۆچوونی كـورتی خـۆی، بەشـێوەیەك ئـەم جـۆرە هۆنراوەیـە نـە لەسـەر شـێوازی هۆنیارانی قوتابخانەی وێنەیی نێو شـیعری ئینگلیزیـدا دارِشـتێنراوە، كـە هـۆنراوە بریتی دەبێت لە (١٤) وشە وەك لە شیعرەكانی ئیزرا پاوەند و هاوەڵەكانی بەرچاو دەكـەوێت. هــەروەها هــۆنراوەی (نــانۆ)ی هاشــم ســەڕاج لــە دارِشــتنی شــیعری (هایكۆ)ی ژاپۆنیش ناكات.

شیعری هایكۆ " نـەریتی ژاپۆنییـە حەڤـدە بڕگـەی هەیـە، كـە لـە سـێ دێـڕی (٥،٥،٧) بڕگـــەیی دەنووســـرێت، شـــیعرە هایكۆییــــەكان كـــورت و زۆر ڕوون و درەوشاوەن. هایكۆ بریتییە لە وێناكردنی تـەواو و كـەماڵی سـاتە ئەزموونییـەكانی شاعیر. لە تایبەتمەندییەكانی تری هایكۆ، زمانی سـاكار و بـێ پـێچ و پـەنا وەرز و واژەیە، كە باس لە یەكێ لە وەرزەكانی ساڵ دەكات. هایكۆ پێشتر ناوی (هۆككو) بووە و، هایكۆ نە كێشی هەیە و نە سەروا، هەروەها جوانكارییە كەلامییەكان تێیدا بە دەگمەن بەكار دێن، دەوروبەری دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر، هایكۆ بەشـێك بـووە لە فۆرمێكی شـیعریی (٣١) بڕگـەیی بـە نـاوی (تانكـا)، كـە شـاعیران بـە شـێوازی پرسـیار و وەڵام دەیانهۆنییـەوە و بەشـی یەكـەمی تانكـا حەڤـدە بڕگـەی هەیـە و بەشی دووەم چواردە بڕگە. هایكۆ دەبێت شایەرانە بێت و ساكار و دژوار، ژیـری و ناژیری تێیدا بێت و، سەراپای هایكۆیەك دەبێت بە یەك نەفس بخوێنرێتەوە و، زۆر جار هەر سێ دێڕەكەی هایكۆ ڕستەیەكی تەواو ساز ناكات، بۆ نموونە :

**١- گوڵە سپییەكان**

**أ-لە كەلێنی دیوارەوە**

**ب- بەهار دێ**

**٢- زەربەكانی تەور**

ج–بۆنی شووڵی کاج،

د– سووتەمەنی زستان[18]

هەرچۆنێك بێت زمانی شیعریی هۆنراوەی (نانۆ)ی هاشم سەراج زیاتر و زۆرتر بە ئەرکی وەسف هەڵدەستن بۆ پەیاموەرگرەکانی نەك بە ئەرکی بەرجەستەکردنی هەست و سۆز و هێزی ناخەوەی پەیاموەرگرەکانی، واتە لە بارگاویی واتای فەرهەنگی و واتاسازی بێ بەش دەبێت، بۆ نموونە :

١– شێوەت

لە وێنەی هەورەکان دەکا

٢– نیڤیا

لیکی دەمی تیمساحە

٣– زمان

کەرەستەی ختووکەدانە

٤– مەرگ

درزی نێو بوون

پڕ دەکاتەوە

٥– کونجی

پیتی هەڵڕژاوی دەفتەری نانە[19]

ئەگەر ئەم جۆرە دێڕانەی هۆنراوەی (نانۆ) بەشێوەی ئاسایی بنووسینەوە، ئەوسا بە هەمان شێوەی هۆنراوەی تاك دێڕی لێدێتەوە، لێرەدا بۆمان هەیە بڵێین هەندێ لێکچوون هەیە لەنێوان هەردوو جۆری شیعری هایکۆ و نانۆ لە ڕووی کەمیی ژمارەی وشەکان و، نەبوونی کێش و سەروا و هەبوونی سێ دێڕ هەندێ جار لە شیعری نانۆدا، بەڵام لە چەند لایەکی دیکەوە جیاوازن، وەکو نەبوونی حەڤدە بڕگە لە شیعری نانۆ و، باس نەکردنی وەرزەکان لە شیعری نانۆدا و، هەبوونی فۆرمی ڕستە لە شیعری نانۆدا.

بەمەش ئەم دوو هۆنیارە لە هەوڵی بێوچانن بۆ لەدایکبوونی هەندێ خەسڵەتی تازەی زمانی شیعری کوردیی هاوچەرخ، لێرەدا پێویستە بڵێین ئەم دیاردە تازەیە نەیتوانیوە لەنێو هۆنیارانی کوردی هاوچەرخ تەشەنە بکات.

هەندێ جار وشەی نێو زمانی هۆنراوەی هاوچەرخی کوردی خاوەن واتای ڕوونی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام هۆنیار بەئەنقەست بەشێوەیەکی ئاڵۆز واتای وشەکانی نێو هۆنراوەکەی دەچنێ، لە ئەنجامدا خوێنەر سەری لێ دەشێوێت بە ئاسانی لە واتای گشتیی هۆنراوەکە تێناگات. بۆ نموونە ئەنوەر مەسیفی گەمەی ئاڵۆزکردنی واتای وشەکانی نێو هۆنراوەی (کافر شا) بە شێوەیەك کردووە ڕوونیی واتای هەندێ وشەی وەك (قەمبوور) و (تەمبوور) لەنێو هۆنراوەکە بزر دەبێت :

**قەبرە قەمبوورەکانی لەشکری**
**قەمبوورم بە تەمبوور دا**
**لە پاشان تەمبوورم**
**بۆ ئەو پەیکەرانەی**
**ژنیان لەناو بادەدا لێ دا**
**قەبرە قەمبوورەکانی**
**لەشکری قەمبوورم**
**بە تەمبوور دا**
**لە پاشان تەمبوورم**
**بۆ کافرشا لێ دا**
**گۆرانیبێژەکانی کافرشا**
**قەبرە قەمبوورەکانی لەشکری قەمبووریان**
**لە گا نا**
**لە گای ناو**
**ئەو پەیکەرانەی**
**ژنیان لەناو بادەدا**(٢٠)

ئەم جۆرە گەمە زمانییە جۆرە لادانێکە لە یاساکانی فەرهەنگسازی، لادانی زمانیش نەك تەنیا لە بواری واتاسازی و فەرهەنگسازیدایە، بگرە لە بواری ڕستەسازیش لەنێو هۆنراوەی کوردیی هاوچەرخ بەرچاومان دەکەوێت، بۆ نموونە لە بینای ئاسایی رستەی زمانی کوردیدا بکەر دەکەوێتە سەرەتای ڕستەکەوە، بەڵام لە هەندێ ڕستەی شیعریدا کار کەوتووەتە سەرەتای ڕستە و بکەر کەوتووەتە کۆتایی ڕستەکەوە. هەروەها هەندێ هۆنیار لە بواری لادانی شیعری لە

بەکارهێنانی وشەی نوێباو دەستڕەنگینیی خۆیان نواندووە، بۆ نموونە بورهان ئەحمەد لە هۆنراوەی (من بە خەزان شارەزام، بە گریان عاریفەم) هەندێ وشەی کردووەتە هاوشان وەکو (چاوی دیوار) و (قومی ڕەنگ) و (ڕیشی فلْچەکان) :

**کانزاکان قەوارەیەکم پێ نابەخشن ڕووی بەردێك بریندار بکەم**
**چاوی دیوارێك هەڵبکۆڵم**
**بەر لەوەی بگەمە بەر ئاوێنەی ڕەنگەکان**
**ڕیشی ویقاری فلْچەکان سووتاو بوون**
**کاکۆڵی زەردیان کاڵ ببوونەوە، سمێڵی ڕەشیان با بردبوونی**
**پێش ئەوەی قەڵەم و سومبەی تاشین**
**لە گیرفان پاڵتووی پەیکەرێکی دێریندا بدۆزمەوە**
**بەر لەوەی دەست بەرم بۆ قومێك ڕەنگ**
**پەیکەرەکان تاشرابوون، تابلۆکان تێر ببوون**[٢١]

بەم شێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە لادانی واتای زمانی یەکێکە لە خەسڵەتە بەرچاوەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی، چونکە " لادانی واتایی شکاندنی یاساکانی دیوی ناوەوەی زمانن، پێوەندییەکی پتەویان بە گۆڕینی مەبەست و واتا و تێگەیشتنەوە هەیە، واتا نەك هەر واتای سەردەم دەگۆڕن بگرە دەبنە بار و ئەرك بۆ گوێگریش "[٢٢].

ئەوانەی بە لایانەوە پێناسەی (ئەدەب زمانە) بۆچوونیان ڕاست و دروستە، چونکە دەقنووس لەڕێی جۆرە زمانێکەوە بە پرۆسەی داڕشتنی دەقەکەی هەڵدەستێ. زمانی ئەدەب – بە تایبەتی زمانی شیعر – بە زمانی باڵا ( meta language) دادەنرێت[٢٣]، چونکە جۆرە زمانێکی ستاندەر و دانسقەیە جیاوازە لە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵکی (speak)، کەوا دیاردەی شێوەزارەکانی پێوە دیارە. لێرەدا پێویستە بووترێت هۆنیار خاوەن پەیامی خۆیەتی و دەیەوێت لەڕێی چەندین وشە و دەستەواژە و ڕستەی زمانی هەڵبژێرراوی خاوەن واتای کاریگەر ڕۆڵی کاریگەریی خۆی بنوێنێ بەسەر بیر و هەستی خوێنەرانی دەقەکەیدا، تەنانەت لەم بوارەدا ڕۆڵی زمان لەبەرچاوە لە بەخشینی نەمری بە دەقە ئەدەبییەکە و نووسەرەکەی، واتە زمانی باڵای شیعر یەکێکە لە خەسڵەتەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی. هۆنیار، وەك ڕۆشنبیرێکی پایە بەرز، پەنا دەباتە بەر

زمانی یەکگرتووی میللەتەکەی نەك شێوازی ناوچەکەی بۆ سوود وەرگرتن لە ڕۆڵی زمان بەسەر ژمارەیەکی زۆری خوێنەراندا. کاتێك کە دەڵێین شیعر یان ئەدەب زمانە، مەبەستمان لایەنی دەربڕینی ئەدەبییە، چونکە زمان کەرەسەیەکی سەرەکیی پەیامی دەربڕینە بۆ خستنەڕووی بیر و بۆچوونەکانی هۆنیار. ئەم لایەنەی دەربڕین بەهای خۆی هەیە، چونکە نووسەر دەیەوێت لەڕێی جۆرە دەربڕینێکی جوان و سەرنجڕاکێشەوە کاریگەرییەك بە دەقە ئەدەبییەکەی ببەخشێت، واتە ئەرکی دەربڕینی جوان و کاریگەر یەکێکە لە خەسڵەتەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی.

کەواتە هۆنیار مرۆڤێکە لەنێو ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی دەژیێ، هەمان شێوەزاری ئەوان لە ژیانی ڕۆژانەی خۆی بەکاردەهێنێ، بەڵام بۆ نووسین و داڕشتنی هۆنراوەکانی پەنا دەباتە بەر زمانێکی یەکگرتووی ستاندەر بۆ فرەوانکردنی بازنەی تێگەیشتنی خوێنەرانی نەتەوەکەی بۆ دەقی شیعرەکانی. هەروەها زمانێکی شیعریی باڵا بەکاردەهێنێ بۆ زیادکردنی کاریگەریی زمانی شیعرەکانی لە هزر و بیری خوێنەرانی. بۆیە دەکرێ بڵێین " جیاوازییەکی ڕیشەیی لەنێوان زمانی قسەکردنی ڕۆژانە و زمانی دەقە شیعرییەکاندا هەیە، ئەم جیاوازییە لەو ئەرك و کاتەدا دەردەکەوێ کە شاعیرێك پێویستییەتی تا شیعرەکەی بەرهەم دێنێ، لە کاتێکدا قسەکەری ئاسایی هیچ پێویستی بە ئەرك و کات نییە بۆ ڕێکخستنی قسەکانی و بەبێ هەڵوەستەکردن هەرچی بیەوێ دەیڵێ "[(٢٤)].

زمانی دەقی شیعری کوردیی هاوچەرخ هەندێ لایەنی لادانی زمانەوانی تێدا هەیە لە ڕووی بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگیی تازە و واتادار و کاریگەر، هەروەها بەکارهێنانی دەستەواژەی خاوەن ئیدیۆمی تایبەت و پەنابردنە بەر بەکارهێنانی ڕستەی شیعریی زۆر کورت یان زۆر درێژی سەرنجڕاکێشی پڕ لە ئەندێشەی هونەری، بە پێچەوانەی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵکی کەوا پڕە لە وشەی سادە و دەستەواژە و ڕستەی خاوەن واتای ڕاستەوخۆ، چونکە " لادانی واتایی شکاندنی یاساکانی دیوی ناوەوەی زمانن، پێوەندییەکی پتەویان بە گۆڕینی مەبەست و واتا و تێگەیشتنەوە هەیە، واتا نەك هەر واتای سەردەم دەگۆڕن بگرە دەبنە بار و

ئەرك بۆ گوێگریش "[٢٥]. واتە لادانی شیعریش یەكێكە لـە خەسـڵەتەكانی شـیعری هاوچەرخی كوردی، بۆ نموونە ئەنوەر مەسیفی بە ناوبانگترین هۆنیاری هاوچەرخە لە بواری لادانی شیعریدا، بۆ نموونە لە هۆنراوەی (شا لالش) نـە خاڵبەنـدی هەیـە، نـە دێـر و ڕسـتە شـیعرییەكان بەشـێوەیەكی ئاسـایی نووسـراون، نـە وشـەكانی بەشێوەی ئاسایی نووسراون :

فۆرمە كافرەكانی
لەشكری عەبا
شەرابم دا
ئەسپە سفر
خۆرەكانی
ژنێكی ئۆپێرا
شا
لا
لش
شا
گۆسكەكانی لە ئەسپە
سفر خۆرەكانی
لەشكری عەبا
شەراب نا
ژنێكی ئۆپێرا
فۆرمە كافرەكانی
هاویشتە گۆسكەكانی
شا لالش شا

ئەم جۆرە گەمـە زمانییـە لـە زۆربـەی هۆنراوەكـانی ئـەم هۆنیـارە بەرچـاو دەكەوێت وەك شەقڵێكی تایبەتی شێوازی هۆنراوەكانی، واتە لەتكردنی بڕگـەكانی هەنـدێ لـە وشـەی نێـو هۆنراوەكـانی و، تـەواو نـەكردنی دێـڕە شـیعرەكانی و، دیارنەبوونی سنووری ڕستەی شیعریی نێو هۆنراوەكانی و، لێڵی و تەمومژیی واتای هەندێ لە وشەكانی، ئەمانە سیمای سەرەكیی داڕشـتنی زمـانی نێـو هۆنراوەكـانی

ئەنوەر مەسیفییە، كەوا زۆربەی خوێنەرانی لەبەر ئەم جۆرە زمانە و تێنەگەیشتن لە ناوەرۆكی هۆنراوەكانی زووتر نابنە لایەنگری هۆنراوەكانی. ئەم جۆرە گەمەیە لە بواری زمانی شیعریدا لای (سەباح ڕەنجدەر) دوو ئاراستەی دیكەی هەیە : یەكەمیان گەمەی دووبارە كاری لە زمانی هۆنراوەكە بە شێوەیەكی ئەستوونی تا بەهۆیەوە جۆرە كاریگەرییەكی دەروونی بە وشە و دەستەواژە دووبارەكراوەكە بدات، وەك لەم نموونەی خوارەوە دەردەكەوێ :

**باز لە گەرمایی ئاگری پیس نەبوو فامی كرد بۆنی ڕیایی لە دەنووكی سڕی**
**پڕ لە سۆز بەتەواوی ڕازەكانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**كتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕ لە بێگەرد بەتەواوی ڕازەكانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**كتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕە لە بەندە ناس بەتەواوی ڕازەكانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**كتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕ لە جەربەزە بەتەواوی ڕازەكانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**كتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**منداڵی بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**چارەنووس بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**شكۆ بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**(٢٦)

دووەمیان لە ئاقارێكی تازەی شیعری كوردیی هاوچەرخدا هەموو فەرهەنگی هۆنراوەكە بریتییە لە تەنیا بەكارهێنانی وشەی (بۆ) بۆ (١٠٠) جار :

بۆ
بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ
بۆ [(٢٧)]

هۆنیار دەبێ جۆرە زمانێکی پاراو لەنێو دەربڕینی دەقە شیعرییەکەیدا بەکار بهێنێ، هەروەها دەبێ جۆرە زمانێکی ڕازێنراو بەکاربهێنێ بۆ بەخشینی کاریگەری بە پەیامی دەقە ئەدەبییەکەیدا. پ. د. محەمەد مەعرووف فەتاح لەبارەی تایبەتیی زمانی شیعرەوە دەڵێت : " بەپێچەوانەی زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە زمانی چیرۆك و زمانی زانستەکان، زمانی شیعر دیاردەیەکی تەواو ئاڵۆزە، چونکە نە کات (مێژوو)، نە شوێن (جوگرافیا) نە ڕێزمان، نە یاساکانی واتاسازی، نە ڕێنووس سنووری بۆ ناکێشن و لە دەستەڵاتی کەم ناکەنەوە "[(٢٨)]. هۆنیار وەك مرۆڤێکی خاوەن هەستێکی ناسك لەنێو کۆمەڵەکەیدا، هەروەها وەك کەسێکی داهێنەری خاوەن جۆرە توانایەکی باش لە داڕشتنی هۆنراوەکەی، دەبێ توانا و شارەزایی هەبێ لە هەڵبژاردنی ئەو وشانەی لەنێو زمانی باڵای هۆنراوەکەی بەکاری دەهێنێت. کەواتە لەنێوان هۆنیار و مرۆڤی ئاسایی نێو کۆمەڵەکەی جیاوازی هەیە لەڕووی بەکارهێنانی زمانەوە" ئەگەر مرۆڤی ئاسایی تەنیا توانای ڕەسەنایەتی تێدابێ، ئەوا شاعیر دوو توانای دراوەتێ: توانای ڕەسەنایەتی کە توانایەکە لە هەموو ئاخێوەرێکدا هەیە و لە پیادەکردنی تەواوی یاساکانی زمانەکەوە دێ، توانای داهێنان کە بەزۆری لە شاعیردا هەیە لە بەزاندنی یاساکانی زمانەوە دێ"[(٢٩)].

دەکرێ بڵێین ئەنوەر مەسیفی، کەوا خۆی بە نەوەی هەفتاکانی شیعری کوردی دادەنێت، بەناوبانگترین هۆنیارانی کوردە لەبواری گەمەی زمانی شیعری و، لەبواری لادان لە زمانی شیعری خاوەن داهێنانی تایبەتیی خۆیەتی. بۆ نموونە، جگە لەوەی بە هیچ شێوەیەك خاڵبەندی لەنێو هۆنراوەکانی بەکار ناهێنێت کەوا گرینگیی خۆی هەیە لەبواری ڕستەی شیعریدا. دەستێکی باڵای هەیە لە دەستکاری واتای شیعری لەڕووی فەرهەنگی و وشەسازییەوە. بۆ نموونە لەنێو هۆنراوەکانیدا چەندین وشەی تازە و نوێباوی هێناوەتە جیهانی هۆنراوەکانییەوە، لەوانەیە هەندێ لەم وشانە کەسانی گوندەکەی خۆی یان خەڵکی ناوچەکەی بەکاری بهێنن، بەڵام پێشتر لەنێو شیعری کوردیدا بەرچاومان ناکەوێت. بۆ نموونە وشەی لێکدراوی (خۆر باران)، کە ناونیشانی هۆنراوەیەکیتی لەنێو یەکەم کۆشیعری ئەم هۆنیارە بەهەمان ناونیشان لە ساڵی ١٩٧٨ چاپی کردووە، لە شێوەزاری هەولێریدا بە واتای (خۆڵ باران) دێت کاتێك با و تۆزێکی زۆر هەڵبکات و پاشتر بنیشێتەوە دروست دەبێت، بەڵام لە فەرهەنگۆکی (جارێکی تر خۆر باران)، کەوا ناونیشانی دووەم کۆشیعریەتی لە ساڵی ١٩٨٤ چاپی کردووە، واتای خۆرباران بەم شێوەیە لێکدەداتەوە " خۆر باران دوو واتای هەیە :

١- خۆڵ باران

٢- بەهاران جاروبار لەو کاتەی کە بەشێکی زۆری ئاسمان هەور دای دەگرێ تەنیا شوێنێك نەبێ لەوێش ڕۆژ ستوونی دێتە خوارێ. من ئەو شوێنەم مەبەستە".

هەروەها وشەیەکی وەك (غەرە) کەوا بەلای خەڵکی کاتێك دەڵێن (ناوچاوانی غەرە) واتای (خراپ یان نابڕە)، کەچی ئەنوەر مەسیفی بەواتای (مەرقەد، گۆڕی پیاو چاکان، کەڵەکە بەرد) بەکاری دەهێنێ.

لە بواری ئەدەبدا دوو جۆری ئەدەبی سەرزاری و نووسراو هەیە، ئەدەبی سەرزاری واتە ئەدەبی فۆلکلۆری کەوا زۆر نزیکترە لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکی، بەڵام زمانی ئەدەبی نووسراو ئەگەر خاوەن فۆرمێکی هونەری بوو ئەوسا زمانەکەی جیاواز دەبێت لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکی، جیاوازییەکەش لە ڕووی بەکارهێنانی شێوازەکانە، هەروەها لەڕووی گەڕانە بەدوای وشەی فەرهەنگی و ڕەوانبێژی کەوا دەبێتە لایەنێکی گرینگ لە جۆری زمانی نێو ئەم جۆرە بەرهەمە

ئەدەبییانە. لێرەدا هەرچەند زمانی بەرهەمە ئەدەبییەکە ناسکتر بێت و لەگەڵ هەستی ناخەوەی مرۆڤدا بدوێ – وەك شیعر – ئەوسا زمانی ئەم جۆرە بەرهەمانە دەبێتە خاوەن تایبەتمەندیی خۆی. بۆ نموونە ئەگەر بڕوانینە ئەم دوو کۆپلە هۆنراوەی گۆران دەرك بەوە دەکەین چەند زمانەکەی سەرنجڕاکێش و ناسکە و بە ئاسانی لەبەر دەکرێت :

**لەژێر ئاسمانی شینا،**
**لەپاڵ لووتکەی بەفرینا،**
**کوردستان گەڕام،**
**دۆڵاو دۆڵ پێوام،**
**نە لە شار و نە لە دێ،**
**نەمدی کەس**
**وەك تۆ جوان بێ !**
**تۆیت و بەس(٣٠)**

هەروەها گۆران لە هۆنراوەی (لە درزی پەچەوە) هەمان شێوازی لە بینای زمانەکەی بەکارهێناوە بە شێوەیەك خوێنەر و گوێگرەکەی هەست دەکات گۆران جلوبەرگێکی جوانی وەبەر ئەم جۆرە وشانەی کردووە بۆ وێنەکێشانی تابلۆیەکی تایبەتی ژیانی خۆی لە حاڵەتێکی تایبەت و ناسکدا :

**جادە چۆڵ و سێبەر بوو، کاتی بەیانی،**
**ئەڕۆیشتم خەیاڵاوی ئەمڕوانی :**
**بۆ سەوزایی دەوروپشتم، بۆ ئاسمان،**
**بۆ شاخی بەرز، خانووی تازە، دنیای جوان..**

لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین زمانی پەخشان زمانی لۆجیك و ئەقڵە زیاتر لەنێو دەستووری زمانی نەتەوەکە پێڕەو دەکرێت، بەلاَم زمانی شیعر زمانی هەست و سۆزە هۆنیار هەندێ جار لەم دەستوورە دەردەچێت لە حاڵەتی سازدانی کێش و سەروای هۆنراوەکە، ئەمەش لە ڕووی پێش و پاش خستنی بەشەکانی ڕستە (بکەر و بەرکار و کردار) بۆیە لە زمانی عەرەبیدا دەوترێ (یجوز للشاعر ما لا یجوز لغیره – بۆ هۆنیار هەیە ئەوەی بۆ کەسانی دیکە نییە).

زمان ناسنامەیەکی نەتەوەییە و ئەدەبیش بەرهەمێکی سەرخانی زمانی نەتەوەیە پێویستی بەم جۆرە زمانە هەیە، هەروەها زمان ئامرازی ئەدیبە بۆ دەربڕینی بیر و بۆچوونەکانی لەنێو پەیامی بەرهەمەکەیدا، زمانیش دەبێتە جلوبەرگ و قاوغێك بۆ بیری نێو پەیامی دەقەکە. واتە زمان بۆ ڕازاندنەوەی بیرەکە دەبێتە جلوبەرگێکی قەشەنگ بۆ ئارایشکردنی بیرەکە و بەخشینی لایەنێکی جوانیو ئێستێتاتیکی بە دەقەکە. زمان وەك بەشێکی شێوەی (Form) دەقی ئەدەبی کاریگەرترین لایەنە بۆ بەخشینی جوانی بە شێوازی هونەریی دەقنووسە ئەدەبییەکە. زمان بەهۆی دەوڵەمەندی لە بواری وشەی واتادار و دەلالەتەکانییەوە بووەتە یەکێك لە لایەنە گرینگەکانی شێوە و شێوازی هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی، هەر ئەم لایەنەش وەها لە ئەدەب دەکات بەشێوەیەکی گشتی ببێتە خاوەن سیمایەکی هیمایی.

توانای داهێنانی هۆنیار لە بواری زماندا لەوە دەردەکەوێ وشەیەك بەکاربهێنێ بتوانێ زیاتر لە واتا و دەلالەتێك ببەخشێ لەڕووی ڕەگەزدۆزی شوێنی دیاری هەبێ، هەروەها هۆنیار توانای ئەوەی هەبێ دوو وشەی دژ یەك لەنێو وێنە هۆنراوەییەکەی بۆ خزمەتی بیر و ئامانجی سەرەکی هۆنراوەکە و وێنە بابەتییەکەی کۆبکاتەوە. کەواتە پێویستە هۆنیار لە ڕوانگەی تەقلیدی و لاساییکردنەوە دوور بکەوێتەوە لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ زمانی هۆنراوەیی کە بەهونەری وشەیی دادەنرێت.

زمانی نێو وێنەی بابەتیی بەهۆی لایەنە پێکهێنەرەکانی وەك وشە و فرێز و ڕستەکانەوە ڕۆڵێکی واتاداری و دەلالی دەنوێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەم بایەخدانە بە پیتە پێکهێنەرەکانی وشە هەڵبژێراوەکان لەڕووی فۆنەتیکی و دەروونییەوە، هەروەها بایەخدانی هۆنیار بە وشە و فرێز و ڕستە پێکهێنەرەکانی زمانی وێنە هۆنراوەییەکانی لەنێو زمانی گشتی وێنە بابەتییەکە قەت وەها لە زمان ناکات ببێتە ڕازاندنەوەیەکی نەقشکاری.

بیرکردنەوە ڕووی ناوەوەی وێنەی بیر و چەمکەکەیەتی، بەڵام نووسین ڕووی دەرەوەی وێنەی بیر و چەمکەکەیەتی و، لە هەردوو ڕووەکەوە جۆرە زمانێك بۆ دەربڕینی بیرەکە بەکاردەهێنرێت پێویستە توانای کارکردنی لە جۆری

بیرکردنەوەی پەیامەوەرگرەکە هەبێ لەڕێی هەڵبـژاردنی چەندین وشـەی واتـاداری کاریگەر، کە جیـاواز بـێ لـەزمانی ئاخـاوتنی (Speak ) ڕۆژانـەی خـەڵکی. کەواتـە زمانی نووسین باڵاتر و کاریگەرتر و نەمرترە لە زمانی ئاخاوتن.

واتە زمان لەنێو هـۆنراوەدا پێویسـتە وەك ئامرازێـك نـەك ئامـانج مامەڵـەی لەگەڵدا بکرێ، چونکە زمان ئەگەر بووە ئامـانجی هۆنراوەکـە ئەوسـا هۆنراوەکـە و وێنە بابەتییەکەی دەبێتە قاوغێکی زمانـەوانیی بـارگران بەسـەر پـەیامەوەرگرەوە، بۆیە ڕێبازی بونیادگـەری – Structuralism نـەیتوانیوە هۆنیـار و چـیرۆکنووس و شانۆنامەنووس دروسـت بکـات، بـەڵام توانیویـەتی چـەند لێکۆڵـەرێك لـەم بـوارەدا دروست بکات بـەدوای چـۆنێتی ڕیزکردنـی فۆنیمـەکانی هـەر مۆرفیمێـك بگـەڕێن، بەدوای ژمارەی فۆنیمەکان، یان مۆرفیمەکان لەنێو ڕستەدا بگەڕێن، لە سروشـتی بینـای زمانـەوانیی هۆنراوەکـە و ڕسـتە و دەسـتەواژەکانی بکۆڵنـەوە تـا لایـەنی سیسـتەمی زمانـەوانی هۆنراوەکـە و وێنـەکانی بـۆ هۆنیـار و خوێنـەرانی شـیتەڵ بکەنەوە. لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە زۆری بەکارهێنانی یەك فۆنیم، یان مۆرفیم لەنێو ڕستەکانی هۆنراوەکە دەلالەتی ئارەزوویەکی دروسـتکەرانەی هۆنیـار لەم بوارەدا ڕاناگەیەنێ هەروەك چۆن کەمیی بەکارهێنانی فۆنیمێك، یان مۆرفیمێك دەلالـەتی شـەرەفداری و زۆر بایـەخی ئـەم فـۆنیم و مۆرفیمـە ڕاناگەیـەنێ، بـەڵکو دەتوانین لەڕووی دەلالەتی دەروونییەوە واتـای ئـەو مۆرفیمانـە مامەڵـەی لەگەڵـدا بکەین، چونکە هەندێ وشەی وەك (ئاسمان، ئەستێرە، خـۆر، ئـاو، ژیـان، بـەهار) دەلالەتی خۆشی بەخشن لەڕووی دەروونییەوە، بەڵام هەنـدێ وشـەی دیکـەی وەك (تاریـك، ئـازار، بەندیخانـە، نەخۆشـخانە، مـردن) دەلالـەتی ناخۆشـی بەخشـینن لەڕووی دەروونییەوە. ئەم جۆرە وشانە ڕۆڵی کاریگـەریی خۆیـان هەیـە لـە بینـای وێنە دەروونییەکاندا. لێرەدا پێویستە هۆنیار لایەنی وشەبازی نەکاتە دوا پـەیام و ئامـانجی هۆنراوەکـەی، چـونکە هۆنیـاریش ئـەرکی ئاسـانکردنی تێگەیشـتنی هۆنراوەکەی لەسەرە بەرانبەر کۆششی خوێنەر و پەیامەوەرگر بۆ چـێژوەرگرتن لـە دەقی هۆنراوەکە و، نەمریی هۆنراوە لە یـادی خوێنـەردا پابەنـدە بـەجۆری زمـانی هۆنراوەکە و وێنە بابەتییەکەی.

داهێنــان لــە بوارەکــانی زمــانی شــیعری هەمیشــە فاکتــەرێکی گرینگــی نوێبوونەوەی شیعری کوردی بـووە لـە کۆنـەوە تـا ئـەم ڕۆژگـارە، لێـرەدا دەکـرێ پێناسەی داهێنانی شیعری بەوە بکەین " توانایەکی تایبەتـە، بـە زۆری لـە زمـانی شیعردا دەبینـرێ و پێویسـت دەبـێ ئەگەرچـی دەکـرێ لـە هەنـدێ شـێوازی تـری ئەدەبـدا هــەبێت "[٣١]. هۆنیــار بــۆ داهێنــان و نوێکردنــەوەی زمــانی شــیعریی هۆنراوەکــانی ســوودێکی بــاش لــە بــواری کێڵگــەی زمــانی ڕەســەنی کــوردی وەردەگرێت، چونکە نوێکردنەوەی زمـانی شیعری پێوەندییـەکی زۆری بـە زمانـە ڕەسەنەکەوە هەیە. کەواتە " تا ڕەسەنایەتی نەبێ، داهێنان نایەتە کایـەوە، واتـە تا شاعیر شارەزایی لە یاساکانی زمانەکەدا نـەبێ، ناتوانێـت لـەم یاسـایانە لابـدات یان بیانبەزێنێ "[٣٢].

داهێنانی شیعری زۆر جار بە واتای بەکارهێنانی شتی تازەی نوێباو دێت کەوا پێشتر بەکار نەهاتبێ، بەکارهێنانی وشەی تازەی هەڵبژێراو لـە گەنجینـەی زمـانی نەتەوەکەی هۆنیار یەکێکە لە بەڵگەکانی هەبوونی داهێنانی شیعری. لەم بارەیەوە پ.د. محەمەد مەعرووف فەتاح دەڵێت : " بەکارهێنانی وشەی نوێبـاو لـە شـیعری کوردیدا دیاردەیەکی نوێ نییـە و هـەر لـە کۆنـەوە تـا ئێسـتە بەردەوامـە، هەنـدێ جاریش لادانەکە لەوەدایە کە یاسایەکی وشەڕۆنان دەگشـتێنرێ. واتـا شـێوەیەکی بلاوتری دەدرێتێ و بەسـەر وشـەدا پیـادە دەکـرێ کـە لـەوەپێش لەسـنووری ئـەو یاسایەدا نەبووە "[٣٣].

هەوڵــدانی هۆنیــار بــۆ زۆرکردنــی ژمــارەی هــۆنراوە نــەمرەکانی لــە یــادی خوێنەراندا ئەرکێکی پیرۆزە لـەڕێی زمـانێکی قـورس و ڕەمـزی نایەتـە دی، بگـرە لەڕێی زمانێکی ڕەوان و باوی نێو خەڵکییەوە دێتە دی، هەروەها ئەم جۆرە زمانـە ڕەوان و بـاوەی نێـو خـەڵکی ڕۆڵـی خـۆی هەیـە لـە بەخشـینی مـۆرکێکی واقیعـی بەجیهانی هۆنراوەکە.

هــەموو هۆنراوەیــەك لــە ڕووی زمانەوانییــەوە لــە چــەند ڕســتەیەك پێکـدێت، هەرچەند ڕستەی هۆنراوەیی کورت بێ ئەوەندە ئاسانتر لەبـەر دەکـرێ و لـە یـادی خوێنەردا بـە نـەمری دەمێنێتـەوە، بـە پێچەوانەیشـەوە ئـەنجام ڕوودەدات ئەگـەر

هۆنیار کەمتەرخەمی کرد لە بواری بایەخدان بە جۆری ڕستەکانی نێو هۆنراوەکە و پەنای بۆ هەندێ ڕستەی درێژ برد.

لەنێو ڕستەکانی هەر هۆنراوەیەك جۆرە وەستان و پشوویەك هەیە خوێنەر دەرکی پێدەکات، بەڵام لەنێو دێڕەکانی ڕستەی هۆنراوەییشدا جاروبارێك ئەو جۆرە وەستان و پشووە بەدی دەکرێ و، لە هەموو حاڵەتێکدا ژمارەی جارەکانی وەستان و پشوودان پابەندە بەشێوازی زمانەوانیی هۆنیارەکە لە بینای ڕستەکانی نێو هۆنراوەکەی. لەم ڕۆژگارەدا وشەکانی یەك ڕستەی شیعری بەسەر چەند دێڕێکی پۆستەرە شیعرییەکە دابەش دەکرێت، هەروەها لەنێو هۆنراوەی هەندێ هۆنیاردا سنووری نێوان ڕستەکان نازانرێت لەبەر فەرامۆشکردنی لایەنی خاڵبەندی لەنێو دێڕەکانی هۆنراوەکە، بەڵام ئەم دیاردەیە لەنێو هەندێکی دیکەی هۆنراوەی کوردی هەبوونی نییە.

## ئەنجام

١- ئەگەر زمانی کوردی ناسنامەیەکی نەتەوەییی مرۆڤی کورد بێت، ئەوا زمانی شیعریش ناسنامەیەکی داهێنانی شیعرییە بەهای هونەریی تایبەتیی خۆی هەیە.

٢- زمانی شیعری وەك زمانێکی باڵا جیاوازە لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکی.

٣- زمانی شیعری وەك بوونەوەرێك لە ئۆرگانی شیعری خاوەن هەندێ خەسڵەتی تایبەتی خۆیەتی.

٤- دیارترین لایەنەکانی زمانی شیعری لەوەدایە هۆنیار (شاعیر) بە ئەنقەست هەندێ ڕستە و دەستەواژەی نێو دەقەکەی هەڵدەبژێرێ لەڕووی سەرسوڕمان و پرسیارکردن و ئەرێ و نەرێ و ڕستەی واتادار و جۆرەکانی ڕستەوە.

٥- لە توانای زمانی شیعریدا هەیە خوێنەر بباتە نێو ناخی ژیانی کۆمەڵەکەی، یان دووری بخاتەوە لە ڕاستیی ژیانی خۆی، بەپێی ئەو جۆرە زمانە شیعرییە لەنێو جیهانی هۆنراوەکە بەکارهاتووە.

٦- زمانی شیعری لەنێو هەردوو جۆری شیعری کلاسیکی و نوێدا هەندێ جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێ، زمانی شیعری لە هۆنراوەی کلاسیکیدا توانای شیعریی هۆنیار دەردەخات لە بەکارهێنانی جۆرە زمانێك بە هۆیەوە جیا دەکرێتەوە لە هۆنیارانی دیکە، بەڵام ئەم دیاردەیە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا هەبوونی نییە، بگرە زیاتر لەبواری شێوازی داڕشتنی شیعریدا ڕۆڵی گرینگیی خۆی هەیە.

٧- لە شیعری نوێ و پەخشانە شیعردا سروشتی زمان دەقاودەق وەك ئەوەی لەنێو شیعری کلاسیکیدا نییە، چونکە بە حوکمی ئەوەی سەرهەڵدانی شیعری نوێ بە جۆرە نوێکردنەوەیەکی ڕەوتی شیعر دادەنرێ.

٨- هەندێ جار وشەی نێو زمانی هۆنراوەی هاوچەرخی کوردی خاوەن واتای ڕوونی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام هۆنیار بەئەنقەست بەشێوەیەکی ئاڵۆز واتای وشەکانی نێو هۆنراوەکەی دەچنێ، لە ئەنجامدا خوێنەر سەری لێ دەشێوێت بە ئاسانی لە واتای گشتیی هۆنراوەکە تێ ناگات.

٩- زمانی دەقی شیعری کوردیی هاوچەرخ هەندێ لایەنی لادانی زمانەوانی تێدا بێت لە ڕووی بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگیی تازە و واتادار و کاریگەر، هەروەها بەکارهێنانی دەستەواژەی خاوەن ئیدیۆمی تایبەت و پەنابردنە بەر بەکارهێنانی ڕستەی شیعری زۆر کورت یان زۆر درێژی سەرنجڕاکێشی پڕ لە ئەندێشەی هونەری.

١٠- هەموو هۆنراوەیەك لە ڕووی زمانەوانییەوە لە چەند ڕستەیەك پێکدێت، هەرچەند ڕستەی هۆنراوەیی کورت بێ ئەوەندە ئاسانتر لەبەر دەکرێ و لە یادی خوێنەردا بە نەمری دەمێنێتەوە، ئەم جۆرە دیاردەیە زیاتر و زۆرتر لە ڕێزمانی شیعری کوردیی هاوچەرخدا بەرچاو دەکەوێت.

## پەراوێزەکان

١- د. ئازاد ئەحمەد مەحموود - بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چ/٢، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ژمارە (١٨٨)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢، ل١٧
٢- هەمان سەرچاوە، ل١٠
٣- هەمان سەرچاوە، ل١٤٤
٤- هەمان سەرچاوە، ل١٤٩
٥- هەمان سەرچاوە، ل١٣٦
٦- محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم - پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبیی نوێوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٩
٧- دیوانی نالی - مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەڵی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم / محەمەدی مەلا کەریم ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پیاچووەتەوە، چا/٣، تهران، ١٣٧٩ی فارسی، ل٣٤٦
٨- کەریم شارەزا - نالی و زمانی یەکگرتووی کوردی، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٤، ل٢٧
٩- دیوانی گۆران، چاپی دووەم، تهران، ١٣٨٥ فارسی، ل٤٩
١٠- دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح - چاپی دووەمی بژارکراو، بەرگی یەکەم، ئازاد عەبدولواحد کۆی کردووەتەوە و ساغی کردووەتەوە و لەسەری نووسیوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٥٨٧
١١- مەسعوود محەمەد - چەپکێك لە گوڵزاری نالی، چا/٣، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٥٢
١٢- سەباح ڕەنجدەر - کۆشیعری سروودی زەوی، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣٨
١٣- دیوانی نالی، ل٣٢٠-٣٢١
١٤- د. ئازاد ئەحمەد مەحموود - بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، ل١٤٢
١٥- قوبادی جەلیزادە - دیوانی (شەهید بە تەنیا پیاسە دەکات)، چ/٢، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٧، ل٢٣.
١٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٨
١٧- عەباس عەبدوڵڵا یووسف - تاککلی جمزێ و پەنجا تاکدێڕی تر، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ/٥٩، کانوونی دووەم، ٢٠١٣، ل١٧٩-١٨٥

١٨- هـایکۆ چـییە؟، وەرگێڕانـی لـە فارسـییەوە : محەمـەد تەرەغـە، گۆڤـاری هـەنار، ژ/٨٣، دیسمبر ٢٠١٢، ل١٢٩-١٤٤

١٩- هاشم سەڕاج - شیعری نانۆ، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ/٩٠، کـانوونی دووەمـی ٢٠١٣، ل٩١-٩٦

٢٠- ئەنوەر مەسیفی - کۆشیعری (شەیتان)، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٣٥

٢١- بورهان ئەحمەد - کۆشـیعری (هەڕەشـەکانی ژنێـك)، چـاپخانەی دەزگـای ئـاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٦

٢٢- پرۆفیسـۆر د. محەمـەد مـەعرووف فـەتاح - لێکۆڵینـەوە زمانەوانییـەکان - کۆکردنـەوە و ئامـادەکردنی شـێروان حسـێن خۆشـناو و شـێروان مـیرزا قـادر، چاپخانەی ڕۆژهەلاّت، هەولێر، ٢٠١٠، ل٤١٨

٢٣- بەلای ڕۆمان یاکۆبسنەوە (١٨٩٦-١٩٨٢) زمانی بالاّ ئەو زمانەیە کە بۆ قسـەکردن لەبارەی زمانەوە بەکاردێت، زمانی ئاساییش کە بۆ قسـەکردن لـەبارەی شـتەکانی دەوروبەر بەکاردێت.. بڕوانە : محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم - پێکهاتـەی زمـانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبیی نوێوە، ل ٢٠

٢٤- محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم - پێکهاتەی زمانی شـیعری لـە ڕوانگـەی ڕەخنـەی ئەدەبیی نوێوە، ل ١٥

٢٥- پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح - لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤١٨

٢٦- سەباح ڕەنجدەر - کۆشـیعری (خـەون وا خـۆی گێڕایـەوە )، چ/ئـاراس، هـەولێر، ٢٠٠٤، ل٥٩

٢٧- سەباح ڕەنجدەر - کۆشـیعری سـالّی سـفر، چـاپخانەی کـەمال، سـلێمانی، ٢٠١٠، ل١٤٥

٢٨- پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح - لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤٠١

٢٩- هەمان سەرچاوە، ل ٤٠١

٣٠- دیوانی گۆران، ل٢٨

٣١- پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح - لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤٠١

٣٢- هەمان سەرچاوە، ل٤٠٢

٣٣- هەمان سەرچاوە

## سەرچاوەكان


١- د. ئازاد ئەحمەد مەحموود - بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی كوردیدا، چ/٢، لە بڵاوكراوەكانی ئەكادیمیای كوردی ژمارە (١٨٨)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢

٢- ئەنوەر مەسیفی - كۆشیعری (شەیتان)، هەولێر، ٢٠٠٣

٣- بورهان ئەحمەد - كۆشیعری (هەرەشەكانی ژنێك)، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨

٤- كەریم شارەزا - نالی و زمانی یەكگرتووی كوردی، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٤

٥- دیوانی گۆران، چاپی دووەم، تهران، ١٣٨٥ فارسی.

٦- دیوانی شێخ نووری شێخ سالح - چاپی دووەمی بژاركراو، بەرگی یەكەم، ئازاد عەبدولواحد كۆی كردووەتەوە و ساغی كردووەتەوە و لەسەری نووسیوە، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨

٧- دیوانی نالی - مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مكایەڵی، لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەی مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولكەریم / محەمەدی مەلا كەریم ئەندامی یاریدەری كۆڕی زانیاری كورد پیا چووەتەوە، چا/٣، تهران، ١٣٧٩ی فارسی

٨- سەباح ڕەنجدەر - كۆشیعری (خەون وا خۆی گێڕایەوە)، چ/ئاراس، هەولێر،٢٠٠٤

٩- سەباح ڕەنجدەر - كۆشیعری ساڵی سفر، چاپخانەی كەمال، سلێمانی، ٢٠١٠

١٠- سەباح ڕەنجدەر - كۆشیعری سروودی زەوی، هەولێر، ٢٠١٢

١١- قوبادی جەلیزادە - دیوانی (شەهید بە تەنیا پیاسە دەكات)، چ/٢، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٧

١٢- عەباس عەبدوڵڵا یووسف - تاككلی جمزێ و پەنجا تاكدێڕی تر، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ/٥٩، كانوونی دووەم، ٢٠١٣

١٣- هاشم سەڕاج - شیعری نانۆ، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ/٩٠، كانوونی دووەمی ٢٠١٣

١٤- محەمەد عەبدولكەریم ئیبراهیم - پێكهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبیی نوێوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢

١٥- د. محەمەد مەعرووف فەتاح - لێكۆڵینەوە زمانەوانییەكان - كۆكردنەوە و ئامادەكردنی شێروان حسێن خۆشناو و شێروان میرزا قادر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠

١٦- مەسعوود محەمەد - چەپكێك لە گوڵزاری نالی، چا/٣، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠

١٧- هایكۆ چییە؟، وەرگێڕانی لە فارسییەوە : محەمەد تەرەغە، گۆڤاری هەنار، ژ/٨٣، دیسمبر ٢٠١٢، ل١٢٩-١٤٤

## ملخص البحث

للغة الشعرية أهميتها في البناء الفني لكل قصيدة، فهي أداة التعبير لدى الشاعر من جهة، وهي من أحدى وسائله لأثبات مقدرته الشعرية. وإذا كانت لغة الشعر الكلاسيكى الكوردي قد أمتازت بجوانبها البلاغية ومفرداتها المعجمية، فأن لغة الشعر الكوردي الحديث قد أمتازت بنوع من البساطة الملحوظة في قصائد كوران وشيخ نوري شيخ صالح وكامران موكري و ديلان وآخرون، بينما أمتازت لغة الشعر الكوردي المعاصر بجوانبها المعرفية ورموزها الأسطورية والتراثية العالمية والكوردية، وهذا ما حاولنا توضيحه في هذا البحث الموسوم بـ(خصائص لغة الشعر الكوردي المعاصر).

أمتاز لغة الشعر الكوردي المعاصر ببعض الظواهر الملفتة للنظر، منها لجوء بعض الشعراء الى أسلوب التكرار الشعري لمفردة لغوية أو عبارة أو جملة شعرية في العديد من أماكن جسد القصيدة كما في قصائد صباح رنجدر، أو منح المفردة الشعرية شحنة تصويرية رائعة كما في قصائد شيركو بيكەس، أو أستخدام مفردات شعرية قليلة في بناء القصيدة لدى قوبادى جليزاده، أو منح المفردة الشعرية شحنة دلالية ذات طابع رمزي غامض كما في قصائد انور مصيفي، أو التقشف في عدد أسطر القصيدة ومفرداتها بشكل ملحوظ كما في القصائد الوحيدة السطر لدى عباس عبدالله يوسف، أو تحويل لغة القصيدة الى جانب تعريفي لكلمة أو اسم محدد كما في القصائد الجديدة لدى هاشم السراج والتي أطلق عليها كلمة (نانو)، أو استخدام المفردات الشعرية لغرض منح القصيدة طابعاً رومانتيكياً أو واقعياً كما في قصائد محسن ئاواره وجنور نامق وشقيقتها جنار نامق ونوزاد رفعت وآخرون.

## Abstract

The poetic language has its importance in the technical structure of each poem for it is an expressive tool for the poet on the one hand, and one of his means to prove his poetic skills on the other. Whilethe Kurdish classical poetic language is characterized by its rhetorical aspects and lexical words, then the Kurdish modern poetic language is characterized by a kind of remarkable simplicity in the poems of Goran, Sheikh Nouri Al-Sheikh Saleh, KameranMokri, Dilan and others. The Kurdish contemporary poetry language is characterized by its cognitive aspects and its mythical, heritage, universal and Kurdish symbols which we try to clarify in this research entitled (The Characteristics of Kurdish Contemporary Poetic Language).

The Kurdish contemporary poetic language is characterized by some remarkable phenomena including the resort of some poets to the style of poetic repetition of a linguistic word, phrase or poetic sentence in several place of the poem body as in the poems of Sabah Ranjder, giving the poetic word a wonderful imaginative charge as in the poems of SherkoBekas, using few poetic words in constructing the poem for QobadiJilizada, giving the poetic word a charge indicative of a mysterious symbolic nature as in the poems of AnwarMasifi, reducing the number of the poem's lines and words markedly as in the one line poems of Abbas Abdullah Yousif, converting the poetic language to a defining aspect of a word or a certain name as in the new poems of Hashim Al-Sarraj on which the word (Nano) was called, or using the poetic words for the purpose of giving the poem a romantic or a realistic nature as in the poems of MuhsinAwara, JunourNamiq, her sister JunarNamiq, NawzadRifaat and others.

# کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەردەمی یەکەمین شەڕی جیهانیدا

## ڕەنگدانەوەی لە سەرچاوە ڕووسەکاندا*

ژارموحەمەد زەردیخان
و: د. شەماڵ حەوێزی

**بە باشی دەرکم بە ڕەوشتی سەیری ئەم کۆچەرانە دەکرد. ئەوانە بەبێ ساتێك سڵکردنەوە ئامادەن مرۆڤێك بکوژن تاکو دەست بەسەر جزدانەکەی یان ولاغەکەیدا بگرن، بەڵام تەنیا هاوارێك بۆ ورووژاندنی جوامێرییان (مەردایەتییان) بەسە ، تاکو بیانگۆڕیت بۆ خانەخوێیەکی سەخاوەتمەند و میهرەبان. پەندێك دەڵێت ئەوانە هەمیشە خەنجەریان بەدەستەوەیە، "بۆ سەربڕینت یان بۆ سەربڕینی مەڕێك بۆ میوانداریکردنت "**

**ئەمین مەعلوف، گۆڤاری لیۆ ئەفریکانس**

ئەمڕۆ، لە کاتێکدا کە گشت جیهان چاودێری ماوەی گواستنەوەی ئێستای عێراقە، یەکێتی ئەوروپا ژمارەیەك پاکێجی پەسند کردووە لەوانە بەکارهێنانی زمانی دایك لە رادیۆ و تەلەفزیۆن بۆ نەتەوە غەیرە تورکەکان و ئازادکردنی نوێنەرانی DEP دوای دە ساڵ زیندانیکردنیان. کوردەکان دیسان لە پێشەوەی ڕووداوەکان وەدەرکەوتنەوە. وەك توخمێکی (هەرچەندە وەك بەشێکی نەرینی) بەشداربوو لە "ئازادی عێراق"، دیسان کوردەکان خۆیان لە دووڕیانی ناکۆکی، ئارەزوو، بەڵێن و دوژمنایەتی دۆزییەوە.

---

* ئەم وتارە لە مانگی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ لە ژمارە (١) بەرگی (٤٢) ی گۆڤاری (Middle Eastern Studies) ، کە بە زمانی ئینگلیزی دەردەچێت ، بڵاوکراوەتەوە.

سەرەڕای تەمومژیی رۆڵی کوردەکان لە یەکەمین شەڕی جیهان و هەروەها شەڕی تورک لە پێناو سەربەخۆییدا، گومان نییە لە کارتێکردنیان نەك تەنیا لە کۆتاییهاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و رووسیای قەیسەری، بەڵکو رۆڵیان لە سەرکەوتنی کۆماری تورکیاش هەبووە. بۆیەش بە حەزی خۆی بووبێت یان نا "هۆکاری کوردی" هەرگیز لە سیاسەتی تورکیای کۆماریی لە رۆژی دامەزراندنییەوە تاکو ئێستا دوور نەکەوتۆتەوە. لایەنی پتر زاراوەی *"تورکیا میللەتی"* (گەلی تورکیا) لە لایەن مستەفا ئەتاتورکی، دامەزرێنەری کۆماری تورکیاوە شێلگیرانە لەجیاتی *تورکیا میللەتی* "نەتەوەی تورک" لە وتارەکانی لە کاتی شەڕ لە پێناو سەربەخۆییدا بەکاردەهات. هاوکات جەختیشی دەکردە سەر ئیسلام و هەڕەشەی ئەرمەن وەك دوو لایەنی پەیوەندی هاوبەشی بنچینەیی لە نێوان تورك و کورددا[1] هەر چەندە پەیماننامەی سێڤر ۱۹۲۰،"وەفاتنامەی" ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، رێگەی بە ئەگەری دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ دا " لەو شوێنانەی کورد زۆرینەن"، لایەنی عوسمانی رازی بوو لەسەر دەستبەرداربوونی لە هەموو ماف و دەسەڵاتەکانی بەسەر ئەم ناوچانەدا[2]، بەڵام پەیماننامەی لۆزان ۱۹۲۳ کە حکومەتی تورکیا ئیمزای لە سەر کرد، بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی بەم مافانە نەکرد[3]. لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا. ئەو کاتەی تیورییە شۆفینیستەکان وەك تیوری رۆژ – زمان و تێزی مێژووی تورك بۆ ماوەیەك بوونە دروشمی سیاسەتی رەسمی، بوونی کورد وەك رەگەزێکی سەربەخۆ بەتەواوی رەت کرایەوە و بەردەوام کورد بە "تورکەکانی شاخ" ناو دەبران.

چارەنووسی زمانی کوردی، کە مەسەلەی سەرەکی شەشەمین پاکێجی ریفۆرمی یەکێتی ئەوروپایە، هەروەها کێشەیەکی یاسایی دوورودرێژ بوو لە نێوان رادیۆ و تەلەڤزیۆنی دەوڵەتیی تورکیا (TRT) و ئەنجوومەنی باڵای رادیۆ و تەلەڤزیۆن (RTUK)، هەروەها بووە بابەتێك بۆ رێنمایی ناکۆك. سەرباری ئەوەی مادەی ۳۹– ی پەیماننامەی لۆزان، کە برگەکانی وەك یاسایەکی بنەڕەتی ناسران[5]، مافی ئازادی بەکارهێنانی هەر زمانێکی لە پەیوەندییە تایبەتییەکان، لە بازرگانی، لە ئاین، لە نووسین و بڵاوکردنەوە و لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا بۆ

هەر هاوڵاتییەکی تورکیای مسۆگەر کردبوو[٦]، یاسای بەدناوی ژمارە ٢٩٢٣ – ی ١٩٨٣ کە تاکو ساڵی ١٩٩١ بەردەوام بوو، و بەشێوەیەکی رەسمی زمانی کوردی قەدەغە کردبوو.

تاوتۆکردنی ژمارەیەکی زۆر زانیاریی پێکناکۆك کە بەبێ گومان لایەنگریی نووسەرەکەی و ئینتما ئیتنی و دینی و سیاسییەکەی پێوە دیارە. بە سادەیی مۆرکێکی چەواشەکاری بە ئانقەست و پرۆپاگەندەی لەخۆ گرتووە. ئەم کارە (نووسەر خۆی – وەرگێڕ) ئەرکێکی دیارکراوی هەیە، ئەویش لێکۆڵینەوەیە لە شێوەی نواندنی کوردەکانی ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان و لە کاتی شەڕەکەشدا، سەرباری وێنەی کوردەکان، ناسنامە، شێوەی ژیان و تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتییان کە بە جەرگەی ئەم کارەیە دادەندرێت، وێناکردنی سەردەمی یەکەمین شەڕی جیهان و مەسەلە ستراتیجییەکان گرنگییەکی گەورەی هەیە. لە بواری جوگرافییەوە، ئەم کارە ئەو باس لەو بەشەی "کوردستان" دەکات کە دەکەوێتە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، "ئەو ناوچە شاخاوییانەی رۆژئاوای ئاسیا کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن... پتر بە واتایەکی جوگرافی بەکاردێت، لە بەر ئەوەی کوردستان سنوورێکی دیارکراوی (چەسپاو) نییە"[٧] وەسفی کوردەکان پتر لە سەرچاوە رووسییەکانی سەردەمی تزار و حکومەتی کاتیی سۆڤییەتیدا بە شێوەی جۆراوجۆر و بە زمانی رووسی سەرچاوەی هەڵگرتووە: بیرەوەرییەکان، تێبینی کەمپین و گەشتیارەکان، وتارە سەربازییە ستراتیجییەکان، نامەکان و بڵاوکراوە رۆژنامەگەرییەکان. هەروەها ئەو سەرچاوە رۆژئاوایی و تورکانەی باسیان لە پێشتر و سەردەمی ئێستا کردووە، بۆ تەواوکردنی تابلۆی رووداوەکان بەکارهێندراون.

تاوتۆکردنی کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەرچاوە رووسییەکاندا لەم کارەدا بە وردی بە سەر دوو ئاستی جیاواز دابەش کراوە، تەنیا بەرجەستەبوونی دیارکردنی بیرۆکەی بابەتەکە نییە، بەڵکو سروشتی رەنگدانەوەکەشییەتی. بەشی یەکەمی ئەم کارە، دەکرێ بە وێناکردنێکی "کلاسیکییانە" ی کورد بناسرێت کە هەندێك راستی دەربارەی کوردەکان لە لایەن رووسەکانەوە دەردەخات، کە لە راستیدا لەگەڵ تێڕوانینی بریتانی، فەرەنسی و

هەندێك تورك زۆر جیاوازە. بابەتی پێشکەشکردنەکانیش (باسکردنەکە) تەنیا مەسەلە نا- سیاسی، نا- ستراتیجییەکان دەگرێتەوە، بۆیە کێشانی تابلۆکە یان باشتر، وەسفکردنێکی دێرینی کوردەکان، یان کۆچەرەکان ئاسانتر دەبینرێت. وێنەکێشانی کورد بەم شێوەیە بە راشکاوی سووکایەتی ئەوروپییەکان بە کۆمەڵگای کورد دەردەخات. پێداگرتن لەسەر دڕندەیی، هۆگریی چەك، یاخیبوون، بێگومان رەوشتی نووسەری بابەتەکەش دەردەخات. وەك چۆن ئیدوارد سەعید دەری بڕیوە" بەجۆرێك رەخساون وەك کۆمەڵێك جەنگاوەری سازدراو بۆ جەنگ بەرووی کۆمەڵێك بەربەر دێنە بەرچاو"(٨).

بەشی دووەمی ئەم کارە تۆژینەوەیە لە سەرچاوە رووسییەکاندا دەربارەی پەیوەندیی راستەوخۆی کورد بە شەڕی گەورەوە، رەنگە زانیاریی ورد و تایبەتی تێدا بێت دەربارەی پرسە سەربازی، سیاسی و دیمۆگرافییەکان. تاوتۆکردنی مەسەلەی کوردەکان لەم ئاستەدا، بێگومان هەلێك دەڕەخسێنێت بۆ گرنگیدانی نووسەرەکان، کە دیدێکی ناجێگیر و (هەندێك جاریش) ناکۆکیان پێشکەش کردووە. بەهۆی تایبەتمەندیی رەنگدانەکانەوە تەسەورەکە لە بنەڕەتدا جیاواز بوو ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێڕەوێکی مسۆگەر یان ناسنامەی خودی نووسەر. بۆیە شیکردنەوەی وێناکردنی کورد لە لایەن نووسەرە رووسەکان و هەڵوێستەکانیان سێ ناونیشانی زێدەتر دەگرێتە خۆی: "کورد و عوسمانی"، "کورد و رووس"، و"کورد و ئەرمەن"، دەشکرێ رۆڵی رووسەکان بەهەر یەك لە "چاودێر"، "ئەکتەر" و"ناوبژیوان" لەقەڵەم بدرێت.

وێناکردنی کورد — وەك کۆچەری شەڕکەر، موسڵمانی نەخوێندەوار و چەوسێنەری کریستیانە خۆجێیەکان — لە تۆژینەوە ئەکادیمییەکان و بڵاوکراوە رەسمییەکاندا وەکو یەك لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەرجەستە بووە، هەروەها لە چیرۆك و نامە تایبەتییەکانیشدا. دەبێت مرۆڤ ئەوەش وەبیر خۆی بێنێتەوە کە کریستیانەکانی ئەنادۆڵ لە لایەك کەوتنە بەر هێرشی بۆلشەڤیکەکان و" لە لایەکی ترەوە کەوتنە بەر هێرشی کوردەکان"، وەك بەشێوەیەکی روون لە لایەن نیکۆس کازانتزاکی لە رۆمانی "زۆربای یۆنانی" دا بەرجەستە کراوە، هەروەها کوردەکانی قارس نالی ئەسپیان بە بزمار لە پێی

قەشە و مامۆستایەکی یۆنانی قەیم کردووە[٩]. یەکەمین یان سەرەکیترین سیما، کە کەسێك حەتمەن تێبینی دەکات، بەکارهێنانی گوشارێکی لەڕادەبەدەرە بۆ گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی ئەو شاخنشینانە. دوو رستەی کورت کە جەنەراڵ ماسلۆڤسکی لە بەشی پێشەکی بیرەوەرییەکانی کۆلۆنێل یلسێیڤ (Yeliseyev) وەری گرتووە، کوردەکانی بە کۆچەر، دڕندە، دوور لە رەوشتی بەرز و کۆمەڵێکی سەرەتایی و کێوی وەسف کردووە، کە خاوەن کولتوورێکی نزم و دواکەوتوون[١٠]. ئەوەی شیاوی سەرنجڕاکێشانە، قەشە بێکگیولیانتس، کەسێکی رووس بوو، بە "تامەزرۆییەکی یەزدانییەوە" سەردانی ئەنادۆڵی کرد بۆ دامەزراندنی کەنیسەی نیشتمانیی ئەرمەن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەمیی چالاکی بانگخوازە کریستیانە رۆژئاواییە نێردراوەکان لە نێو کوردەکان "موسڵمانە توند و نەخوێندەوارەکان"[١١]. بۆیە دانیشتوانە کێوییەکانی کوردستان بە رەق و وشکیی زنجیرە شاخە بڵندەکانیان بەراورد دەکرێن، یەکێك لە بەربەستەکان سنووری تورکیا – ئێرانە کە بووەتە هۆی رێگەگرتن لە گەشەسەندنی ژیانی ئابوورییان.[١٢] ئەوەی جێگەی سەرنجڕاکێشان بوو دیسان وەسفێکی هاوچەشن رووبەڕووری مرۆڤ دەبێتەوە دەربارەی کورد لە سەرچاوە عوسمانی و تورکییەکاندا. جەنەراڵ کازم قەرەبەکر پاڵەوانی جەنگی تورك لە پێناو رزگاریدا، بەبێ دوودڵییەوە (سڵەمینەوە) بەم شێوەیە وەسفی کورد دەکات:" ئەوەندە نەفامن تا ئەو رادەی بەرامبەر شێخەکانیان لەسەر چۆك دادەنوێنەوە و دەوەڕن.[١٣] جی. ئاڕ. دریڤەر دەڵێ، دەرك نەکردنی بیرۆکەی تیوری لە لایەن کوردەوە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی زیرەکی و ئارەزوو.[14]

ئەو توخمەی دووبارە دەبێتەوە لە وەسفی کوردەکاندا، لە دۆکیومێنتە تایبەتی و رەسمییەکاندا، بۆ ئارەزووی سیاسی و پێکهاتەکەیان دەگەڕێتەوە. وەك زۆر جار ئاماژەی بۆ کراوە کوردەکان بە گشتی هیچیان نەبووە جگە لە "ئاینەکەیان، زمانەکەیان و خۆشویستنی تفەنگ و فیشەکدان"،[١٥] نەبوونی هونەری سیاسی و " توانای پێکەوە گرێدانی عەشیرەتەکان، کە نەتەوەی کورد پێك دێنن".[١٦] گومان دەکرێتە سەر توانا و لێهاتوویی سیاسیی کورد، کە دیسان لە پەیماننامەی سێڤر دووپات بۆوە، چونکە بە تەنیا ئەوە بەس نەبوو کە زۆربەی

دانیشتوان (مەبەست کوردە – وەرگێڕ) ئارەزووی سەربەخۆبوونیان لـە تورکیـاوە هەبێت، بەڵکو هەروەها پێویست بوو بۆ ئەنجوومەن بسەلمێندرێت کە "ئەو خەڵکە توانای ئەو سەربەخۆبوونەیان هەیە." (١٧)

ژیـانی کۆچـەری (Nomadism) و شـەڕەنگێزیی کوردەکـان، بابـەتێکی (خەسڵەتێکی) سەرەکی هاوکاتیان بووە لەگەڵ سـیما (نیشـانە) جۆراوجۆرەکـانی تـر، وەك دزی و درنـدەیی لـە سەرچـاوەکاندا، کـە وەك بنچـینەی وەسـفکردنی سیماکانیان چڕکراوەتەوە، ڕەنگە لە نێوانیشیاندا جۆرێك فرەڕەنگی بەدی بکرێت. کوردە نیشتەجێکان، وەك جووتیار هەموو جۆرە بەروبوومێکیان دەهێنایە بەرهەم و هەروەها وەك دانیشتوانی شاریش خوری ڕێس و ئاسنگەر بـوون. (١٨) جووتیـاری کورد ئاستی کولتووری نزمە و بەهرەی دەستی نییە، هەیـەتی و نییـەتی گـۆرەوی چنینە و بەس. (١٩)

سـەیرەکە لەوەدایـە، ژیـانی کۆچـەریی کوردەکـان لـە راسـتیدا بـە مەرجێکی (نیشانەی) بوونیان داناندرێت، بە شێوەیەك لـە شـێوەکان و بـەپێی زۆر سەرچاوەی رووسی سیمایەکی سەرەکی سەرنجڕاکێشیان هەیە کە لـە تورکـەکان، ئەرمەنەکان و فارسەکانیان جیایان دەکاتەوە. تێرمی وەك "کۆچـەر"، "گـەڕۆك" و"کوردەکان" زۆر جار بێ جیاوازی بەکارهاتووە، بە شێوەیەکی سروشـتی بـوونی کوردە نیشتەجێکان و گرووپە کۆچەرە غەیرە کوردەکان پشتگوێ دەخات، لەوانە چەرکەسەکان و کۆچەرە ئەرمەنەکان کە لە خوارەوە باسیان دەکرێـت، هـەروا بـە پێی داتایەکی دانیشتوانیی ئامادەکراو لـە لایـەن وەزارەتـی دەرەوەی رووسـیا لـە سـاڵی ١٩١٢ دا، ژمـارەی کـوردە نیشـتەجێکان ٢٤٢ هـەزار کـەس و کـوردە کۆچەرەکانیش ١٨٢ هەزار کەس بووە لە شـەش ویلایـەتی (vilayets) رۆژهـەڵاتی ئەنادۆڵ. (٢٠)

سـەرباری ئـەوەش وەك ئـەنجامێکی ئـەم"کارتێکردنـە بەرجەسـتەیە"، ڕەنگە تەفسیرێکی سەرسامت رووبەڕوو بێتەوە دەربارەی ڕەوشت و دابونەریتیان، تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاینییان تەنیا لە بەر رۆشنایی ڕەوشی کۆچەرانەیاندا، سروشتیان تا ئەو رادە بـەهێزە سـەرنجڕاکێش بـووە کـە ڤلادیمێـر گەردلێڤسـکی، تورکۆلۆجیستی رۆسیای سۆڤیەتی و شارەزای ناسراوی مێژووی سەلجووقییەکانی

تارادەیەکی زۆر تامەزرۆ کردووە، تاکو بڕیار بدات بە مەبەستی بینینی کوردەکان سەفەر بۆ ناوچەکەیان بکات سەربارى ئەو مەترسییە بەردەوامانەی رووبەڕووی دەبوونەوە.[٢١]

تێگەیشتنێکی سەرنجڕاکێش دەربارەی کۆچەرە کوردەکان لە وەرگێڕدراوە تورکییەکەی راپۆرتی جەنەڕاڵ مایڤسکی بە ناونیشانی 'Massovye uv[b] iystva sovershennye armyanami، کە لەلایەن پرۆفیسۆر عەزمی سوسلو، خراوەتە سەر زمانی تورکی و خۆشبەختانە هەموو تێکستە رووسییەکەی لە خۆ گرتووە. راگەیاندراوێکە کە " باسی هەموو دانیشتوانی دێهاتەکانی تورکیای ئاسیای کردووە، بە موسڵمانەکانیشەوە، کە پارێزراو نەبوون لەو پشێوی و گێرەشێوینییەی *هەندێ لە دانیشتوانی کورد دەیانخولقاند*"[٢٢] وەرگێڕە تورکییەکە لە ناخەوە دەچێتە سەر هاواری " گوندە ئەرمەنەکان... کە بە باشی لە لایەن میرییەوە لە هێرشی کۆچەرەکان نەدەپارێزران." [٢٣]ناوردبینییەکانی ئەم وەرگێڕانە ئەوەندە گەورەن کە بۆ نموونە لە شوێنێك " نزیکەی ٣٠ کورد" ی بە ئاسانی کردووە بە "نزیکەی ٤٠ تورك".[٢٤]

پەیوەندی عەشایەری لەنێوان کوردەکانی شار لاوازە، بەڵام لە راستیدا "بوونی پەیوەندییەکی بەهێزی یەکگرتن لە نێوان هەموو *توێژەکانی* تردا"،[٢٥] وەك دریڤێر (Driver) دەڵێت کارێکی زۆر گەورە دەکاتە سەر کوردە کۆچەرەکان. ئەم راستییە بۆ ئەوان سروشتییە، وەك ئەو ئاماژەی "پێدەکات کوردەکان لە پێدەشتەکاندا (ناوچە نزمەکان) هاولاتی ئاشتیخواز و بێوەین، بەڵام لە ناوچە شاخاوییەکاندا زۆر بە زەحمەت کۆنترۆڵ دەکرێن".[٢٦] سەبارەت بەزۆر ناردنی پیاوە کوردەکان لە تشرینی دووەمی ١٩١٤ بۆ ئەودیوی سنووری رووس – تورکیا بۆ ئیگدیر بەمەبەستی کارپێکردنیان لە ئیشی رێگاوباندا، کۆلۆنێل یلسێیڤ لە راپۆرتێکیدا دەڵێ " کوردەکان کرێکار نەبوون بە مانای ئەورووپیی ئەم وشەیە. ئەوان تەنیا کۆچەر (Nomads) بوون، ئەوانم لە سەر ئیش و لە دەرەوەی ئیشیش بینی. ئەوانە بۆ ئیشکردن نەهاتبوون، بەڵکو مەبەستیان پترکردنی رك و کینەیان بەرامبەر رووسەکان بوو.[٢٧]

گەڕیدە و چیرۆکنووسی عوسمانی ئەولیا چەلەبی لە سەدەی حەڤدەمیندا، ژیانی ئاینیی کوردەکان بەم شێوەیە وەسف کردووە "هەزارانیان هەرگیز و بەهیچ شێوەیەك لە مزگەوت دوور نەدەکەوتنەوە." [٢٨]. کازم کارابێکر جەختی کردۆتەوە لە سەر کزی دیسپلین و رەوشتی کوردەکان[٢٩] ئەوەش وەك پشتیوانییەك بۆ تێبینییەکانی دریڤێر دادەندرێت – کە لە سەرچاوە گاڵتەجاڕ و بوغراکانی وەك ئەوان وەرگیراوە،" ئەوان سەبارەت ئاین زۆر توند نەبوون،[٣٠] مزگەوتیان نەبوو جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت، ئەوانیش لە چەند کوختێك پتر نەبوون." [٣١] کوردەکان نە تریاکخۆر نە ئارەقخۆر بوون[٣٢] لەگەڵ ئەوەشدا بە خولیای جگەرەکێشان ناسراو بوون، کوردەکان هەموویان جگەرە دەکێشن و هەر جۆرە جگەرەیەکیشیان بدەیتێ رەتی ناکەنەوە. وەك ئەوەی کە پارچەیەك بسکویت وەرگرێت و نایخوات، بێگومانیش کۆنیاك رەت دەکەنەوە.[٣٣]

یەکێك لەو سیفات و ئادگارە کەمەی کە هەموو نووسەرەکان لەسەری یەکانگیرن دەربارەی کورد بارودۆخی ژنەکانیانە، کە بە پێچەوانەی ژنانی تورك و فارسەکانە ئەوان "وەك ژنە تورك و فارسەکان" روویان داناپۆشن[٣٤] کوردەکان "وەك تورکەکان تێیان راناخوڕن." [٣٥] هەروەها،" بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لە لایەن هاوسەرەکانیانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت."، " بە هۆی ئەوەی لەلایەن مێردەکانیانەوە وەکو مرۆڤی یەکسان مامەڵەیان لە تەکدا دەکرێت، بۆیە ژنی کورد بەیەکسانی دەڕوانێتە ملکەچبوونی ژنی تورك ".[٣٦] بەهەرحاڵ، گۆردلێڤسکی پێیوایە ژنە کوردی نیشتەجێش *تەواو ئازاد* نییە، هەرچەندە بێ روو داپۆشینیش دەتوانێت بچێتە سەر رووبار.[٣٧]

کوردەکان"... میواندار، خاکی، و گوێڕایەڵن و وەك موسڵمانەکان بەرامبەر رووداوە ناخۆشەکان خۆڕاگرن"، بە پێی دابونەریتە دێرینەکانیان دەژین.[٣٨] ئەوان بە خانەخوێی باش ناسراون، و وەك موسڵمانەکان لەگەڵ میوان میهرەبانن و ئازاری میوانی گوندەکانیان نادەن[٣٩] بە هەر حاڵ وەك بێکگیولیانتس (Bekgulyants) ئاماژەی پێکردووە، هەندێك گوندی کوردان هەیە بە شەو جێگەی مەترسین، هەندێکیشیان شوفێرەکان بە رۆژیش ناتوانن خۆی لێبدەن. [٤٠] کوختەکانی چیای قەفقاس (ساکلیاسە پیسەکانیان)، لە بەردی زبری کۆکراوە لە

رووبارەکان دروست کراوە، بەردەکان بە شێوەیەکی نارێك و هەڕەمەکی لە سەر یەك کەڵەکە کراون[٤١] بەبێ ئەوەی پەنجەرە و کلاوڕۆژنەی تێدابێت[٤٢] خۆیان و میوانەکانیان لە ژێر بنمیچی ئەم کوختەدا لەگەڵ وڵاغ، پەز، پەلەوەردا پێکەوە دەژین[٤٣] وەك کۆلۆنێل ێلسێیڤ دەڵێ کوردەکان جلی ژێرەوە لەبەر ناکەن و لە چاخی بەردیندا دەژین، لە کوختەکەیاندا کە پتر لە کولانە دەچێت، کۆنە پاتاڵێك لە سەر زەوی رادەخەن و لە سەری دەخەون.[٤٤]

سروشتی شەڕکەرانەی کوردەکان وای کردووە" هەر کەسێك ویستبێتی ئارامییان لێ تێکبدات، تالآنیان کردووە و کوشتوویانە"،[٤٥] لە راستیدا سەیر نییە کە شێوازی ژیانی نیمچە سەربازی بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی گەورە جێگەی سەرنجڕاکێشانێکی فراوان بووە. ئەم ناوچە کۆنترۆڵ نەکراوە شاخاوییە فراوانەی کوردستان کە بە پەلاماردان، تالآنکردن، شۆڕش و پاشاگەردانی ناوبانگی دەرکردبوو، پێگەیەکی گرنگی هەبووە لە پلانە ستراتیجییەکانی ئەو وڵاتانەی دەکەونە سەر هەر دوو لای هێڵی بەرە (بەرەی شەڕ – وەرگێڕ). پشتگوێخستنی بوونی کوردێکی زۆر کە گومان لە ئازایەتییان نەبوو،[٤٦] هەروەها ئەوان " کۆچەر و نیمچە رێگر بوون و هەموویان خاوەن تفەنگ و خەنجەر بوون"[٤٧]، لە لایەن زلهێزەکان و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کارێکی ئاسان نەبوو.

وەك پێشبینی دەکرێت خەسڵەتە سەربازییەکانی کورد، بۆ عەسکەرییە رووسەکانیش مایەی تێبینی و بۆچوونی ناکۆك بووە، کە بەر لە هاتنیان بۆ ئەنادۆڵ لە باوك و باپیرانیان بیستبوو، کە بەشدارییان لە شەڕەکانی رووس و عوسمانییەکان کردبوو. ئەوان کوردەکانیان بە نیمچە دڕندە وەسف کردبوو کە دەیانویست پێش بە سەرکەوتنی رووسەکان لە ناو خاکی تورکیادا بگرن،[٤٨] کوردەکان لە بەرچاویاندا وەك نیمچە دڕندە بە مانای تەواوی وشەکە وێنا کرابوون؛ رێگر، جەنگاوەر و هەروەها موسڵمان.[٤٩] بۆیە ئەوان" هێز، توانا و خۆڕاگری کوردەکانیان بە هەند هەڵنەدەگرت بۆ بەرپەچدانەوەی سوپایەکی راستەقینە".[٥٠]

وەسفی سیمای جەنگاوەرانەی کوردەکان بە لێکدانەوەی بیانییەکان بە تەواوی بە دزی و چەکدارییەوە پەیوەست بوو، کە بە دەوری خۆی هۆ و

ئەنجامێکی تەمومژاوی دەردەخات. لەوەش پتر، وەسفکردنی کوردەکان لە لایەن بیانییەکانەوە وەك ئەو کاردۆخییانەی (Kurdux) زێنۆفۆن لە کتێبی ئاناباسیس (کتێبە بەناوبانگەکەی زێنۆفۆن) ئاماژەیان پێدەکات "ئەوانە لە ناو شاخەکاندا نیشتەجێن خەڵکی جەنگاوەر بوون، رەعیەتی پاشا نەبوون"،[٥١] ئەوان پتر (بە واقیعی لە رووی مێژووییەوە) بە بنەچەی (رەچەڵەك) کوردەکان لەقەڵەم دەدرێن. [٥٢] سەرەڕای ئەوەش، ئەو "تالآن و دزییەی لەلایەن کوردەکانی دیاربەکرەوە ئەنجام دەدرا" وەکو ئەولیا چەلەبی لە "سیاحەتنامە" بەناوبانگەکەیدا ئاماژەی پێکردووە، وای لە سوڵتان سەلیم خانی فاتیحی شارە پیرۆزەکان و میسر کرد، نامەیەکی ئیمپراتۆری بۆ فەرمانڕەوای دیاربەکر بنێرێت ئەم رستانەشی تێ بکرێت" براکەم تکایە زۆر بەزەیی بە تاکو بەتوندی جڵەوی ئەم کوردە مسکێن و شەڕەنگێزانە بگریت.[٥٣] ئەمەش هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە " زۆربەی کوردەکان کەم یان زۆر جەنگاوەر بوون" دەتوانین بڵێین هەموویان چەکدار بوون، پێش شەڕ بە زۆری لە سەر ڕاووڕووت و پەلاماردان دەژیان[٥٤] ، مێجەر کینیس ماسۆنیش وای گوتووە. دزی "پیشەیەکی زگماکی" کوردەکانە، ئازایەتی تا رادەی هەڵمەت و پەلاماردان لە ناویان باو بووە بەو رادەیەی کوردە خانەخوێکانی گۆردلێڤسکی" رادەچڵەکین ئەگەر هاتباو یەکێك کتوپڕ دزی لە میوانەکانی کردبا"[٥٥]

بە پێی ئەولیا چەلەبی تەنانەت زانا کوردەکان ، بە شێخولئیسلامیشیانەوە چەکدار بوون، ئەمەش رێگر نەبوو لەوەی کە زۆر بەوەفا بن. [٥٦] هەروەها سەربازە رووسەکانی بەرەی قەفقاسیش هەمان تێبینییان هەبوو، کە کوردەکان نیشانچی زۆر باشن. [٥٧] بە هەرحاڵ، کورد "هۆگری چەکە" بە رادەیەك کە منداڵی هەشت ساڵ و بەسەرەوە دەبینی تفەنگێك و چەند فیشەکدانێکی گەورەی پێیە[٥٨] و هیچ کچێکیش رازی نییە شوو بە پیاوێك بکات خاوەنی تفەنگ نەبێت. [٥٩]

بۆچوونێکی تری جێی مشتومڕ لە بارەی کوردەکانەوە هەیە کە ناکرێ باسی نەکەین، ئەویش ئەوەیە کە رەوشتی "ناجوامێرانەیان" لە شەڕدا دەنواند. بە پێی قسەی کۆلۆنێل ێڵسێیڤ بێت، کوردەکان هەمیشە بە تفەنگ و خەنجەر چەکدار بوون، ئەوان کاتێك بەرامبەر دوژمنێك دەجەنگان کە دڵنیا بووان ژمارەیان لەوان

کەمترە، لەو جۆرە هەلومەرجەدا جەسارەت و ئازایەتییان پەرەی دەسەند و زێتر دەبوو. هەروەها نووسەر تێڕوانینەکانی خۆی بەو رستانە پشتڕاست دەکاتەوە کە لە نووسینێکی جەنەڕاڵ ماسلۆڤسکی وەری گرتووە" خۆیان لە شەڕی قورس نەدەدا، و لە هێڵی بەرەی شەڕدا ئەسپ سوار یان پیادەکان بوون. ئەو کاتە ئازا بوون کە زۆرینە بووان.(٦٠) ئەوان کەسیان بە دیل نەدەگرت و بریندارەکانیان دەشێواند و دوایی دەیانکوشتن.(٦١)ئەم "سروشتە" سەرسامەی کوردەکان لە وەسفکردنی کاردۆخییەکان لە لایەن زێنۆفۆنەوە باس کراوە، ئەوان پەلاماردانەکەیان کاتێك دەست پێ دەکرد کە دەیانبینی ژمارەیان لە ژمارەی لەشکری دوژمن زۆرترە.(٦٢) لە راستیدا هیچی پەیوەندی بە پراکتیکی جیهانیی مرۆڤایەتییەوە نییە. بە پێی پەیامنێرێکی سەربازیی رووسی کە هێرشی تۆپەکانی قۆزاق لە کۆپری– کۆی (Köprü-Köy) بینیبوو، کوردە جیاخوازەکان لەگەڵ تەقاندنی یەکەمین گوللە بزر بوون و ئاسەواریان نەما. چاودێرێکی تر دەڵێت: "لەگەڵ تەقینەوەی گوللە تۆپەکان، ئەسپ سوارە کوردەکان بەبێ دواکەوتن بەرەو شاخەکان باڵیان گرت (هەلاتن)."(٦٣)سەرباری ئەوەش تا ئێستا دەکرێ "هاندانێکت" بەرچاو کەوێت (بەڵام زۆر بە دەگمەن) کوردەکان بە "خەڵکێکی باش" وەسف بکات و بە قۆزاقەکان بشوبهێندرێن و ئاماژە بە لێهاتووییان لە بواری سوارچاکیدا بکرێت.(٦٤)

بارودۆخی ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی لە ئانوساتی بەر لە هەڵگیرسانی یەکەمین شەڕی جیهانیدا، بەتایبەتیش بازنەی پەیوەندییەکانی ناو ئەنادۆڵی رۆژهەلاَت پێکەوە ژیانی دژوارانەی پێکهاتە ئیتنییەکان زەمینەیەکی بە پیت بوو بۆ سەرشێتییەکی کتوپڕ (Brainstrming). هەندێك نووسەر پێیان وابوو حکومەتی ساوای (لاوی) تورکیا بەهۆی ئەرمەنەکانەوە ناتوانێت بەرەنگاری دەسەلاَتی شێخە کوردەکان ببێتەوە و لەگەڵ کوردەکان خۆی تووشی کێشە بکات، چاوەڕێی یارمەتی کوردەکانیش بوو گەر لەگەڵ رووسیا شەڕ هەڵگیرسابا.(٦٥) هەندێك بە پێچەوانەوە، پێیانوایە راڕایی و زۆرداریی زلهێزەکان هۆی سەرەکی نوشستی کوردەکانە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی.(٦٦)ساڵحی سۆنەل دەڵێت ئەوە رووسەکان بوون سەرەتا کوردەکانیان هان دەدا شەڕ لەگەڵ ئەرمەن

بکەن تاکو ڕێگە بۆ رووسەکان خۆش بێت دەست بخەنە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانییەوە.(٦٧) جێگەی تێبینییە کە دەرککردن و تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان نەتەوەکان (رەگەزەکان) بە تایبەتیش دوژمنایەتی نێوانیان، زۆربەی کات ناکۆك بووە، بەهۆی هەڵوێستی پەیامنێرەکان سەبارەت ئەم پرسە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ناسنامەی کەسێتی و سیاسی و نەتەوەییيان.

وێناکردنی گشتیی کوردەکان، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، دابونەریت و شێوازی ژیانیان، وەك فەرهەنگێکی تێکڕایی کە بە شێوەیەکی سنووردار پێوەی لکاوە، یان باشتر بڵێین ئەو ئادگار و سیفاتە دراماتیکییەی کە بە شێوەی تابلۆیەکی جیهانی پێشکەش دەکرێت، رەنگە پرسێکی ناکۆکی مێژوویی بێت خرابێتە ناو ئاناباسیس، سیاحەتنامە و پەیماننامەی بەڕلین. بەهەر حاڵ سروشتی وێناکردنەکان لە سەرچاوە رووسەکان لە کاتی یەکەمین شەڕی جیهانیدا، بە تایبەتیش دوای هەڵگیرسانی شەڕی رووس — عوسمانییەکان لە قەفقاز کە بووە هۆی داگیرکردنی پارێزگاکانی ئەنادۆڵی رۆژهەلاتی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە لایەن رووسەکانەوە بە شێوەیەکی کاتی، گۆڕانکارییەکی بەرچاوی هێنایە کایەوە. لەبەر رۆشنایی رووداوە تازەکاندا، بە راشکاوی دەرکەوت کە زوڵم و جەوری عوسمانییەکان بەرامبەر کوردەکان، هەروەها پشتگوێخستن و سووکایەتیپێکردنیان هۆی دواکەوتوویی و دڕندەیی SAVAGERY بوونیانە، ئەوان بە زگماك " نەتەوەیەکی چەتە"نین ئەوان خەڵکێکن، لە مافەکانیان بێبەش کراون".(٦٨)باشترین تەسەور دەربارەی کوردەکان لە واقیعی سیاسیی رووسەکاندا ئەوەیە کە بە شێوەیەکی پەیتاپەیتا لە "خەڵکانێکی تەواو شەڕانگێز" کراونەتە هاوکارێکی سادەی ستراتیجی. گرنگ ئەوەیە پێشڕەویکردنی سەربازە رووسەکان لە ئەنادۆڵی رۆژئاوادا کە هاوشانی بیرۆکەی "رزگاری ئەرمینیا" بوو، پەیتا پەیتا (بۆ ماوەیەك) گۆڕرا بۆ بیرۆکەی رانەگەیاندراوی "رزگاری کوردستان"، کە لەلایەن نووسەرە سۆڤییەتییەکانەوە بە تایبەتیش ئەرمەنەکان بە توندی رەخنەی لێ گیرا.

هەر چۆنێك بێت، هەڵوێست بەرامبەر رۆڵی جەنگاوەرە کوردەکان لە یەکەمین شەڕی جیهاندا بە تەواوی شێواندرابوو و سووکایەتی پێ کرابوو. ئەمەش لە

نووسینەکانی ئەو ئەفسەرە رووسانەدا رەنگی دابووەوە کە"بەرامبەر تورکە پیادە ئازاکان و کوردە سەرسەختەکان جەنگابوون".[٦٩] بە هەر حاڵ دەکرێ هەمان هەڵوێست لە هەندێك کاری (بەرهەمی) تورکەکان بەدی بکەیت وەکو جەنەڕاڵ قەرەبەکر، کە دەڵێت: کوردەکان بە شێوەیەکی ئاسایی لە تۆپ، رەشاش، و فرۆکەی جەنگی دەترسان، بەلاّم دوای مەشقی سەربازی ئەو ترسە نەدەما، ئەمەش دەبووە هۆی دروستبوونی گیروگرفتی ئاڵۆز.[٧٠] رەنگە بە شێوەیەکی تا رادەیەك چاوەڕوانکراو سەرچاوەی پێکناکۆك دەربارەی کوردەکان لە بەرهەمی نووسەرە تورکەکاندا ببینیت. پرۆفیسۆر میم کەمال ئوقا هیچ جیاوازییەکی لە رووی ئاین، زمان و دابونەریتەکان لە نێوان کورد و تورکەکانی ئەنادۆڵ و ئاسیای ناوەڕاست بەدی نەکردووە. بە پێی ئەم بنەمایە بێت دەبێت کورد بچێتە ژێر تیشکی کولتووری تورك.[٧١]

لە لایەکی ترەوە جەنەڕاڵ کازم قەرەبەکر لە کتێبەکەیدا *کێشەی کورد* ( Kürt Meselesi) دەڵێ تەنیا شتێك کورد و تورك پێکەوە ببەستێتەوە ئاینە (ئاینی ئیسلام – وەرگێڕ)، هەروەها دەڵێت: ئەو مووچەیەی عوسمانییەکان بە سەرۆك عەشیرەتە کوردەکانیان دەدا گرنگیی نەبوو.[٧٢] بەهەر حاڵ پێشتر نووسەر هەر جۆرە پەیوەندییەکی لە نێوان کوردەکان و ئەرمەنەکان رەت کردبۆوە ، بە بۆچوونی ئەو بێت رەچەڵەکی یەکەمیان دەچێتەوە سەر هیتیتەکان ( **Hittites** : گەلێکن لە هەزارەی دووەمی پێش زایین ئاسیای بچووك و سووریایان گرتووە و زمانی تایبەتیی خۆیان هەبووە – وەرگێڕ)، کە گوایە بریتین لە "تورکە هەرە دێرینەکان".[٧٣]

رووسەکان لە هەڵسەنگاندنی سیاسەتی عوسمانییەکان بەرامبەر کوردەکانی ناو دەوڵەتەکەیان پێش بەرپابوونی یەکەمین شەڕی جیهان و لە ماوەی شەڕەکەشدا، بەردەوام وەك نموونە باس لە زوڵم و بێمتمانەیی عوسمانییەکان بەرامبەر کوردەکان دەکەن، ئەوانیش (کوردەکان) بەش بەحاڵی خۆیان "تورکەکانیان زۆر خۆش نەدەویست"،[٧٤] هەروەها کوردەکان پەیوەندیکردنیان بە سوپای عوسمانی رەت دەکردەوە و لە کاتی شەڕدا بەکۆمەڵ فیراریان دەکرد. لە میانەی ئاماژەکردنی گۆردلێڤسکی بە سیما سروشتییە سەرنجڕانەکێشەکانی

کوردەکان جەخت لەسەر شێواندنی خەسڵەتە نەتەوایەتییەکانی کوردەکان دەکات بەهۆی سەدان ساڵ ژێردەستی و چەوساندنەوەیان لە لایەن سەرۆکەکانیان و حکومەتی عوسمانییەوە.[٧٥] رەنگە وێناکردنی سروشتی زوڵم و زۆرداری عوسمانییەکان لەلایەن نووسەرە رووسەکانەوە جیاوازی هەبێت لە نێوان هێرشێکی دڕندانە کە " تەنانەت دانیشتوانە ئاشتیخوازە کوردەکەش نابوێرێت کە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەدرێنە بەر دەستڕێژی گوللە"[٧٦]، لەگەڵ ئەو شکایەتە کۆمیدیایانەی کوردەکان کە تیایدا سەرکۆنەی حکومەتی عوسمانی دەکەن کە بەزۆرەکی داوا لە نەخوێندەوارەکان دەکەن هاوبەشی لە رۆژنامەکاندا بکەن و باج بدەن.[٧٧]

مەسەلەی سەربازیی (Military) کورد و بەشداربوونی ستراتیجیان بە سادەیی وەك رێسایەك لە *سوارەی حەمیدیە* ئاماژەی پێکراوە ، کە بریتی بوو لە هێزێکی سووکی غەیرە نیزامی ئەسپسواری کورد. ئامانجی پێکهێنانی *سوارەی حەمیدیە* ئەوە بوو جۆرە هێزێکی تایبەت لە شێوەی "هێزی قۆزاق" دابمەزرێت بۆ ئەوەی هەردووکیان بۆ جێبەجێکردنی خواست و ئامانجە ناوەکی و دەرەکییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەکاریان بێنن.[٧٨] مەترسی لە پێکهێنانی *سوارەی حەمیدیە* یان ئەو سیمایەی کە زۆر لە شێوازێکی بێگەردی سەربازی دەرچووە و مۆرکێکی ئیتنی و مانایەکی ئایدیۆلۆجی بەخۆیەوە گرتووە. وەك بڵێن کە *سوارەی حەمیدیە* بۆ خۆپاراستن لە رووس و ئەرمەنەکان ئامادە کراوە،[٧٩] ئەمەش راستەوخۆ سەنگێکی "نێودەوڵەتی" بە پرسەکە بەخشی. ناونووسین لە ریزی *سوارەی حەمیدیە*، بێگومان هەندێك ئیمتیازاتی تێدا بوو، لەوانە بەخشین لە باج، رەتکردنەوەشی مانای وابوو دەبێت عەشیرەتە کوردییەکان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئامادە بن بۆ خزمەتی ئیلزامی سەربازی.[٨٠] سەرەڕای ئەمە، کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێت لە دیاربەکر و بتلیس بەشێکی زۆر کەم لە عەشیرەتە کوردەکان خۆیان لە *سوارەی حەمیدیە* ناونووس کرد، بەڵام بۆ نموونە لە دەرسیم هەر هەموو رەتیان کردەوە پەیوەندی پێوە بکەن.[٨١]

لەپاڵ رەتکردنەوەیەکی توند بۆ پەیوەندیکردن بە دەستەی ئەسپسوارە کوردەکان، بەتەواوی هەست بە نەبوونی گەرموگوڕیی سەربازی لە نێو کوردەکانی

ناو سوپای عوسمانیدا دەکرا، ئەمەش وای کرد نووسەرەکان بگەنە ئەو بڕوایەی کە کوردەکان ڕۆڵێکی ئەوتۆیان لە تەواوی لایەنەکانی سوپاوە نەبووە. [٨٢] هەڵوێستی نابەجێیانەی سوارە حەمیدییەکان سەبارەت فەرمانەکان و خۆدزینەوەیان لە بەرپرسیارەتی لەلایەن عوسمان ئایتارەوە، نووسەرێکی سەیر و نامۆیە، تۆمار کراوە. [٨٣] لە لایەکی ترەوە، توانای سەربازیی *سوارەی حەمیدیە* بە رادەیەکی زۆر نزم ببوو، هەروا فەرمانده عوسمانی – ئەڵمانییەکان بڕوایان بە کوردەکان نەبوو، لێیان بەترس بوون و چەك و تفاقی کۆن و کەمیان پێ دەدان. [٨٤] سەرباری ئەوەش راکردنی بەکۆمەڵی سوارە کوردەکان وەك دابونەریتی خۆیان هەر لە ئارادا بوو، ئەوە بوو لە یەکەمین مانگەکانی شەڕدا ژمارەی هەر یەکەیەکی سەربازیی کوردەکان لە ٨٠٠ بۆ ٣٠٠ کەس دابەزی، [٨٥] ئەمەش ئەو راستییە پشتڕاست دەکاتەوە کە هیچ سەربازێکی کورد لە کۆتایی شەڕدا لە ریزی سوپای عوسمانیدا نەمابوو. [٨٦] لیوتنانت جەنەڕاڵ کۆرسون هۆی فیرارکردنی کوردەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئۆپەراسیۆنی "کۆپری کۆی" لە تشرینی دووەمی ١٩١٤، کە تەنیا ٢٨٠٠ لە کۆی ١٨٠٠٠ سوارەی کورد لە گشت پایە سەربازییەکان مابوونەوە. [٨٧]

لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ – بەتایبەتیش پاش کشانەوەی رووسەکان لە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات باسوخواسی جەنگاوەرە کوردەکان لە سەرچاوە رووسەکاندا جارێکی تر سەری هەڵدایەوە تاکو "مامەڵە قێزەونەکانیان" بخەنە بەرچاو. سەرەڕای نزمبوونەوەی ژمارەی سەربازە کوردەکان بە رێژەی ٦٦٪، بە قسەی کۆرسون بێت، سەرجەم ژمارەی کوردەکان لە سوپاکانی دوو، سێ و شەشی عوسمانیدا لە ساڵی ١٩١٧ بریتی بووە لە ٢٥ هەزار سەرباز. [٨٨] لە نامەیەکی شکایەت ئامێزدا بۆ وەهیب پاشا، جەنەڕاڵ لێبدێنسکی ئاماژە بە سەرهەڵدانەوەی هێرشی کوردەکان دەکات لەگەڵ ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای عوسمانی یان باشتر فەرمانده خەمساردە عوسمانییەکان. [٨٩] سەرەڕای ئەوەی بەندی یازدەمی شەڕوەستانی (هودنە) ئەرزنجان داوای لە فەرماندە عوسمانییەکان کردووە "هەموو هەوڵێك بدەن بۆ ناچارکردنی کوردەکان تاکو بە وردی پابەندی بەندەکانی ئەم پەیماننامەیە بن"، [٩٠] دواتر حکومەتی عوسمانی رایگەیاند، وەك کۆلۆنێل

تڤێردۆخۆلیکۆڤ لە دەسنووسەکەیدا ئاماژەی پێدەکات "کوردەکان لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودا نەبوون و حکومەت لە توانایدا نەبوو بەزۆر ملکەچیان بکات."[91] لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی راپۆرتێکی دزامۆێڤ فەرماندەی رووسیی قارس، پێشڕەویی کوردەکان بەرەو قارس خەریکە شێوەی ئۆپەراسیۆنەکی رێکوپێکی سەربازی وەردەگرێت.[92] ئەوەی سەرنجراکێشە کۆلۆنێل تڤێردۆخۆلیکۆڤ کە رووسێکی دیلی شەڕ بوو لە ئەرزرۆم (هەندێك لە برگەکان لە کاتی وەرگێڕانی بۆ تورکی لابردرابوون)، ئەو بە روون و راشکاوانە لە نووسینەکەیدا دیاری دەکات کە" هەموو ئەفسەرە رووسەکان بەردەوام بەرگرییان لە دانیشتوانە بێ چەکە ئاشتیخوازە تورکەکان کردووە و دەکەن"،[93] بێپەروا دەڵێت تاقمە کوردەکان، کە لە کۆچەرە خۆماڵییەکان و *عەسکەرە* عوسمانییەکان پێکهاتبوون، دەبوایە مەشقی سەربازییان لە لایەن ئەفسەرە عوسمانییەکانەوە پێ بکرێت.[94] ئەم وێنەیە ئەو بۆچوونەی رووسەکان دووپات دەکاتەوە کە دەسەلاتدارانی عوسمانی بەهەلپە بوونە بۆ دانانی کوردەکان لە پێشەوەدا، لەوەش نەدەسلەمینەوە کە سەربازە تورکەکان لە جلوبەرگی کوردیدا بشارنەوە.[95]

نموونەیەکی بەرچاوی دەستوەردانی ستراتیجییانەی رووس لە کاروباری کوردەکان، کە ماوەیەکی زۆر بە زیندوویی مایەوە و لەو نامەیەی فیلد مارشاڵ بەرجەستە دەبێت، کە ساڵی ١٨٢٨ بۆ ئیمپراتۆری رووسیا نیکۆلاسی یەکەمی ناردبوو، لەو کاتەی کە شەڕی رووسیا— تورکیا لە ترۆپکەدا بوو. لەو نامەیەدا کۆنت پاسکیێڤیچ قەیسەری ئاگادار کردبۆوە کە پێشڕەویکردن لە ناوچەی پشتەوەی عوسمانییەکان دەستەبەر نابێت بەبێ راکێشانی کوردەکان بۆ پاڵ رووسەکان، یاخود زامنکردنیان بە کارتێکردنێکی سیاسی.[96] لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانیدا مەترسی رووسیا دەربارەی ناوچەکە بەتایبەتیش بەرامبەر عەشیرەتە کوردەکان لەم کاتەدا تەشەنەی کرد لەوانەش خواستی ئابووری و ئیعتیباراتی ستراتیجی. ئاشکرا بوو کە رووسیا تونێلێکی ترانزێت بوو بۆ گەیشتنی زۆربەی کالا ئەورووپییەکان بۆ کوردستان.[97] لەو کاتەشدا بە راشکاوی دەرکەوت کە پێکهێنانی هێزەکانی *حەمیدیە* لە سەر بنەمای عەشایەری، سەرەتا لە ناوچە

هاوسنوورییەکانی رووسیا بوو[٩٨] مەسەلەکە بۆ رووسیا وەك بابەتێکی گرنگ و ژیاری سەیر دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا، لە تۆمارێکی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی رووسیادا لە ١٤ ئاداری ١٩١٦ دەربارەی "کەرتبوونی" ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە رەسمی تێبینی کراوە کە کوردەکان، لازییەکان، قزڵباشەکان و عەشیرەتە کۆچەرەکانی تر"لەگەڵ ئەوانەی تا رادەیەك دەتوانن – پەیوەست بە ئاسایشی دەوڵەت – بە توخمێکی جێگەی متمانەیەکی زۆر دادەندرێن"[٩٩] مەزەندە دەکرێت بکەونە نێو قەڵەمڕەوی رووسیا.

هەروەها ئەوە باوە کە لە چاپە تورکییەکەدا ئاماژە بە سیاسەتی چەواشەکاریی رووسیا دەرهەق بە کوردە عوسمانییەکان کراوە کە ئامانجی کەرتبوونی دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان لەژێر دەسەلاتی رووسیادا،[١٠٠] بەرهەمی نووسەرە رووسەکان لەم بارەیەوە هەمیشە تەمومژاوی بووە. هەرچەندە پرۆفیسۆر میم کەمال ئۆقا، پیترۆگرادی بە هاندەری شۆڕشی بتلیس لە ١٩١٤ دا داناوە،[١٠١] بێکگیولیانتس لێکۆڵینەوەی دەربارەی راپەڕینی شێخ سەعید عەلی و مەلا سەلیم (Seyh Sait Ali & Molla Selim) لە ناو کوردەکانی هیزان لە وتوویژەکانی لەگەڵ تەقسیم بای پارێزگاری وان زانیویەتی" کوردەکان بە شێوەیەکی دڕندانە سزادران بەهۆی دۆستایەتییان لەگەڵ دەوڵەتە هاوسێیەکەیان (رووسیا) و خەونە زێدەڕۆکانیان. کوردەکان دەبێت ئەوە لە مێشکی خۆیاندا بنێن کە موسڵمانن.[١٠٢] سالحی سۆنەل لە نووسینەکەیدا (کەمینەکان و کاولکاری لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا) ئاماژە بە نموونەی حاشاهەڵنەگری هاندانی یاخیبوونی کوردەکان لەلایەن رووسەکانەوە دەکات، ئەڵبەت بە شێوەی سەرەکی پشتی بە زانیارییە بەریتانیاییەکانەوە بەستووە.[١٠٣] سیمای تایبەتی روخساری کوردەکان بە وردی لە دوو حاڵەتی جیاوازدا دەردەکەوێت، کە راستەوخۆ بە سیاسەتی رووسیا لە رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە پەیوەستە، ئەویش ئەو ئۆپەراسیۆنانە بوون کە سوپای رووسیا ئەنجامی دەدان لەو ناوچانەی بەشێوەی کاتی لە لایەن ئەوانەوە فەرمانڕەوایی دەکران. لە کاتێکدا کە کوردەکان پێشتر بە گشتی لە مامەڵەی خراپ و توندوتیژیی رووسەکان نارازی بوون، لە کۆتاییدا گلەوگازندەیەکی بەردەوامی

ئەرمەنەکانیشی لێکەوتەوە سەبارەت پشتگیریی رووسیا لە کورد، کە چاوەڕوانی ئەرمەنەکانی نائومێد کرد.

کەمال مەزهەر ئەحمەد ئاماژەی بە رەتکردنەوەی "سروشتییانەی" *حەمیدیە* کردووە لە لایەن کوردەکانەوە لە میانەی روونکردنەوەی هۆی لایەنگیریی هەندێك سەرکردەی کورد لە رووسەکان.[(١٠٤)] جەنەڕال ئۆگانۆڤسکی لە راپۆرتەکەیدا جەخت دەکاتە سەر مەیلی کوردەکان بۆ رووسەکان؛ لەوەش پتر دەڵێت کوردەکان خۆشحاڵ بوون بە درێژەدان بە ئیشوکارەکانیان بەبێ (بەگەکانیان، ئاغاکانیان) زۆریان بڕیاریان دابوو هەر کاتێك رووسەکان بڕۆن، ئەوانیش کۆچ بکەن و لە رووسیا نیشتەجێ بن[(١٠٥)] هەروەها جەنەڕاڵ کۆرسون دەڵێت "گرتنی" ئەرزنجان لە لایەن رووسیا، ئەو دەرفەتەی بۆ رووسەکان رەخساند کە پەیوەندی بە کوردەکانی دەرسیمەوە بکەن "ئەوانەی دژی تورکەکان راپەڕیبوون."[(١٠٦)]

سیاسەتی (نەرمونیانی) رووسیا بەرامبەر کورد و هەروەها دروشمە سادە و پاکەکەی بۆ سەرکەوتن کە بریتی بوو لە وەی "ئەوەی مەکە کە عوسمانییەکان کردیان" لەگەڵ ئارەزوویەکی نموونەیی "تا ئەو دەرفەتە بۆ کورد بڕەخسێنێت کە بڕوای بە باڵادەستیی کولتووری رووس بەسەر تورکدا هەبێت،"[(١٠٧)] هەمیشە لەگەڵ راستیی مامەڵەی خراپ و دەستدرێژییە شاردراوەکان تێك ناکەنەوە (لە هەندێك حاڵەتی زۆر کەم نەبێت) کە بە پێی ئۆپەراسیۆنە سەرکەوتووەکانیان حسابیان بۆ دەکرا.

بەدرێژایی زنجیرە چیا سەختەکان و زستانی بەستەڵەك، ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان ناوچەی سەرەکی بەرەی شەڕی رووس– عوسمانی بوو، کە ئالیك و تەنانەت گیاوگۆڵیشی زۆر کەمە، ئەمەش رێگرە لە چالاکیی هێزی سوارە. چونکە دابینکردنی ئالیك و ئاڵف بۆ ئاژەڵەکان – ئاستەنگی سەرەکی بوو کە رووبەڕووی ئەم ناوچەیە دەبۆوە– کە لە کارە "نایابەکانی " سوپای رووس ئاماژەی پێکراوە. ئالیك و ئازووقەی کۆچەرە خۆجێیەکان لە لایەن دەستە قۆزاقەکانەوە، دەستە گەڕۆکەکانی پێشەوە، وەك کارێکی ئاسایی دەستی بەسەردا دەگیرا. کۆلۆنێل یلسێیڤ دەڵێت سەرکردەکانی قۆزاق هەندێك دەستەی

تایبەتییان دەنارده گوندەکانی کوردان بۆ هێنانی "هەر جۆره ئازووقە یان ئالیکێك."[١٠٨]

دەستە قۆزاقەکان پەلاماردەری سەرەکی گوندەکانی کوردان بوون، ئەوان"ئەزموونێکی گەورەیان هەبوو" عەمبارەکانی ئازووقە و شیرەمەنییان تالآن دەکرد و ئازووقە و ئالیکیان دەخستە ناو گونیەکان لەو کاتەی کە هەندێکی تریان لەگەڵ کوردەکان سەرگەرمی شەڕە گوللە بوون[١٠٩] هەروەها یلسێیڤ دەڵێت لەژێر زەبری ئەم جۆره مامەڵە درندانەیەدا "تەنانەت ئەوروپییەکانیش چەقۆکانیان بۆ بەرگری لە خێزان و شەرەفیان هەڵدەکێشن... ئەمەیە هۆی ئەوەی کە کوردەکان لە هەر دەرفەتێکدا سەربازە رووسەکان دەدەنە بەر گوللە."[١١٠] هەروا لە سەر قسەکانی دەڕوا:

ئێمە خاکیانمان داگیر کرد، خانووەکانیانمان رووخاند (بۆ دابینکردنی سووتەمەنی)، دەستمان بەسەر ئالیك و دانەوێڵەکانیاندا گرت بۆ هێزەکانی سوارەمان، مەڕ و رەشەولآغمان بۆ خواردن سەردەبڕی بەبێ ئەوەی هیچیان پێ بدەین. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگ بوو لەو ناوچە فراوانەدا هیچ دەسەڵاتێکی کارگێڕی خۆجێییمان پێ نەدابوون.[١١١]

لە لایەکی ترەوە، وەك لە *بیرەوەریی پاڵەوانەکانی دووەمین شەڕی نیشتمانیدا* کە لە ١٩١٦ بلآوکراوەتەوە، هاتووە کە سەربازییەکانی تورك لە کاتی کشانەوەیاندا هەرچی رەشەولآغ و ئازووقەی گوندەکان هەبوو لەگەڵ خۆیاندا بردبوویان، "تەنانەت یەك پاوەند نانیشیان بۆ رووسەکان بەجێ نەهێشتبوو".[١١٢]

پێشڕەویی رووسەکان لە ناو خاکی عوسمانییەکاندا و دەستبەسەرداگرتنی ئاوەدانییەکان پێناچێت کارێکی ئاسان بووبێت. چەسپاندنی دەسەڵاتی رووسی لە ناوچە داگیرکراوەکاندا کەوتۆتە بەر هەڕەشەیەکی جدی ئەو دزی و کوشتارەی لەلایەن، هێزە کوردییە"کێوییەکان" ئەنجام دەدرێت.[١١٣] وەرگرتنەوەی چەکەکان لە عەشیرەتە کوردەکان بە شێوەیەکی زەحمەت جێبەجێ دەکرێت، چونکە ئەوان تەنیا چەکە کۆنەکانیان تەسلیم کردەوە و تفەنگە ماوزەرەکانیان شاردەوە کە زۆربەیان هەیانە[١١٤]. هەروەها زۆر باس کراوە کە دانیشتوانە ئاشتیخوازە

موسڵمانەکان هەلی کشانەوەی سەربازە رووسەکانیان دەقۆستەوە و لە پەنجەرە و سەربانی خانووەکانیان تەقەیان لێ دەکردن.[115]

دامەزراندنی حوکمێکی کاتیی تزاری لە ناوچە داگیرکراوەکانی رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی و هەڵوێستی (سۆزدارانەی) بەرامبەر کوردە خۆجێیەکان، ببووە سەرچاوەی گلە و گازندەی بەردەوامی ژمارەیەکی زۆر نووسەری سۆڤییەتی، بەتایبەتیش ئەوانەی بە رەچەڵەك ئەرمەن بوون. هەرچەندە خستنەڕووی پەیوەندییەکانی کورد — ئەرمەن لە بەشی داهاتووی ئەم نووسینەدا دەخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، وا دیارە ئاماژەکردن بە کراکۆسیان لەبار بێت کە دەسەلاتدارێتی تزاری لە پارێزگا "ئەرمەنەکان" ی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە "ئەنتی پۆپیولست" و "رۆژهەلاتی" وەسف دەکات، لە کاتێکدا کە بەگ و شێخە کوردەکان نەك هەر چەکدار بوون، بەڵکو پارێزراو و لایەنگیری دەسەلاتی تزاری بوون.[116] سەرەڕای تەفسیرێکی سیاسیی هاوچەشن کە تەواو لەگەڵ نموونەی ئایدیۆلۆجیای سۆڤییەتی یەکانگیرە، زۆر نموونەی هاریکاریکردن لەگەڵ دوژمندا هەیە، وەك راپۆرتەکەی جەنەراڵ ئۆگانۆڤسکی فەرماندەی تیپی چوارەمی قەفقاس کە "جۆرێك هەماهەنگی" نوێنەرانی کورد و ئەرمەن لە بایەزید و دیادین بۆ دامەزراندنی ئیدارەیەکی مەدەنی ئاشکرا دەکات.[117]

هەرچەندە رۆڵی کورد و ئەرمەن لە ساڵانی یەکەمین شەڕی جیهاندا ئەوەندە کەم نییە، چارەنووسی ئەم خەڵکە، هەروەها هەر گرووپێکی ئیتنی تر کە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەم شەڕە تێوەگلا بووبێت، بێگومان پانتاپی و ئامانجی ئەم کارەیە، ئەویش تاقیکردنەوەی رەنگدانەوەیەتی لە سەرچاوە رووسییەکاندا.

گرنگ ئەوەیە لێکدانەوەی زۆر بۆ پەیوەندیی کورد— ئەرمەن هەیە لەلایەن رووسەکانەوە بێت یا رۆژئاواکان، کە ئاماژە بە رادەیەك پێکەوە ژیانی ئاشتییانە لە نێوانیاندا دەکەن. سروشتی ئەم پێکەوە ژیانەیان تا ئەو رادەیە پەرەی سەندووە کە بە "تەواو خۆشحاڵ"[118] و " تا رادەیەك دۆستانە" [119] وەسف بکرێت. سەرەڕای ئەوەی پەیوەندی ئاڵۆزی کورد — ئەرمەن زۆر رەگ و ریشەی جیاجیای ئیتنی، ئاینی، ئابووری و سیاسی هەبووە لەسەر هەردوو ئاستی لۆکەڵ

(ناوخۆ) و نێودەوڵەتیدا. بەپێی مادەی ١٦ لە پەیماننامەی سان ستیفانۆ کە ساڵی ١٨٧٨ کۆتایی بە شەڕی رووس– تورک (١٨٧٧–١٨٧٨) هێنا، ئەرمەنە عوسمانییەکان ئەرکیانە "بەڵێننامە" بدەنە بابولعالی کە پارێزگاری لە ئاسایشی دەوڵەتی عوسمانی لە دژی کوردەکان و چەرکەسەکان بکەن.[١٢٠] شیاوی گوتنە پەیماننامەی بەرلین کە شوێنی پەیماننامەی سان ستیفانۆی گرتەوە هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی لەم بەندەدا نەهێنایە کایەوە، جگە لەوەی ناوی چەرکەسەکانی هێنایە پێش ناوی کوردەکان ، کە هەردووکیان بە "مایەی هەڕەشە" وەسف کرابوون.[١٢١]عوسمان ئایتار پێیوایە هەمیشە وێناکردنی کوردەکان و چەرکەسەکان بە تەنیا هەڕەشە بۆ سەر ئەرمەنەکان، هەوڵدانی عوسمانییەکان بوو تاکو خۆیان وەك لایەنی سێیەم پیشان بدەن.[١٢٢]

خاڵێکی سەرنجڕاکێشی "رووداوەکانی ئەرمینیا" لە Rossiy i Turtsiya (porblemy formirovaniya granits) دەبیندرێت. نووسەرەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە " رەنگە هەڵەیەکی گەورە بێت، گەر بە یەك چاو تەماشای هەموو موسڵمانە خۆجێیەکان بەبێ هاوێردن بکەین، وەك یەك جۆرە خەڵکی نازیرەك و بێویژدان، ئەوەش جوامێرییەکی گەورەی کەسە "کێوییەکان" دەسەلمێنێت: کوردەکانی دۆڵی ئەفرین و نیمچە کۆچەرەکانی یوروکسی چوکورۆوا (Yörüks of Çukurova)" هەروەها چەرکەسەکان کە ژمارەیەکی زۆر کریستانیان رزگار کرد "سەلماندیان کە تاڕادەیەك باشترن"[١٢٣]

پەیوەندییە ئابوورییەکانی کورد – ئەرمەن شیاوی تێبینییە. لەکاتێکدا تورك زۆرینەی دانیشتوانی دۆڵی ئەرزرومی پێك دەهێنا بێکگیولیانتس پێیوایە دراوسێیەتی لەگەڵ تورك " کە گرووپێکی پتر چالاك و قبوڵکراو ، زۆر لەبار و بەسوودترە بۆ ئەرمەن لە دراوسێیەتی کوردە کێوییەکان"[١٢٤]

بەهەر حاڵ ئاستە دەمارگیرییەکەی (شۆڤینییەکەی) رێگەی پێدا کە بڵێت ژمارەیەك پیشەوەرەکان لە نێوان ئەرمەنە عوسمانییەکان بەرێژەی یەك لەسەر پێنج بووە، ئەمەش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لەسەر ئەوەی کە ئارەزوویان دەکرد نانی رۆژانەیان بە کارێکی شەرەفمەندانە و بەدەستی خۆیان مسۆگەر

بکەن.[١٢٥] سەرەڕای ئەوەش بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەرمەنەکان زۆربەی کات هۆیەکی ناکۆکیبوونیان بووە لە گەڵ کوردەکاندا.[١٢٦]

نموونەی بەندەیەکی ملکەچ کە پەیوەندی نێوان شێخە کوردەکان و میللەت بوو، بە شێوەیەکی تەمومژاوی ناوی لێندرا بوو (miribeylik) یان کافریزم (kafirism) هەروەها نموونەکە بۆ ئەرمەنەکانیش رەوا بوو ، بەڵام نەك بەم شێوە سامناکەی کوردەکان.[١٢٧] لەم بارەیەوە قسەیەکی داهێنەرانەی بێکگیولیانتس هەیە کە هەڵوێستی ئەو دەربارەی ئەم بابەتە دیار دەکات:

لە ئەوروپا و لە رووسیای نیشتمانم باوە کە هەموو رووداوەکانی ئەرمینیا بە خولیای راوڕووتیی کوردەکانەوە گرێدراوە. بەلآم وا دادەنێین کە ژمارەیەکی زۆر هۆی شاردراوە و قووڵ هەن، کە لە مافەکانی کافر (kafir) حەشار دراون، کە بەگە (beks) کوردەکان شێلگیرانە پابەندن و حەز ناکەن حەرام بکرێت، ئێمە راست نین گەر پێ داگرین کە بەگە کوردەکان خولیا و ئارەزووی راوڕووتیان نییە، بەڵکو هەیانە و زۆریش بەهێزە.[١٢٨]

هەروەها دەڵێت زاراوەکەی زۆر ناسراو نییە، تەنیا لە "ئەرمینیای عوسمانی" نەبێت، کە هەر گوندێك بەگێکی خۆی هەیە و دەسەلآتێکی نایاسایی، توندوتیژانە و زۆردارانەی سەپاندووە.[١٢٩] راستیی ئەوەی کە دانیشتوانە ئەرمەنەکان پتر باوەڕیان بە بەگە کوردەکان بوو نە بە فەرمانبەرە تورکەکان لە لایەن جەنەراڵ مایڤسکیشەوە تێبینی کراوە.[١٣٠] وەك کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێت: ئەو زوڵمەی ئاغا کوردەکان لە ئەرمەنەکانیان کرد زۆر پتر بوو لەوەی کوردەکان لێیان کردن، هەروەها ئەوەی بە ئەکیدی روویدا ئەوە بوو کە ئەرمەنەکان وەك کالآیەکی بەگە کوردەکان تۆمار دەکران و دەکڕان و دەفرۆشران.[١٣١] هەرچەندە لە ١٩١٤– وە (کافریزم) " لە ئەنجامی لاوازیی حکومەتی تورکیا و گەشەسەندنی هۆشیاریی خودی لە ناو کوردەکاندا " هێز و دەسەلآتی لە سەر ئەرمەنەکان و ناوچەی وان و مووش نەما، تەنیا لە سەر کوردەکان مابۆوە.[١٣٢]

وەکو پێشتر باس کرا نووسەرە رووسەکان تێبینیی لایەنی هاوبەشی شێوازی ژیانی سەرنجڕاکێشیان لە نێوان کورد و ئەرمەنەکان لە رۆژهەلآتی ئەنادۆڵ کردووە. پێکەوە ژیانی کورد و ئەرمەنەکان لە گوندەکانی ئەنادۆڵ و کۆچەرێتی

خودی ئەرمەنەکان وێنەیەکی سەرنجڕاکێشی هەمان ژیانی (کێوییانەی) کۆچەرە کوردەکانە. لە دۆڵی مووش خانووی قوڕی بچووك وەکو گردێك لە گوندە کوردەکان و ئەرمەنەکان دەبیندرێن.(١٣٣) هەروەها باس لەوەش کراوە کە لە گوندە ئەرمەنەکانی ئەرەکیز لە زستاندا رەشە وڵاغ و خاوەنەکەی لە یەك خانوودا ژیاون، "ئەوانەی کە زۆر بە دەگمەن شێوەی ژیانیان لەگەڵ ئاژەڵدا جیاواز بوو."(١٣٤) قەشە بێکگیولیانتس سەری سوڕما بوو لە بوونی کۆچەری ئەرمەن، و هەروەها کۆمەڵێك کورد کە ئەرمەنەکانیان لە بەرامبەر شێخە کوردە دوژمنەکانیان دەپاراست، لەوەش سەرسامتر پێکەوە ژیانی دوو گرووپی کۆچەر بوو، "دراوسێیەتی گورگ و مەڕ و پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانە".(١٣٥)

بە پێی قسەکانی ئەو جیاوازیی نێوان ئەم دوو گرووپە، کە "هەمان رەوشت و نەریتیان هەیە"، راستییەك بوو دەربارەی ئەو ئەرمەنانەی خاوێنتر دەژیان و لە زستاندا دەچوون بۆ قوتابخانە.(١٣٦) هەروا بەپێی وەسفێکی کۆلۆنێل ێلسێیڤ ژیانی رۆژانەی ئەرمەنەکان لە ئەنادۆڵی رۆژهەڵاتدا وەکو ژیانی موسڵمانەکان بووە،(١٣٧) رەنگە مایەی سەرسوڕمان نەبێت کە ژنە ئەرمەنەکان چارشێویان دەکردە سەر، بەڵام roوویان دانەدەپۆشی.(١٣٨) لە لایەکی ترەوە تێبینی ئەوە کراوە کە کورد و تورکەکان وەك رێزگرتنێك بەخشینێکی زۆر دەدەنە دێری چانگلی، "شوێنێکی پیرۆزی ئەرمەنەکانە"(١٣٩) ژمارەیەکی زۆر زانایانی ئایینی (ulemâ) کورد، وەك شێخ تاجی ئۆغلو کە کوردێکی سەر بە عەشیرەتی بادچی ناوچەی ساسون بوو، پشتگیرییان لە هەوڵی حەشاردان و پاراستنی ئەرمەنەکان کرد.(١٤٠)

هەروەها سەرکردە کوردەکان" داوای پشتگیری و کۆمەککردنی ئەرمەنەکان و ئاشوورییەکانیان لە کاتی شۆڕشی بتلیسدا کرد"،(١٤١) بێکگیولیانتس ئاماژە بە نموونەیەکی سەرنجڕاکێش دەکات کە "هاوکاریی میهرەبان" – ەیان بە روونی دەردەخات. خانەخوێ کوردەکەی بە نیگەرانییەوە پێی دەڵێت: ئەرمەنەکان " پیاویان هەیە بیانپارێزن، رۆژنامەکانیان هەیە، کاتێك شتێك رووبدات ... دەزانن چۆن هاواریان بگەیەننە هەموو جیهان، بەڵام ئێمەی کورد لە خوا بترازێت کەسمان نییە هاواری خۆمانی بۆ ببەین".(١٤٢)

بە پێی "یاداشتنامەی ئامانجەکانی شەڕ لەگەڵ تورکیا"، کە لە ساڵی ١٩٠٢ لەلایەن ئاژانسی سەربازیی رووسیا لە ئەستەمبۆڵ ئامادە کرا، ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان سنووری رووسیا و قەفقاس و دەریای سپی ناوەڕاست لە بارودۆخێکی زۆر پاشاگەردانیدا بوو، دزی و توندوتیژی بەشێك لە کوردەکان و بەدوەکان، ژیانی لە دانیشتوانە کریستیانە ئاشتیخوازەکان تاڵ کردبوو.[١٤٣]

باڵادەستی "مەترسیداری" کوردەکان بە سەر ئەرمەنەکاندا دیسان لەو نامەیەدا باس کراوە کە مارك سیکێس ساڵی ١٩١٦ بۆ سێر جۆرج بوچانان باڵوێزی بەریتانیای لە پیترۆگراد ناردووە. هەرچەندە باسکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی کە لە ژێر دەسەڵاتی تورکدا بێت، نووسەر پێی وایە ئەم بیرۆکەیە "بێ بایەخە"چونکە ناتوانێت لەگەڵ کوردەکان هەڵ بکات." [١٤٤] بەپێی یاداوەری ئەفسەرە رووسەکان کە لە کاتی هێرشەکەیاندا تۆماریان کردبوو، دیار بوو لە کاتی پشکنینی خانووی گشت دانیشتوانی مستەوتەنە ئەرمەنەکانی دوتاخ زۆربەی موسڵمانەکان، بەتایبەتیش کوردەکان چەکی باشیان هەبوو، بەڵام ئەرمەنەکان جگە لە چەقۆ، هیچی تریان نەبوو. [١٤٥] لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توندوتیژییە بەردەوامەی لەکاتی شەڕدا لە لایەن ئەرمەنەکانەوە ئەنجام دەدرا، بۆ کوردەکان ببووە بابەتێکی تاڵ و پێوەی دەناڵین[١٤٦] و ئەرمەن و کوردەکان هەردووکیان دڵڕەقی و دەمارگیری جەنگاوەرەکانیان لە شەڕگەدا تێبینی کردبوو، ئەوانەی کەسیان بە دیل نەدەگرت.[١٤٧]هەروەها زۆر جار دەمارگیرییە توندەکەیان دەگەیشتە ئەو رادەیەی تەرمەکان دوای ماوەیەکی زۆر لە کۆتاییهاتنی شەڕ بشێوێنن.[١٤٨]

بەپێی پرۆژەی چاکسازیی رووسی کە لە ١٩١٣ لە لایەن ماندێلیستام ئامادە کرا و پێشکەش بە حکومەتی عوسمانی کرا تاکو پارێزگایەکی ئەرمەنی لە ئەرزرۆم، وان، بتلیس، دیاربەکر، خەرپوت، و سیڤاس پێك بێت و پارێزگارەکەشی لە لایەن سوڵتانەوە دیار بکرێت و زلهێزەکانیش پێی رازی بن. هاوکات لەگەڵ نەمانی سوارەی حەمیدیە و قەدەغەکردنی نیشتەجێکردنی *موهاجیرەکان* (muhacirs)، پرۆژە هاوبەشەکە یەکسانی دەستەبەر کردبوو لە نێوان موسڵمان و غەیرە موسڵمانەکان لە یاسا لۆکاڵەکاندا، هەروەها یەکسانی لە زمان و ماف

خوێندن بە زمانی دایك.[149] بەهەر حاڵ لـە حـوزەیرانی ١٩١٦، سـازۆنۆفی وەزیـری دەرەوەی رووسیا نامەیەکی نووسی بۆ دۆقی مـەزن نیکـۆلای نیکـۆلایڤیچ جێگـری ئیمپراتۆر لە قەفقاس، کەوا کاتەکە لـەبارە بـۆ کردنـەوەی قوتابخانـە و کەنیسـەی سەربەخۆ بە ئەرمەنەکان. هەروەها سەبارەت موسڵمانەکان دەڵێت" هەمان پێوەر پەیڕەو بکرێت تـا ئـەو رادەیـەی هەلومەرجـە خۆجێیـەکان و ئاسـتی پێگەیشـتنی کولتوورەکەیان رێگەی پێدەدات".[150]

لـە کـاتی حـوکمڕانی کـاتیی تـزاری لـە ناوچـە عوسمانییـە داگیرکراوەکانـدا، دەسـەڵاتدارێتیی رووس بـەوە تۆمـەتبار دەکـرا کـە لـە زۆرتـرین کاتـدا لایـەنگیری کوردەکـان دەکـات نـەك ئەرمەنـەکان، دواتـر نووسـەرە سـۆڤییەتەکان هەسـتێکی تایبەتی دایگـرتن لـە دوورخسـتنەوەی توێـژێك لـە سیاسـەتی تزاریـدا. بـۆ نموونـە فەرمانی بەناوبانگی ژمارە ٣٤ لـە لایـەن مێجـەر جەنـەڕاڵ نیکـۆلاییێڤ فەرمانـدەی "وان" ی سەربەخۆ کـە رێگـەی دا بـە گێڕانـەوەی مسـتەوتەنە سـەرەکییەکان بـۆ کوردەکان وەکو بێرکلی قەلعـە، ئارچـاك، سـەرای، باشـکال و نـۆرادوز، کـە بـووە مایەی بێزاریـی پارێزگـا ئەرمەنییەکـەی وان. فەرمانەکـە ئەرمەنـەکانی ناچـار کـرد هێرش نەکەنە سەر کوردەکان و دزییان لێ نەکـەن و زیـان لـە کێڵگـەو بـەروبووم و رەشـەوڵاغەکانیان نـەدەن، کوردەکـانیش " لـە ترسـی سـزادان بـە مـەرگ و قەڵاچۆکردنی دانیشتوانی مستەوتەنەکانەوە لـە لایـەن ئەرمەنەکانـەوە"، دەبوایـە هیچ پشێوییەك دروست نەکەن.[151] لە راپۆرتێکیدا بۆ جێگری ئیمپراتۆر، جەنـەڕاڵ یودینیچ نووسیویەتی کە رێگەی بە ئەرمەنەکان نەداوە ئـەو زەوییانـە بـەکار بێـنن کـە کـورد و تورکـەکان بـەجێیان هێشـتووە، ئامـاژە بـە ئـاڵۆزبوونی دەستبەسەرداگرتنیان دەکات لە ئەرمەنەکان دوای شەڕ.[152]

نموونـەی سەرنجڕاکێشـی "لاگـیری" و"پشتگوێخسـتن"– ی رووسـەکان بەرامبەر کوردەکان لە لایەن ئاکۆپیانەوە ئاماژەی پێ کراوە.[153] ئەو دەڵێت کـە سەروتاری ژمارەیەکی زۆر رۆژنامەی ئەرمەنی تەرخان کرابوو بۆ بانگـەوازکردن بـۆ کۆکردنەوەی کۆمەك بۆ رزگارکردنی ئەرمەنەکان لە ژێردەستیی کوردەکـان، بەگـە کوردەکان بۆ هەر یەکێك داوای یەك لیرەی زێڕی تورکییان دەکرد. ئەوەی جێگەی سەرنجدانە ئەو ٥٠٠٠ ئەرمەنەی ئازاد کران بە هەمان شێوە لە ١٩١٧، کە لە لایـەن

عەشیرەتە کوردەکانەوە گیرابوون هەموویان سەر بە دەسەلاتداریتی قەیسەر و لەو ناوچانە بوون کە رووسیا داگیری کردبوون بۆیە وەك ئەو دەڵێت ئەستەم بوو بتوانی بە فدیە کەسێك لە سنووری رووسیا – تورکیا بپەڕێنیتەوە تەنانەت ئەگەر ۱۰۰۰ لیرەی زێڕیش بدەی.

رەنگە پێشبینی بکرێت کە راگرتنی پەیوەندی نێوان کورد – ئەرمەن بە گشتی سروشتێکی هاوسەنگ و ناکۆك بووە لە ئاماری داتاکانی ساڵانی یەکەمین شەڕی جیهان، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بووە بابەتی مەزەندەکردنێکی درێژ خایەن. بەپێی بێکگیولانتس، سەبارەت بەو ژمارەی کە لە ئینستیتیوتی تورکی و پاتریارکییەی کۆستەنتینۆپڵی ئەرمەنی تۆمار کراون، کە دوو سەرچاوەی بنچینەیی زانیارین، یەکەمیان هەوڵی داوە ژمارەی ئەرمەنەکان کەم بکات و دووەمیشیان زیادی بکات.[١٥٤] لەوەش پتر پاتریارکییەی کۆستەنتینۆپڵی ئەرمەنی ژمارەی دانیشتوانی کوردی بە رادەیەکی زۆر کەم تۆمار کردووە،[١٥٥] وەك بێکگیولیانتس جەختی لەسەر دەکاتەوە ئەمەش بۆ شێوازی ژیانی کۆچەری کوردەکان دەگەڕێتەوە.[١٥٦]

بە پێی ئەو سەرژمێرییەی دانیشتوان کە ئەختامار ئیپارکی ئەنجامی دا و بێکگیولیانتس ئامازەی پێکردووە، ٤٤٠٥٥ ئەرمەن (٦٧٤٤خێزان) و ٤١٣٦٨ کورد (٧٧٩٣ خێزان) لە ١١ بەشی هەردوو پارێزگای (vilayets) وان و بتلیس هەبووە،[١٥٧] کە ناهاوسەنگییەکی زۆری لە رێژەی خێزانی هەردوو گرووپی تێدایە، – ئەرمەن ٥٣ر٦ و کوردیش ٣ر٥ هەرچەندە لە راستیدا رێژەی هەر خێزانێکی کورد ٨–١٠ کەسە (ئەگەر رێژەی هەر خێزانێکی کورد ٩ کەس حساب بکەین ئەوا ژمارەی ٧٧٩٣ خێزانەکە دەکاتە ٧٠١٣٧– وەرگێڕ ).[١٥٨] لە لایەکی ترەوە لەو نامەیەی کە سازۆنۆفی وەزیری دەرەوەی رووسیا بۆ دۆقی مەزن نیکۆلای نیکۆلایڤیچ جێگری ئیمپراتۆر لە قەفقاس لە ٢٧ – ی حوزەیرانی ١٩١٦ نووسیبووی، دیسان بە وردی جەختی لەسەر تایبەتمەندییە دیموگرافییەکان کردبۆوە:[١٥٩]

**لە کاتی پێدانی ئۆتۆنۆمییەکی فراوان بە ئەرمەنەکان، نابێت ئەرمینیای گەورە فەرامۆش بکرێت کە ئێستا لە لایەن رووسیاوە فەتح کراوە، ئەرمەنەکان**

**زۆرینە نین، چونکە دوای شاڵاوی بەرپەرچدانەوەیان لە کاتی شەڕدا لە لایەن تورکەکانەوە... ئێستا بەحاڵ یەك لە سەر چواری دانیشتوان پێك دێنن.**

شیکردنەوەی یەکلاکەرەوەی دیمۆگرافی ئەم ماوەیە بێگومان بابەتێکە بۆ لێکۆڵینەوەی پتر و قووڵتر. ئەوەی دەتوانین تا ئێستا ئەو داتایەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی رووسیا بەدەستی هێناوە زیاد بکەین کە پێکهاتەی ئیتنی شەش پارێزگا دەخاتە روو، کە هاوشێوەی ئەو ئامارەیە کە لە لایەن پاتریارکییەی کۆستەنتینۆپڵی ئەرمەنی ساڵی ١٩١٢ کۆ کراوەتەوە.[١٦٠]

نیشاندانی کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سەرچاوە رووسییەکاندا لە ماوەی یەکەمین شەڕی جیهانیدا دوو تایبەتمەندی پێکناکۆك و جیاواز دەردەخات چونکە ژیانی کۆچەری و شەڕاوی کوردەکان هەروەها شێوازی ژیانیان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتییان وێنەیەکی یەکگرتووی دەربارەیان پیشان دەدات زانیاری دەربارەی مەسەلە سیاسی، ستراتیجی و ئابوورییەکان بە درێژایی یەکەمین شەڕی جیهانی ناسەقامگیر و ناکۆکە.

پشتگیریی لە بیرۆکەی " کۆڵەپشتی پیاوی سپی"، ئەرکی مەدەنی، ئارەزوویەکی "میهرەبان" بۆ تێکەڵاوکردنی عەشیرەتە نەفرەتلێکراوەکان لەگەڵ سیستمی جیهانی یان سادەتر خولیایی سەرچڵی (adventures curiosity) وێنەیەکی وێکچووی دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواری لەنێوان ئەورووپییەکان لەو کاتەدا دروست کردبوو. ئەم لێکدانەوە زۆر جار دەبووە مایەی "پێخۆش نەبوونی" کۆچەرەکان، زۆرجار سەرچاوەکان "ئەم پێخۆش نەبوونەیان بۆ پاڵپشتکردنی هەڵوێستە سووکایەتیپێکردنەکانیان قۆستەوە". نووسەرەکانیان، کە بوونە کەسانی نیشتەجێ "کۆچەرەکانیان وەك درندە تەماشا دەکرد و دووربەدوور وەسفیان دەکردن".[١٦١] بەهەر حاڵ مەزەندەی گشتی کۆچەریی کورد لە رووی ئامارەوە ناکۆکە، چ لە سەر ئاستی رێژەی کوردە نیشتەجێکان و کۆچەرەکان بێت، یان قەبارەی خێزانە کوردەکان و ئەرمەنەکان.

وەك هەر مەسەلەیەکی زلهێزەکان " سیاسەتی ئیمپراتۆری خستنەرووی کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پێش و لە کاتی یەکەمین شەڕی جیهانیدا راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەستە بە کاریگەریی ستراتیجی ، ئابووری و

بەرژەوەندییە سیاسییەکان و بەرجەستەکردنی وێنەی تەواو جیاجیایە. یەکەم و لە پێشەوەدا ژمارەیەك سەرچاوە بێگومان کەوتنە دوای راچێتەی ماشینی پڕۆپاگەندەی سیاسی و هەروەها ستراتیجی و سەربازی. بۆیە کاردانەوەی کوردەکان لە سەر بنەمای ئەم جۆرە سەرچاوانە دامەزرایەوە ، رەوتی تایبەتی، ململانێ یان بە شێوەیەکی گشتی کێشمەکێشی پچڕ پچڕ. ئینجا، ململانێی رووس و عوسمانییەکان بەپێی قۆناغ بە سەر ئەم ماوانە دابەش دەبێت:

١. پێش شەڕ و ململانێ
٢. داگیرکردن و ئەنادۆڵی رۆژئاوا و بەڕێوەبردنی
٣. دوای ماوەی داگیرکردنەکەی رووسیا

وێنەی کوردەکان رەنگە بەتەواوی سروشتەکەی لە "شەڕئەنگێزێکی رەها" بۆ هاوبەشییەکی ستراتیجی سادە بگۆڕدرێت. بە ئاشکرا ئەم سیمایە بە شێوەیەکی تایبەتی بە پەیوەندییەکانی کورد– ئەرمەنەوە دیار بوو. لەلایەکی ترەوە سیاسەتی تزاری یان لە راستیدا "سۆزدارێتی" بەرامبەر کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە لایەن هەندێك نووسەرەوە وەك بەشێك لە دیزاینی ئیمپراتۆریەت وەسف کراوە بۆ دامەزراندنی "ئەرمینیا ... بەبێ ئەرمەنەکان" وەك ئەوەی لۆبانۆڤ – رۆستۆڤسکی وەزیری کاروباری دەرەوەی تزار و باڵوێزی پێشووتر لە ئەستەمبوڵ دەستی پێکرد.(١٦٢) بنەماکانی "سۆزدارێتی" تیزاریسم، لە لایەکی ترەوە زۆربەی کات لەگەڵ "ئەرکێکی مەزنی کولتووری" هاوکات بووە کە رووبەڕووی رووسیا ببۆوە. ئەوەش"بۆ بەدەستهێنانی سۆزی کوردەکان بۆ خۆمان، بێ دواکەوتن گرنگی بە کوردەکان بدرێت و بارودۆخی ژیانیان باش بکرێت، تاکو دوای شەڕ بە هۆشیارییەوە بتوانن بڕیار بدەن ئایا لێرە دەمێننەوە یان دەڕۆن بۆ تورکیا".(١٦٣) بە هەر حاڵ، لە دوا لێدوانی دانپێنانـدا کە لەلایەن کۆلۆنێل ێلسێیڤ لە تاراوگە لە پاریس نووسرا هاتووە کە " ئێمە تەنیا ئەو کاتە لە ناخی بارودۆخی دەروونی کوردەکان ورد بووینەوە کە سوپای سوور و حوکمڕانی سۆڤییەتی لە باکوورەوە گەیشتە سەرزەمینی قۆزاق و بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ قۆزاق کرد کە سەردەمێك ئێمە لەگەڵ کوردەکانمان کردبوو"(١٦٤)

رەنگە یارمەتیدەر بێت بۆ لادانی پەردە لەسەر رۆحی راستەقینەی پەیامەکە.

تێبینییەکان:

## Notes


1. Baskın Oran, *Atatürk Milliyetçiliği: Resmi İdeoloji Dışı Bir İnceleme* (Ankara: Dost Kitabevi Yayınları, 1988), pp.99, 161–2.
2. 'Treaty of Peace between the Allied Powers and Turkey: Signed at Sèvres, 10 Aug., 1920; Part III. – Political Clauses', *American Journal of International Law*, Vol.15, Issue 3, Supplement: Official Documents (July 1921); Section III – Kurdistan, Articles 62 and 64; pp.192–3.
3. For comparison see Philip Marshall Brown, 'From Sèvres to Lausanne', *American Journal of International Law*, Vol.18, Issue 1 (Jan. 1924), p.113.
4. Oran, p.173.
5. 'Treaty of Peace', *American Journal of International Law*, Vol.18, Issue 1, Supplement: Official Documents (Jan. 1924), Part I. Political Clauses: Section III – Protection of Minorities, Article 37, p.13.
6. 'Treaty of Peace', Article 39, p.14 [emphasis added].
7. 'Kurdistan', *Bol'shaya Sovetskaya Entsiklopediya*, 3rd edn, Vol.14 (Moscow: Izdatel'stvo 'Sovetskaya Entsiklopediya', 1973), pp.27–8.
8. Edward W. Said, *Orientalism* (New York: Vintage Books, 1979), p.120.
9. Nikos Kazantzakis, *Zorba the Greek* (London and Boston: Faber and Faber, 1961), pp.145–6.
10. E.V. Maslovskiy, *Mirovaya voyna na Kavkazskom fronte: 1914–1917* (Paris: 1933), p.27; cited by F. I. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte 1914–1917: Zapiski polkovnika Kubanskogo kazach'ego voyska v trinadtsati broshyurakh-tetradyakh* (Moscow: Voyennoye Izdatel'stvo, 2001), p.8.
11. Priest R. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii: Vpechatleniya ot poezdki letom v 1914 godu* (Rostov na Donu: Tipografiya Ya. M. Iskidarova, 1914), p.13.
12. B. Kolyubakin, *Na maloaziatskom teatre vsemirnoy voyny 1914–1916 gg: Bagdadskaya zheleznaya doroga*, (Petrograd: Tipografiya Nikolayevskoy voyennoy akademii, 1917), p.46.
13. Kâzım Karabekir, *Kürt Meselesi*, Faruk Özerengin (ed.) (Istanbul: Emre Yayınları, 1994), p.11.
14. G.R. Driver, 'Studies in Kurdish History', *Bulletin of the School of Oriental Studies*, University of London, Vol.2, Issue 3 (1922), p.508.
15. Captain Bertram Dickson, 'Journeys in Kurdistan', *The Geographical Journal*, Vol.35, Issue 4 (April 1910), pp.361–2.
16. Driver, 'Studies in Kurdish History', pp.503–4.
17. 'Treaty of Peace between the Allied Powers and Turkey', Article 64, p.193.
18. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.500.
19. V. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov. Iz poezdki na kavkazkiy front', *Musul'manskiy Mir*, Year I, Issue I (1917), p.33.
20. A. O. Arutyunyan, *Kavkazskiy front: 1914–1917 gg*. (Yerevan: Izdatel'stvo 'Ayastan', 1971), p.347.
21. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.23.
22. General Mayewski [Mayevskiy], *Ermenilerin Yaptıkları Katliâmlar (Massovye uv[b]iystva sovershennye armyanami)*, transl. Azmi Süslü (Ankara: Ankara Üniversitesi Basımevi, 1986), p.11 [emphasis added].
23. Ibid., p.12 [emphasis added].
24. Ibid., pp.25–6.
25. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.501 [emphasis added].
26. Ibid., p.500.
27. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.144.
28. Dankoff (ed. and trans.), *Evliya Çelebi in Bitlis: The Relevant Section of the Seyahatname* (Leiden and New York: E.J. Brill, 1990), p.67.
29. Karabekir, *Kürt Meselesi*, pp.47–8.
30. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.503.

31. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.143.
32. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.503.
33. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.105.
34. Ibid., p.143.
35. Dickson, 'Journeys in Kurdistan', p.364.
36. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.505.
37. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.26.
38. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.143.
39. Ibid., p.111.
40. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.8.
41. Ibid., p.8.
42. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.26.
43. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.9.
44. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.143.
45. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.8.
46. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.503.
47. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, pp.106–7.
48. Ibid., p.38.
49. Ibid., p.144.
50. Ibid., p.70.
51. Xenophon, *Anabasis*, transl. Carleton L. Brownson, Book III: 5 (Cambridge, MA: Harvard University Press, 1998), p.287.
52. See, for instance, Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', and Driver, 'Studies in Kurdish History', p.493.
53. Martin Van Bruinessen and Hendrik Boeschoten (eds. and transl.), *Evliya Çelebi in Diyarbekir: The Relevant Section of the Seyahatname* (Leiden and New York: E.J. Brill, 1988), p.117.
54. Major Kenneth Mason, 'Central Kurdistan', *The Geographical Journal*, Vol.54, Issue 6 (Dec. 1919), p.330.
55. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.29.
56. *Evliya Çelebi in Bitlis*, p.67.
57. *Vtoraya Otechestvennaya voyna po razskazam eya geroyev* (Petrograd: Izdaniye sostoyaschago pod Vysochayshim Ego Imperatorskago Velichestva Gosudarya Imperatora pokrovitel'stvom Skobelevskago Komiteta, 1916), p.144.
58. Mason, 'Central Kurdistan', p.334.
59. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, pp.106–7.
60. Ibid., p.70.
61. Maslovskiy, p.27; cited by Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.8.
62. *Anabasis*, Book IV: 3, p.325.
63. *Vtoraya Otechestvennaya voyna*, pp.176, 178.
64. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.143.
65. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.76.
66. Osman Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna* (Istanbul: Medya Güneşi Yayınları, 1992), p.28.
67. Salâhi R. Sonyel, *Minorities and the Destruction of the Ottoman Empire* (Ankara: Turkish Historical Society Printing House, 1993), p.392.
68. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.23.
69. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.7.
70. Karabekir, *Kürt Meselesi*, p.47.
71. Prof. Dr. M. Kemal Öke, *İngiliz Ajanı Binbaşı E.W.C. Noel'in 'Kürdistan Misyonu' (1919)* (Istanbul: Boğaziçi Yayınları, 1992), p.2.
72. Karabekir, *Kürt Meselesi*, p.11.
73. Ibid., p.10.
74. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.143.
75. Gordlevskiy, p.34.
76. *Vtoraya Otechestvennaya voyna*, p.218.
77. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.32.
78. M.A. Gasratyan *et al.*, *Kurdskoye dvizheniye v novoye i noveysheye vremya* (Moskva: Isdatel'stvo 'Nauka', 1987) [henceforth *Kurdskoye dvizheniye*], p.33.
79. Robert Olson, *The Emergence of Kurdish Nationalism and the Sheikh Said rebellions, 1880–1925* (Austin, Texas: University of Texas Press, 1989), p.8.
80. Ibid., p.9.

81. Kamal Madhar Ahmad, *Kurdistan during the First World War*, transl. Ali Maher Ibrahim (London: Saqi Books, 1994), p.55.
82. *Kurdskoye dvizheniye*, p.74.
83. Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna*, p.122.
84. *Kurdskoye dvizheniye*, p.74; and Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna*, p.140.
85. *Kurdskoye dvizheniye*, p.74.
86. Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna*, pp.96–7.
87. Lieutenant-General N.G. Korsun, *Pervaya mirovaya voyna na kavkazskom fronte: Operativno-strategicheskiy ocherk* (Moskva: Voyennoye isdatel'stvo, 1946), p.30.
88. Ibid., pp.76, 81.
89. *Dokumenty i materialy po vneshney politike Zakavkazya i Gruzii* (Tiflis: 1919), p.61; cited by D.S. Zavriyev, *K noveyshey istorii severo-vostochnykh vilayetov Turtsii* (Tbilisi: Izdaniye Tbilisskogo Gosudarstvennogo Universiteta, 1947), p.44.
90. Zavriyev, *K noveyshey istorii*, p.41.
91. Lieutenant-Colonel Tverdokhlebov, 'Ocherk polozheniya 2-go. Erzerumskogo krepostnogo artilleriyskago polka so dnya ego sformirovaniya i do zanyatiya Erzeruma turetskimi voyskami 27 fevralya–12 marta, 1918 goda', in Azmi Süslü, *Ruslara Göre Ermenilerin Türklere Yaptıkları Mezalim* (Ankara: Ankara Üniversitesi Basımevi, 1987), p.112.
92. *Dokumenty i materialy po vneshney politike Zakavkazya i Gruzii*, pp.119–20; cited by Zavriyev, *K noveyshey istorii*, p.52.
93. Tverdokhlebov, p.124.
94. Ibid., p.132.
95. Arkhiv Vneshney politiki Rossii (AVPR), f.: Kantselyariya MID, 1895, d.46, t.2, L.505; cited by *Kurdskoye dvizheniye*, p.35.
96. Paskievitch to the Emperor, 21st Nov. 1828, *Akti Sobranniye Kavkazskoyou Arkheografitcheskoyou Komissieyou*, in 13 vols., Vol.VIII; cited by John F. Baddeley, *The Russian Conquest of the Caucasus* (Surrey: Curzon Press, 1999), p.201.
97. Ahmad, *Kurdistan during the First World War*, p.32.
98. *Kurdskoye dvizheniye*, p.33.
99. *Mezhdunarodnye otnosheniya v epokhu imperializma: Dokumenty iz arkhivov tsarskogo i vremennogo pravitel'stv, 1878–1917 g.g.*, Series III: 1914–1917 (Moscow: Gosudarstvennoye Sotsial'no-Ekonomicheskoye Izdatel'stvo, 1938), p.405.
100. See, for instance, Sonyel, *Minorities and the Destruction of the Ottoman Empire*, p.299.
101. Öke, p.14.
102. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, pp.76–7.
103. FO 371/2130/31341: Malet to Grey, 2.7.1914; cited by Sonyel, *Minorities and the Destruction of the Ottoman Empire*, p.392.
104. Ahmad, *Kurdistan during the First World War*, p.57.
105. TsGVIA SSSR, f.551, op.1, d.15, L.15; cited by Arutyunyan, *Kavkazskiy front*, p.355.
106. Korsun, *Pervaya mirovaya voyna*, p.68.
107. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.34.
108. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.43.
109. Ibid., p.89.
110. Ibid., p.144.
111. Ibid., p.143.
112. *Vtoraya Otechestvennaya voyna*, p.171.
113. Ibid., p.237.
114. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.110.
115. *Vtoraya Otechestvennaya voyna*, p.201.
116. J. Kirakosyan, *Zapadnaya Armeniya v gody pervoy mirovoy voyny* (Yerevan: Izdatel'stvo Yerevanskogo Universiteta, 1971), pp.414–5.
117. TsGIA Arm. SSR, f.113, op.1, d.769, L.18; cited by Arutyunyan, *Kavkazskiy front*, p.353.
118. Mason, 'Central Kurdistan', p.329.
119. Mayewski, p.97.
120. 'Preliminary Treaty of Peace between Russia and Turkey: Signed at San Stefano, 9 Feb.–3 March 1878', *American Journal of International Law*, Vol.2, Issue 4, Supplement: Official Documents (Oct. 1908), p.396 [emphasis added].
121. 'Treaty between Great Britain, Germany, Austria, France, Italy, Russia, and Turkey for the Settlement of Affairs in the East: Signed at Berlin, July 13, 1878', *American Journal of International Law*, Vol.2, Issue 4, Supplement: Official Documents (Oct. 1908), p.422.
122. Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna*, p.46.
123. S.F. Oreshkova and N. Yu. Ul'chenko, *Rossiya i Turtsiya (problemy formirovaniya granits)* (Moscow: Institut Vostokovedeniya RAN, 1999), p.76.
124. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.66.
125. Ibid., p.14.

126. Aytar, *Hamidiye Alaylarından Köy Koruculuğuna*, p.95.
127. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.74.
128. Ibid., p.76.
129. Ibid., p.74.
130. Mayewski, p.11.
131. Ahmad, *Kurdistan during the First World War*, p.148.
132. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.75, 77.
133. Ibid., p.46.
134. Ibid., p.28.
135. Ibid., p.32, 54.
136. Ibid., p.54.
137. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.104.
138. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, pp.65–6.
139. Ibid., p.42.
140. M.G. Nersisyan (ed.), *Genotsid armyan v Osmanskoy imperii: Sbornik dokumentov i materialov*, 2nd Edition (Yerevan: Izdatel'stvo 'Ayastan', 1983), pp.415–6.
141. A. Safrastian, *Kurds and Kurdistan* (London: 1948), p.73; cited by Kamal Madhar Ahmad, *Kurdistan during the First World War* (London: Saqi Books, 1994), p.66.
142. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.32.
143. TsGVIA, f. 2000s., op.1, d. 104, L. 122; cited by S.M. Akopyan, *Zapadnaya Armeniya v planakh imperialisticheskikh derzhav v period pervoy mirovoy voyny* (Yerevan: Izdatel'stvo Akademii Nauk Armyanskoy SSR, 1967), pp.159–60.
144. *Mezhdunarodnye otnosheniya v epokhu imperializma*, p.384.
145. *Vtoraya Otechestvennaya voyna*, pp.148–9.
146. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.28.
147. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.86.
148. Mayewski, pp.41, 43.
149. *Sbornik diplomaticheskikh dokumentov. Reformy v Armenii* (Saint-Petersburg: 1915), pp.61–68; cited by E.K. Sarkisyan, 'Armyanskiy vopros i Rossiya v 1912–1914 gg.', *Patma-banasirakan handes. Istoriko-filologicheskiy zhurnal* (1995), p.117.
150. E.A. Adamov, *Razdel Aziatskoy Turtsii po sekretnym dokumentam byvshego Ministerstva inostrannykh del* (Moscow: 1924), p.209.
151. TsGAOR SSSR, f. 579, op.1, d. 1880, L. 3 'Prikaz po Vanskomu otryadu ot 22 iyunya 1915 g.'; cited by Arutyunyan, *Kavkazskiy front*, p.368.
152. Arutyunyan, *Kavkazskiy front*, p.341.
153. Akopyan, *Zapadnaya Armeniya*, p.182.
154. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.85.
155. Driver, 'Studies in Kurdish History', p.495.
156. Bekgulyants, *Po Turetskoy Armenii*, p.90.
157. Ibid, pp.90–1.
158. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.31.
159. Adamov, *Razdel Aziatskoy Turtsii*, pp.208–9 [emphasis added].
160. Cf. Arutyunyan, *Kavkazskiy front*, p.347 and Driver, 'Studies in Kurdish History', p.495.
161. Rudi Paul Lindner, 'What Was a Nomadic Tribe', *Comparative Studies in Society and History*, Vol.24, Issue 4 (Oct. 1982), p.689.
162. Akopyan, *Zapadnaya Armeniya*, p.162.
163. Gordlevskiy, 'U sipandagskikh kurdov', p.34.
164. Yeliseyev, *Kazaki na kavkazskom fronte*, p.144.

# کەرکووک
# لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامدا

نووسینی: ج.ھ.کرامرز-[تۆما بوا]
و. لە فەرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا

## پێشبار

"ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام" یەکێکە لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی، کە بۆ لێکۆڵینەوە و نووسینەوەی مێژووی جیهانی ئیسلام کارێکی زانستیی کەم وێنەیە. ئەم سەرچاوە زانستییە کە لەوەتای ساڵی ١٩١٣-١٩٣٨ەوە نووسراوەتەوە، ساڵ بە ساڵ پاکنووس و ڕاستکردنەوەی بۆ دەکرێت و لێی زیاد دەکرێ، بووەتە یەکێك لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە جێگەی پشت پێبەستنە. بەشی کورد لەم ئینسیکلۆپیدیایەدا زۆر بەرچاوە و کۆمەڵێك مەتریاڵ و کەرەستەی زۆر پڕ بایەخ لەناو ئەم ئینسیکلۆپیدیایەدا لە بارەی هۆز، شار، شارۆچکە، ئایین، ئاینزا کوردییەکان دەبینرێن، کە هەق وایە تا ئەو کاتەی هەموو ئینسیکلۆپیدیایەکە بەسەر یەکەوە دەکرێتە کوردی هەر هیچ نەبێ ئەوەی تایبەتە بە کورد و کوردستان بکرێتە کوردی. لێرەدا ئەم وتارەی کە تایبەتە بە شاری کەرکووك دەکەینە


ج. ھ. کرامرز (١٨٩١- ١٩٥١)

کوردی. ئەم وتارە لە نووسینی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی هۆڵەندی ج. ھ. کرامرز (١٨٩١- ١٩٥١)[1]ە و لە چاپەکانی یەکەمی ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامدا (١٩١٣-١٩٣٨)، بەرگی دووەم (١٩٢٧) بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە چاپەکانی دواتردا ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسایی تۆما بوا (١٩٠٠-١٩٧٥) زانیاری زیادەی خستۆتە سەر و زانیارییەکانی تازە

کردوونەتەوە، بۆیە لە چاپی دووەمی فەرەنسایی ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام (١٩٥٤-٢٠٠٥)، بەرگی پێنجەم (١٩٨٦)، لە کۆتایی وتارەکەدا ناوی تۆما بوا لە دوای ناوی ج. هـ. کرامرز خراوەتە ناو دوو کەوانە، بەو واتایەی، کە بە زانیارییەکاندا چۆتەوە.(وەرگێڕ).

## کەرکووک

کەرکووک KIRKÛk: یەکێك لە گەورەترین شارەکانی ناوچەی میزۆپۆتامیایە (کەوتۆتە سەر هێڵی ٤٤° ٢٥´ لە ڕۆژهەڵات، ٣٥° ٢٥´ لە باکوور)، زێی بچووك لە باکووری-ڕۆژئاوا، چیای حەمرین لە باشووری-ڕۆژئاوا، دیالە لە باشووری-ڕۆژهەڵات و زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لە باکووری ڕۆژهەڵات دەوریان داوە. لە لایەن بڕێك نووسەران (بۆ نموونە س. ژ. گاد و سیدنی سمیت)[٢] وەکو شوێنی شاری کۆنی (ئەرابخا) دەستنیشان کراوە. کەرکووک بەشداری لە شۆڕشی کورێکی شەلمانسەری دووەم (٨٥٨-٨٢٤ ی پ.ز) دا کردووە دژی باوکە پیرەکەی. کەرکووك جارێکی دیکە لەژێر حوکمڕانیی ئاشوور-دانی سێیەم (٧٧١-٧٥٤ ی پ.ز) ڕاپەڕیوە. پێش ئەوەی کەرکووك لەلایەن کەیخوسرەوی[٣] پاتشای مادەکان لە کۆتایی ساڵی ٦١٥ ی پ.ز داگیر بکرێت لەشکری سەرکەوتووی نەبووپۆلاسەر[٤] لە ساڵی ٦١٦ ی پ.ز ، بەناو شارەکەدا تێپەڕیوە[٥]. لە سەردەمی ئیمپراتۆریای کۆنی بابل و لە دەورانی ئاشووریشدا، چەندین جار شاری کەرکووك و هەموو دەوروبەرەکەی بەرەو ڕووی لەشکرکێشیی گەلانی چیانشینی لای باکووری-ڕۆژهەڵات بۆتەوە. لە دەورانی ساسانیدا (٢٢٦-٦٥١ ی زاییندا، بە مەڵبەندی کەرکووك گوتراوە هەرێمی گەرمەکان (لەلایەن مێژوونووسی ئەرمەنی موسی خۆرین)، لە سەرچاوە سریانییەکاندا بەناوی (بێت گەرماBēthGarmaï)ی ناوی هاتووە. لە هەمان ئەو سەرچاوانەدا، شاری کەرکووك


ENCYCLOPÉDIE DE L'ISLAM
NOUVELLE ÉDITION
ÉTABLIE AVEC LE CONCOURS DES PRINCIPAUX ORIENTALISTES
PAR
C. E. BOSWORTH, E. VAN DONZEL, B. LEWIS ET CH. PELLAT
TOME V
LEIDEN E. J. BRILL
PARIS ÉDITIONS G.-P. MAISONNEUVE & LAROSE S.A.
1980

ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام ١٩٨٠
(چاپی فەرەنسی)

بەناوی (کەرخای بێت سلوق) ناوی هاتووە[٦]. ئەم ناوانەی کەرکووك لەلایەن نیکاتۆری پاتشای سلوقی یەکەم (دەوروبەری ٢٥٥–٢٨٠ ی پ.ز)ەوە لێنراوە، کە لەناو قەڵاکەدا بورجێکی دروست کردووە و تەنانەت لە دەورانی ساسانییەکاندا کەرکووك هێشتا هەر ناوەندێکی بەناوبانگی نەستوورییەکان بووە، سەرۆکی ئەسقەفەکانی (بێت گەرما)ی تێدا ژیاوە[٧]. مەسیحییەکان لە دەورانی شاپووری دووەمدا لەوە کەمتر بەرەو ڕووی چەوساندنەوە نەبوونەتەوە بە تایبەت لە ساڵی ٤٤٥، چەوساندنەوەی مەسیحییەکان لە دەورانی یەزدگەردی دووەمدا، چەندان هەزار قوربانی لێکەوتەوە[٨]. دواتر ڕەوشی مەسیحییەکان چاکتر بووە، چونکە لە دەورانی شۆسرۆسی دووەم (٥٩٠–٦٢٨ ی زایین)، یەکێك لە مەسیحییەکانی شارەکە، بەناوی یەزدین کراوە بە وەزیری دارایی ، ئەوهێندە بەناو و شۆرەت بوو، تەنانەت زێدی لە دایکبوونی بۆ ماوەیەك ناوی (کەرخی یەزدین)ی بەخۆوە گرتبوو[٩]. مێژوونووسە عەرەبەکان بەناوچەی (بێت گەرما)ی سەرچاوە ئاشوورییەکان دەڵێن (بادجرمای). یاقووت باسی شارێك دەکات بەناوی (کەرخینە)[١٠] کە هۆفمان[١١] پێی وایە و ڕێك بە شاری کەرکووکی دەناسێتەوە. ڕاستییەکەی ئەمڕۆ هێشتاکە، خەڵکی شەقڵاوە و عەنکاوە کە سەفەری کەرکووك دەکەن دەڵێن دەچین بۆ (کەرخینە)[١٢].



لاپەڕە ١٤٧ی وتاری کەرکووك بەفەرەنسی

لە سەدەی شەشەمی (کۆچی)/دوانزەهەمی (زایینی)، ناوچەی کەرکووك سەر بەو زەویوزارانە بوو کە لەژێر دەسەڵاتی میرنشینی بەگتاکییەکاندا بوو، کە شوێنی دانیشتنیان لە ئەربیل بوو. دوای مردنی موزەفەرەدین گۆگبوری لە ٦٢٩ك/١٢٣٢ز، موڵك و قەڵەمڕەوی ئەم میرنشینە خرایەوە سەر قەڵەمڕەوی خەلیفەی عەباسییەکان، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم،شاڵاوی داگیرکردنەکانی مەگۆڵەکانی بەدوادا هات. ناوی کەرکووك بۆیەکەم جار لە مێژووی تەیموری شەرەف ئەلدین عەلی یەزدی[١٣]دا هاتووە. دواتر دەورانی حوکمڕانیی ئاق

قۆینلوەکان دێت، دوای ئەوە داگیرکردنەکانی میزۆپۆتامیا لە لایەن شا ئیسماعیلی یەکەم لە ساڵانی یەکەمی سەدەی شانزەیەمدا پەلاماری شا ئیسماعیلی یەکەمی بەدواداهات. کاتێکیش دواجار میزۆپۆتامیا و عێراق کەوتنە بندەستی سوڵتانەکانی عوسمانی، سوڵتان سەلیمی یەکەم و سوڵتان سولێمانی یەکەم (یەکەمین پەیماننامەی ئاشتی تورکی–ئێرانی لە ٢٩ ی ئایاری ١٥٥٥ لە ئەماسییە مۆرکرا). کەرکووك ڕۆڵی کۆنی خۆی وەك قەڵایێکی گرینگ دژ بە دوژمنی ڕۆژهەڵات وەرگرتەوە[١٤]. دوای کەوتنی بەغدا لە ساڵی ١٠٣٢ك/١٦٢٣ز، شارەکە سەرلەنوێ کەوتەوە بندەستی ئێرانییەکان. بەڵام خەسرەو پاشا لە ساڵی ١٦٣٠ دووبارە شارەکەی داگیر کردەوە. لە ساڵی ١٦٣٨ سوڵتان مورادی چوارەم لە کاتی لەشکرکێشی بۆ دووبارە داگیرکردنەوەی بەغدا، بەناو شاری کەرکووکدا تێپەڕیوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەرداری ئەو دەروناوچەیە هەر ئاغا کوردە ناوخۆییەکانی هەرێمی ئەردەڵان بوون [١٥]. بەڵام کەمێك دواتر، لەسایەی جموجوولی پاشاکانی ئەیالەتی شارەزوور، دەسەڵاتی عوسمانی لە کەرکووکدا جێگیر بوو. ئەم ئەیالەتە لە (٣٢) سنجاق پێکهاتبوو، کە یەکێك لەو سنجاقانە شاری کەرکووك بوو.دوای ئەوەی قەڵای شارەزوور لە لایەن شا عەباس (١٥٧١–١٦٢٩)ەوە لەگەڵ زەوی تەخت کرا، ئەم شارە بووە نشینگەی پاتشایەتی شارەزوور[١٦]. لە ساڵی ١٧٣٢، نادر شا، کە هێشتا تاجی شایەتی لەسەر نەنابوو، بێهوودە شاری کەرکووکی گەمارۆدا. ساڵی دواتر شەڕێکی گەورە لە نزیك کەرکووك ڕوویدا، تێیدا تورکەکان بە تەواوی لەژێر سەرکردایەتی تۆپاڵ عوسمان پاشای سەرووەزیر (وەزیری ئەعزەم) تێکشکان. هەر لەو شەڕەدابوو، کە تۆپاڵ عوسمان سەری تێداچوو. لە ساڵی ١٧٤٣ کەرکووك سەرلەنوێ کەوتەوە بندەستی ئێرانییەکان، بەڵام لە دوای مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتی ساڵی ١٧٤٦ دووبارە گەڕایەوە بۆ ژێردەستی تورکەکان و شارەکە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، هەر لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا مایەوە. لە ٧ی ئایاری ١٩١٨ کەرکووك لە لایەن ئینگلیزەکانەوە داگیرکرا، بەڵام لە دوای ١٥ ڕۆژ چۆڵیان کرد تا لە کۆتایی تشرینی یەکەم ئینگلیزەکان دووبارە لە سەروبەندی ئاگربەسی مودرۆسدا داگیریان کردەوە. شاری کەرکووك لە دەرەوەی دەسەڵاتی شێخ

مەحموود بوو (تشرینی دووەمی ١٩١٨–ئایاری ١٩١٩)، لەم ماوەیەدا کەرکووك و هەرێمەکانی بەهێمنی بەڕێوە دەبردران. ڕۆژنامەیەك بە زمانی تورکی تێدا بڵاو دەکرایەوە و (١٦) قوتابخانەی تێدا کرایەوە. لە سەروبەندی ڕاپرسی لە تەمووزی ١٩٢١ دا، کەرکووك مەلیك فەیسەڵی یەکەمی وەك پاتشای عێراق ڕەت کردەوە. لەوساوە پرۆپاگەندەی تورکەکان لە ناوچەکەدا پەرەی سەند، کە لە لایەن لێژنەیەکی تورکی بە پشتگیری بنەماڵەی نەفتچیزادە و چەند بنەماڵەیەکی تورکخوای دیکەوە پشتگیری دەکرا، بەڕێوە دەچوو. لە ١٧ ی ئاداری ١٩٢٢، تورکەکان قایمقامێکیان لە ڕەواندز دانا و لە کۆتایی تەمووزیشدا کۆلۆنێل عەلی شەفیق، ناسراو بە ئۆزدەمیر یان پیاوە ئاسنینەکە، لە ویلایەتەکە بڕێك پێشوەچوونی بەدەست هێنا، بەڵام نەیتوانی هەموو ویلایەتی مووسڵ بگرێتەوە، کە تورکەکان بە بێ سەرکەوتن لە کۆنفرانسی لۆزاندا (٢٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢–٢ ی شوباتی ١٩٢٣) داوایان دەکردەوە. پەیماننامەی لۆزان (٢٤ ی تەمووزی ١٩٢٣) پرسی ویلایەتی مووسڵی بە بێ چارەسەری بە هەڵواسراوەیی هێشتەوە و خستییە بەردەم کۆمەڵەی گەلان. کۆمەڵەی گەلانیش کۆمسیۆنێکی بەدواداچوونی بۆ ناوچەکە ڕەوانە کرد و لە کاتی کۆبوونەوەی (٣٧)ەمینی وەرزی خۆیدا، کە لە ١٦ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ لە جنێڤ بەسترا، ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان، بە یەکجارەکی پرسەکەی چارەسەر کرد بە بەخشینی هەموو ئەو زەویوزارانەی کە کەوتبوونە باشووری هێڵی ناسراو بە هێڵی برۆکسێل بە عێراق. لەو ساتەوە کەرکووك کەوتە ناو پاتشانشینی عێراقەوە.

شاری ئێستای کەرکووك بەشێکی لەسەر گردێکی دەستکرد یان قەڵایەك، کە بە بەرزی چل مەترێك بونیات نراوە و بەشێکی دیکەشی لە خوارەوەدا کەوتۆتە سەر کەناری دوو ڕووباری خاسە چای، کە ئاوەکەی تێکەڵ بە ئاوەسپی دەبێ، دواتر ڕووباری عوزێم پێك دەهێنن و لە ٣٠ کیلۆمەتری باشووری بەلەدەوە دەڕژێنە ناو ڕووباری دیجلەوە. لەسەر کەناری ڕاستی خاسەچای، لەناوەڕاستی سەوزاییەکدا، گەڕەکی نشینگەیی عەرەفەی لێیە. دانیشتوانی شاری کەرکووك لە ساڵی ١٩٢٢ لە لایەن ئی. بی. سۆن[١٧] بە (١٥٠٠٠) پانزە هەزار کەس و ساڵی ١٩٢٢ لە لایەن ئیدمۆندز بە (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هەزار کەس خەمڵێنراوە. ساڵی

١٩٦٥ ئامارە ڕەسمییەکان، بە لەبەرچاوگرتنی پێوەری زمانی دایك، ژمارەی دانیشتوانی شارەکەیان بە (٢٨٤٠٠٠) دووسەدو هەشتاو چوار هەزار کەس داناوە، لەوانە حەفتاو یەك هەزاری (٧١٠٠٠) کورد، پەنجاو پێنج هەزاری (٥٥٠٠٠) تورکمان و چل و یەك هەزاری (٤١٠٠٠) عەرەب بوون. دانیشتوانی ئێستای کەرکووك[18] بە دڵنیاییەوە لە دووسەد هەزار ( ٢٠٠٠٠٠ ) کەس زیاترە و دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، کە لەوەتای چەند ساڵێکە دەسەڵاتکاران بایەخێکی زۆر تایبەت دەدەن بەوەی کوردەکان کۆچ پێبکەن و شوێنەکانیان بە عەرەب بگرنەوە. کەرکووك ناوەندی ئیداری لیوایە و لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بووە بە پارێزگا[19]. بۆ یادکردنەوەی خۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی نەوت لە (١) ی حوزەیرانی ١٩٧٢، هەروەها بە مەبەستی لە کوردیی شۆردنەوەی ناوی شارەکە، لەوەبەدوا ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (ئەلتەئمیم) کە بە واتای (خۆماڵیکردن)[20] دێت ( کەچی وێڕای ئەمانە شارەکە تایبەتمەندێتیی خۆی هەر پاراست). ژمارەی دانیشتوانی پارێزگاکە بە خێرایی لە سایەی پەرەسەندنی پیشەسازی نەوت زیادی کرد. لە ساڵی ١٩٥٧ ژمارەی دانیشتوانی شارەکە لە سێسەد و هەشتاو هەشت و نۆسەد هەزار (٣٨٨٩٠٠) کەسەوە گەیشتە پێنجسەد و بیست و سێ هەزار (٥٢٣٠٠٠) کەس لە ساڵی ١٩٧٠. لەگەڵ زۆرینەیەکی کوردی، لە کەرکووك کورد، عەرەب و تورکمانەکانی شارەکە موسڵمانی سوننە مەزهەبن، بەڵام تورکمانی ئاواییەکان سەر بە مەزهەبێکی تایبەتی ئایینی (لە ئایین هەڵگەڕاوە hétérodox) و نهێنی قزڵباشن[21]. مەسیحییەکان زۆرینەیان کلدانین (نزیکەی ٤٥٠٠ کەسن) کە مەترانێك (ئارشەڤێك) و ژمارەیەك قەشەیان هەیە. نەستوورییەکان قەشەیەکیان هەیە لە هەریر دادەنیشێت. کۆلۆنییەکی بچووکی جوولەکە، کە بریتیین لە بازرگانەکان لەشارەکە نیشتەجێن، یەکێکیان لێ بوو بە ئەندامی پەرلەمان لە بەغدا و یەکێکیشیان بوو بە بەڕێوەبەری ئیدارەخانەی دارایی لە لیوای کەرکووك، ئەم کۆلۆنییە جوولەکەیە لە ڕۆژگاری جەنگی ئیسرائیل–عەرەب (١٩٤٨) شارەکەیان جێهێشتووە. ئەو جوولەکانە باوەڕیان وابوو ئەوان نەوەی ئەو جوولەکانەن، کە نەبوخوزنەسر دوای داگیرکردنی ئۆرشەلیم (٥٨٦ ی پێش زایین) هێناونی بۆ بابل. ئەوان بە زمانی ئارامی دەدوان. لە مزگەوتی بچووکی نەبی دانیال، کە دەکەوێتە سەر قەڵای

کەرکووك، یادی ئەم پێغەمبەرە جوولەکەیان دەکردەوە، کە لە هەمان دەوراندا کۆچی پێ کراوە. هەروەها لە شارەکەدا تاوەکو ساڵی ١٧٠٠ کنێسەیەکی کۆن و بەهەمان شێوە مزگەوتی(ئولو جامیع)'UluDjâmi یشی لێ بووە. بەڵام کۆنترین کنێسە لە جیهان کنێسەی شەهید مار *تەممازگەردە*Mar Tahmazgerd، کە لەلایەن سەرۆکی قەشەکان لە دەوروبەری ٤٧٠ ی زایینی لە ڕۆژهەڵاتی قەڵای کەرکووك بونیات نراوە و بە ناوی "شەهادەتی *گەورە*Garand Martyrion" ناسراوە، لەکاتی کشانەوەی لەشکری تورکەکان لە ساڵی ١٩١٨ لە سۆنگەی ئەو تەقەمەنییانەی کە ئاخنیبوویانە ناویەوە تەقێنرایەوە[٢٢]. نەخشەی شارنشینی کەرکووك وای کردووە شارەکە ببێتە ناوەندێکی گرینگی ڕێگەوبانی پانوپۆر. مەسیحییەکان لە دەورانێکی هەرە کۆنەوە لە شارەکەدا جێگیر بوون، وا دیارە لە سەرەتاوە لەگەڵ زۆر و کەمی گرینگیدا لە شارەکە ماونەتەوە. هەرچی سەبارەت بە تورکمانەکانە، ئامادەبوونی نا ئاساییان لە کەرکووك و ناوچەکانی دەوروبەریدا لەناو گرۆبەندییەکی کوردیدا، بەڕای برێك لە توێژەرەوەکان دەگەڕێتەوە بۆ پێش داگیرکردنی شارەکە لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەکانەوە. سەبارەت بە بنەچەکەیان دەبێ لەناو ئەو ئۆردووە تورکییانە بگەڕێین کە خەلیفەکانی عوسمانی لە سەدەی سێیەم/نۆیەم بۆ ناو شارەکە کۆچیان پێکردوون، یان لەناو ئەو کۆچپێکردنانەی سەلجووقی و بەکتاییەکان و ئەتابەگییەکانی ئەربیل[٢٣] بگەڕێین. هاتنیان بۆ ناوچەکە هەر چۆنێك بێت، ئەوا تورکمانەکانی کەرکووك هەمیشە پشتیوانێکی بەهێز بوون بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی و فەرهەنگەکەیی و سەرچاوەیەکی بە پیت بوون بۆ فەرمانکارە عوسمانییەکان [٢٤].

ڕەوشی بەڕێوەبەرایەتی کەرکووك بەگوێرەی سەدەکان جیاواز بووە. "لە سەدەی هەشتەم کەرکووك ناوەندی–ئیداری ئەیالەتی شارەزوور بووە، کە لیوا تازەکانی کەرکووك و ئەربیل و (بەشێوەیەکی ڕووکەشیش) سلێمانی دەگرتەوە، کە لەژێر قەڵەمڕۆی موتەسەلیمێك کە لە لایەن بەغداوە دیار دەکرا، بەڕێوە دەبردرا. لەگەڵ چاکسازییەکانی مەدحەت پاشای والی بەغدا لە ١٨٦٩ تا ١٨٧٢، ناوی شارەزووری بە سنجاقی کەرکووك بەخشی، کە لیواکانی ئێستای کەرکووك و ئەربیلی دەگرتەوە، لە کاتێکدا کە شارەزووری مێژوویی لە دەرەوەی سنجاقی

نوێی سلێمانی مایەوە. ویلایەتی مووسڵ لە ساڵی ١٨٧٩ پێکهات و کەرکووک وەك شارێکی گرینگی سەربازیی مایەوە"[٢٥]. لە دەورانی تورکەکاندا ویلایەتی مووسڵ دابەشی سەر سێ سنجاق یان لیوا کرابوو: مووسڵ، کەرکووک و سلێمانی. لە ساڵی ١٩١٨، سێ قەزا لە باکووری زێی بچووك لە کەرکووك جودا کرانەوە بۆ ئەوەی لیوای ئەربیلی لێوە دروست بکەن. لە دەستووری ساڵی ١٩٢٥ ی دەوڵەتی نوێی عێراقدا، کە لە سێ ویلایەتی عوسمانی: ویلایەتی بەغدا کە بوو بە پایتەخت و بەسرە و مووسڵ پێکهات، لیوای کەرکووك لە(١٤) قەزا پێکهاتبوو: کەرکووك، کفری، چەمچەماڵ و گل. ئەمڕۆ پارێزگای ئەلتەئمیم[٢٦](کەرکووك) لەژێر دەسەڵاتی پارێزگارێك (موحافیز) دایە، پێنج قەزا دەگرێتەوە خۆ، کە بریتیین لە قەزاکانی: کەرکووك، توزخورماتوو، چەمچەماڵ، حەویجە و کفری[٢٧]. هەر قەزایەك قایمقامێك بەڕێوەی دەبات. قەزای کەرکووك لە پێنج ناحیە پێك دێت کە بریتیین لە ناحیەکانی: تازەخورماتوو، قەرەحەسەن، ئاڵتوون کۆپری، دبس و شوان. ناحیە لە لایەن مودیر ناحیە بەڕێوە دەبردرێت. کەرکووك دادگەیەکی بەرایی و دادگەیەکی تێهەڵچوونەوە و ئۆردوویەك و فڕۆکەخانەیەکی لێیە. هەروەها بارەگای یەکێتی نووسەرانی تورکمانیشی لێیە.

کەرکووك ناوەندێکی بازرگانی گرینگ و بازاڕێکی بەرهەمی کشتوکاڵی و دانەوێڵەیی و ئاژەڵی ناوچەکانی دەوروبەرییە. کەرکووك ڕێگەوبانی چاکی هەیە، بەرەو بەغدا لە ڕێگەی تاوق و کفری، بۆ مووسڵ لە ڕێگەی ئاڵتوون کۆپری-ئەربیل، بۆ سلێمانی لە ڕێگەی چەمچەماڵ و لەگەڵ درێژبوونەوەی ڕێگەکە بۆ سەنەندەج و هەمەدان لە ئێران. هێڵێکی ڕێگەی ئاسنینی شەمەندەفەری تەسك کەرکووك بە بەغدا لە باشوور و بە ئەربیل لە باکوورەوە دەبەستێتەوە[٢٨]. ئەو زەویوزارانەی کە لە دەوروبەری کەرکووکدان، بەزۆری زۆرینەیان کوردیان تێدا نیشتەجێن، بەڵام لە ڕۆژئاوای شارەکە پێدەشتی میزۆپۆتامیا دەست پێدەکات، کە بە ڕوویێکی تایبەت عەرەبەکانی تێدا دەژین، لە دەوروبەری شارەکەدا ڕاستەوخۆ میوەگەلێکی زۆر بەرهەم دەهێنرێن.

ناوچەی کەرکووك دەوڵەمەندە بە گۆگرد و کەرەسەتگەلی ئەسفەلتی و بە تایبەتیش چاڵگەی نەوت، کە لە دەورانی کۆنەوە دەرهێنراوە. پێویستە ئاماژە

بەوەش بکەین کەوا نەوتی بەدەستهاتوو هەر لە دەورانی عوسمانییەوە هێندێك گرینگیی خۆی هەر هەبووە: لە لایەن سوپاوە بەکارهێنراوە[٢٩]. فەرمانێك لە ساڵی ١٦٣٩ قۆرخی وەبەرهێنانی نەوتی بە تورکمانەکانی ناوچەی کەرکوك، نەفتچیزادەکان بەخشیوە. بەڵام وەبەرهێنانی رێکوپێکی چاڵگە نەوتییەکانی کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ ئاداری ١٩٢٥، ئەوکاتەی ئیمتیازی نەوت بە کۆمپانیایەکی نەوتی تورکی (T.P.C) درا، کە لە ساڵی ١٩١٤ دامەزرابوو، بۆ وەبەرهێنانی چاڵگە نەوتییەکانی هەردوو ویلایەتی مووسڵ و بەغدا لەسەر بنەمای مافی ئیمتیازی ٤ شیلینگ زێڕ بۆهەر تۆنێك نەوتی دەرهێنراو. پێش کۆتایی ساڵی ١٩٢٥ کاری جیۆلۆجی و ڕاکێشانی رێگەوبان لە ویلایەتی مووسڵ و دابینکردنی ئاو و دانانی بۆری نەوت و کاری بیناسازی دەست پێ کرد. پەنجا (٥٠) بەریتانی و دوو هەزار و پێنجسەد (٢٥٠٠) کرێکاری عێراقی دەستیان بە کارکردن کرد. شوێنەکانی بیرلێدان لە ناوچەی جەبەل حەمرین لەنزیك تووزخورماتووی دراوسێی کەرکوك دانران. هەڵمەتی هەڵکەندن لە نیسانی ١٩٢٧ لە لایەن مەلیك فەیسەڵی یەکەم کرایەوە و بۆ یەکەم جار نەوت لە ٢٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧ لە باباگوڕگوڕی نزیك کەرکوك هەڵقوڵی. ساڵانی ١٩٢٧ تا ١٩٣١ تەرخان کرابوو بۆ ئامادەکردنی ناوچەی کەرکوك بە ئامانجی بەرهەمهێنان، بۆ هەڵکەندن و بەدواداگەڕانی زانستی لەڕێگەی پەرەپێدانی خزمەتگوزارییەکانی پێویست: جێگیرکردنی بەرهەمهێنان، عەنبار، وەرشە، شوێنی نیشتەجێبوون هتد. لە هەمان کاتدا بۆ درێژکردنەوەی وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی عێراقی بە ئامانجی درێژکردنەوەی ماوەی دەستنیشانکردنی ئەو زەویوزارانەی، کە لەناو ڕێککەوتننامەی ١٩٢٥ دا هاتوون. لە ئاداری ١٩٣١ کۆمپانیاکە، کە لەوەتای ساڵی ١٩٢٩–وە بووە بە کۆمپانیای نەوتی عێراقی (I.P.C)، توانی لە هەموو ناوچەکانی باکووری–ڕۆژهەڵاتی عێراقدا وەبەرهێنان بکات، بەو مەرجەی لە ساڵی ١٩٣٥بۆرییەکی نەوت دروست بکات، کە بگاتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست بە توانای (٣) ملیۆن تۆن لەگەڵ بردنی لقێك بۆ (حەدیسە)، لەسەر ڕووباری فوراتەوە بەرەو (حەیفا) و (تەرابلووس) کە پشکی حکوومەتی عێراقی ساڵانە ٤٠٠٠٠٠ پاوەند بێت. هەر لە ساڵی ١٩٣١ ئیدارەخانەی گشتیی کۆمپانیای نەوتی عێراقی بۆ

وەبەرهێنان لـە توزخورمـاتووەوە گواسـترایەوە بـۆ کـەرکووك و هـەروەها ئـەوەی ئیدارەخانەی بۆرییە نەوتەکانیش لە حەیفا جێگیر کرا. وەبەرهێنانی نەوتی خـاوی کەرکووك لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٤ دەستی پێ کرد و لە سـاڵی ١٩٣٥ ەوە بەرهـەمی ساڵانەی گەیشتە ٤ ملیۆن تـۆن و عێراقـی گەیانـدە پلەبەنـدی هەشـتەمی وڵاتـانی نەوت بەرهەمهێن. لـە کـانوونی دووەمـی ١٩٣٥، لـە کـەرکووك ئاهـەنگی ڕەسمیـی کردنـەوەی بۆرییـەکی دووانـەی دوانـزە (١٢) ئینجـی بەسـتراو بـە دەریـای سـپی ناوەڕاست گەیەنرا. جەنگی ئیسرائیل–عەرەب لە ساڵی ١٩٤٨ وای کـرد ئـەو لقـەی کە بۆ حەیفا ڕاکێشرابوو بوەستێت، کە ئەمە بـوو بـە سـۆنگەی زیـانی (٧) ملیـۆن تۆن نەوت و مافی ئیمتیازی بەرانبەر. لـە ئەنجامـدا لـە سـاڵی ١٩٤٩، بـۆڕی نـەوتی بەرەو تەرابلوس، بۆرییەکی دیکەی (١٦) ئینجی بۆ زیاد کـرا (کـە ئەمـە بەرهـەم و وەبـەرهێنانی نـەوتی سـێ هێنـدە کـرد. لـە سـاڵی ١٩٥٢ سـێیەمین بـۆڕی نـەوت ئەمجارە بە (٣٠) ئینجی خرایە کار لەنێوان کەرکووك و بانیاس (سوریا). لەوسـاوە بازاڕی جیهانیی نەوتی عێراقی پەرەی سەند و ساڵانە گەیشتە ١٤ ملیۆن تـۆن. لـە ٣ ی شـــوباتی ١٩٥٢ ڕێککەوتننامەیـــەکی نـــوێ لـــەنێوان حکوومـــەتی عێـــراق و کۆمپانیـــای نـــەوتی عێراقـــی لـــەبارەی دووبـــارە دابەشـــکردنەوەی فەرمانبـــەران و بەرهەمهێنان و دەرامەتەوە مۆر کرا. بەو جۆرەی چاوەڕوان دەکـرا دەبـوو سـاڵانە ئاستی کەمیی بەرهەمهێنانی نەوت لەساڵی ١٩٥٣ بگاتە ٢٢ ملیـۆن تـۆن و داهـاتی نەوت لە ٣٠ ملیۆن پاوەند لە ساڵی ١٩٥٢–ەوە بگاتە ٦٠ ملیۆن پاوەنـد لـە سـاڵی ١٩٥٥. بەم شێوەیە قازانجی هـەردوو لا لـە بەرهـەمهێنانی نەوتـدا لەسـەر بنـەمای پەنجا بە پەنجا دابەش کرا.

شۆڕشـی ١٤ ی تـەمووزی ١٩٥٨ ی عێـراق ئـەم ڕێککەوتننامەیـەی نێـوان حکوومـەت و کۆمپانیـای نـەوتی دەسـتکاری نـەکرد. ئامـانج لـەوە بەدەسـتهێنانی بەرهەمهێنانی داهاتێکی (١٠٠) ملیۆن پاوەنـدی بـوو بـە توانـای (٧٠) ملیـۆن تـۆن ساڵانە. ئەوەبوو لەماوەی چوار ساڵدا بەو ئاستە گەیشـتن، بـەڵام هـەتا ئێسـتاش ژمارەیەك کێشەی پەیوەست بە لێکدانەوەی ڕێککەوتننامەکە هەر لـە ئارادایـە. لـە نیســانی ١٩٦١ گفتوگۆکــان دەســتیان پــێ کــردەوە، دوای چــەندین دابــڕان و سەرنەکەوتن دواجار بە دەرچوونی قانوونی ژمارە (٨٠) لە ١١ ی کانوونی یەکەمی

١٩٦١ کۆتـایی هـات، کـە لـە ٩٩,٥ %ی ئـەو زەوییانـەی کۆمپانیاکـان مـاف بەدواداگەڕانیان پێدرابوو، وەرگرتەوە. کۆمپانیای نەوتی عێراقی تەنیا (٢٢) خـاڵی هێشتەوە، لەوانـە (١٢) خاڵیـان لـە کـەرکووك بـوون، واتـە ڕووبـەری ٤٧٨,٧٥ کـم چوارگۆشە، (٦) خاڵ لە (بای حەسەن) واتە ١٨٢,٥ کم ی چوارگۆشە و (٤) خـاڵ لە (جمبوور)، واتە ٥,٨٦ کیلۆمەتری چوارگۆشە [٣٠]. لەنێوان مانگی ئایاری ١٩٦٤ و حـوزەیرانی ١٩٦٥ لـە چوارچـێوەی کۆمپانیـای نیشـتمانیی نـەوتی عێراقـی (I.N.O.C)، کە تازە دامەزرابوو (٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٢) گۆڕینکـاری نـوێ هاتنە ئاراوە. دواتر هەروەها دوای ئـەوەی قانوونگـەلی نـوێ دەرچـوون: قـانوونی ژمارە (٩٧) (٦ ی ئابی ١٩٦٧) ڕێگەی لەوە گرت هیچ ئیمتیـازاتێکی نـوێ بدرێتـە کۆمپانیا بێگانەکان و قانوونی ژمـارە (١٢٣) (تشـرینی یەکـەمی١٩٦٧) ڕێگـەی بـە (کۆمپانیای نەوتی نیشتمانیی عێراقـی I.N.O.C) دا مـاف وەبـەرهێنانی بـاقی ئـەو کەرتانەی پـێ بەخشـی کـە مابوونەتـەوە، کـە ئەمـە کۆتـایی بـەمۆنۆپۆلیزەکردنی بەرهەمهێنانی نەوتیی کۆمپانیای بێگانەی (کۆمپانیای نەوتی عێراقی I.P.C) هێنا. لە ١٤ ی حوزەیرانی ١٩٧٢ کۆمپانیای نـەوتی عێراقـی ئـەویش خۆمـاڵی کـرا، بـەم شێوەیە عێراق بە تەنیا خۆی بووە سەرداری بەرهەمە دەوڵەمەندییـەکانی نـەوتیی خـۆی. بەرهـەمی سـاڵانەی نـەوتی خـاوی عێـراق بەشـێوەیەکی بـەردەوام زیـادی دەکرد: لە (٤٧) ملیـۆن و ٥٠٠٠٠ تـۆن لـە سـاڵی ١٩٦٠، گەیشـتە زیـاتر لـە (١١٠) ملیۆن تۆن لە ساڵی ١٩٧٥، کە لەوەش (٦٠) ملیـۆن تـۆنی لـە ناوچـەی کـەرکووك بەرهەم هێنراوە. یەدەگی عێراق لە نەوتی خاو لـە سـاڵی ١٩٧٣ بـە چـوار ملیـار و ١٤٣ ملیۆن تۆن خەملێندراوە.

جا ئەگەرچی پیشەسـازی نـەوت و هـەموو ئـەو کارانـەی سەروسـاختیان بـەم پیشەسـازییەوە هـەبوو، ڕەوشـی کۆمەڵایـەتیی ئـەو کرێکارانـەی کـە کاریـان تێـدا دەکرد باشتر کرد، چونکە ئاستی ژیانیان لەچاو کرێکارەکانی دیکـەی وڵات بـەرزتر بوو، بەڵام ئەمە کۆتایی بەو جوولانەوانە نەهێنا، کە خاوەن مۆرکێکی کۆمەڵایـەتی بـوون. چـەندین پشـێویی گـرینگ لـەناو کرێکـارانی نـەوتی کەرکووکدا ڕوویـان دا. گەورەترینی ئەم پشێوییانە ئەوەبوو، لە ساڵی ١٩٣٧ ڕووی دا، کە هاوزەمـان بـوو لەگەڵ مانگرتنەکانی کرێکارانی بەنداوی کووت، مـانگرتنی کرێکـارانی بیرهەڵکـەن،

مـانگرتنی کرێکـارانی هێڵـی ئاسـنین، مانگرتنـەکانی کرێکـارانی ڕسـتنی نەجـەف، هـەموو ئـەم پشـێوییانە هۆشـیاریی کرێکـارانی سـەلماند و بـۆ خۆیـان چـەکێکی سیاسیی نوێ بوون[٣١]. لە تەممووزی ١٩٤٧ مانگرتنێکی ڕاستەقینە، کە لـە لایـەن سیاسەتوانانی ڕەوتی کۆمەنیستخوازەوە بەرپا کرا، لە کۆمپانیـای نـەوتی عێـراق، ژمارەیەك قوربانی لێکەوتەوە [٣٢].

پشێویگەلی دیکە، کە زیاتر سیمایەکی سیاسییان پێوە بوو، ڕوویان دا، تەنیا ڕاگەیانـدنی پەیماننامـەی پۆرتسـمۆس (١٥ ی کـانوونی دووەمـی ١٩٤٨) بـوو بـە سۆنگەی مانگرتنێکی گشتیی سێ ڕۆژە لە کەرکووك، کونسوڵی گشـتیی بـەریتانیا پەلامار درا. لە هەمووشی تراژیدیانەتر ئەوەبوو کە ناونرا بـوو بـە "پاکژکردنـەوەی کەرکووك"، کە چەند توخمێکی شیوعییەکان بە یاریدەی گرووپە کوردەکان[٣٣] بـە بۆنـەی یەکـەمین سـاڵوەگەڕی ڕاگەیانـدنی کۆمـار (١٤ی تـەممووزی ١٩٥٩) کوشتارگەیەکیان بۆ تورکمانەکانی شارەکە سـازکرد، کـە وەکـو دژە-کۆمەنیست ڕەفتاریان لەگەڵدا کردن[٣٤]. لەو کوشـتارگەیە ١٢٠ کـەس کـوژران و نزیکـەی سـەد کەسیش بریندار بوون. بەشداریکردنی کورد هـەر بەتـەنیا لەسـەر بنـەمای نـاکۆکی دژبەیەکی نەتەوەیی (کـورد/ تورکمـان) لێك نەدەدرایـەوە، بـەڵکو بـە کێبـەرکێی کۆمەڵایـەتیش لێـك دەدرایـەوە: تورکمانـەکان کـە لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و فەرهەنگییەوە زۆر پێشکەوتووتر بوون و بە لێوەشاییەوە وەزیفەی بەرزتریان لـە کۆمپانیای نەوتی عێراقیدا داگیرکردبوو، لەکاتێکدا کوردەکان دەبوو بە وەرگـرتنی وەزیفەی لاوەکی دەستبەردار بن [٣٥].

بەڵام نابێ ئەوەش لە بـیر بکرێـت کـەوا یـەکێك لـە ئاسـتەنگەکانی بـەردەم چارەسەرکردنی یەکجارەکیی پرسـی کـورد لـە عێـراق، بریتییـە لـە داخوازینامـەی کوردەکـان پەیوەسـت بـە ناوچـەکانی کـەرکووك و دەوروبـەری کـە دەیانـەوێ بیخەنەوە سەر خاکی کوردستانی خاوەن ئۆتۆنۆمی. ئەم داخوازییەش حکوومـەتی عێراق بە تەواوی ڕەتی دەکاتەوە. سەرژمێرییەك دەبوو لە تشرینی یەکەمی سـاڵی ١٩٧٠ بکرێت، ئەم خاڵە ناکۆکە چارەسەر بکات، بەڵام بۆ کاتێکی نادیار دواخرا[٣٦] کـە ئەمـە یـەکێك لـە هۆیـەکانی هەڵگیرسـانەوەی جـەنگ بـوو لـە ئـاداری ١٩٧٤، لەکاتێکدا کە حکوومەت دەستی کرد بە پیادەکردنی پەیماننامەی کوردی-عێراقـی

١١ ی ئاداری ١٩٧٠. قانوونی ١١ ی ئاداری ١٩٧٤ بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی ١٩٥٧[٣٧] ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەکانی کوردستان سەلماند. بەڵام ئەم ئامارانە لە دەورانی مەلەکیدا کرابوون لە کاتێکدا، کە کوردەکان دەترسان لەوەی خۆیان وەکو کورد ناونووس بکەن. بۆیە ئەمە زۆرینەی کوردی نەدایە شاری کەرکوك، بەم شێوەیە شارەکە نەچووە ناو چوارچێوەی ناوچەکانی حوکمی زاتییەوە.

یەکێك لە کەسایەتییە زۆر ناسراوەکانی کەرکوك شاعیری کورد شێخ ڕەزای تاڵەبانییە (دەوروبەری ١٨٣٧–١٩١٠)[٣٨]. کەم تا زۆر خۆنەویست و لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانداریکی دەمارگیر (فەناتیك)ە. ئەو کەسایەتییە ساتیریکە بەهرەی لە وتاردان و لە شیعری برێك جار ڕووهەڵماویشدا هەیە، شیعرەکانی بە کوردی، تورکی، فارسی و عەرەبی نووسیوە. ئەم شیعرانە ساڵەکانی ١٩٣٥ و ١٩٤٦ لە بەغدا چاپ کراون. شێخ ڕەزا یەکێکە لە شاعیرە هەرە ناسراوەکانی کوردستانی عێراق [٣٩].

**پەراوێزەکان:**

(١) جۆهانس هایندریك کرامرز Johannes Heindrik Kramers (٢٦ ی شوباتی ١٨٩١–١٦ ی کانوونی یەکەمی١٩٥١). یەکێك لە ڕۆژهەڵاتناسە گەورەکانی هۆڵەندییە. ساڵی ١٩٠٩ لە زانکۆی لیدن ڕۆژهەڵاتناسی دەخوێنێ و هەر لەو ساڵانەدا زمانەکانی: عەرەبی، فارسی و تورکی و شارستانیەتی ئیسلامی دەخوێنێ. لە ٥ ی ئاداری ١٩١٥ دکتۆرانامەکەی لە بواری قانوون بەدەست دەهێنێ. ساڵەکانی ١٩١٥–١٩٢٢ دەبێتە وەرگێڕ لە باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە ئەستەمووڵ. ساڵی ١٩٢٢ کورسی زمانی تورکی و فارسی لە زانکۆی لیدن وەردەگرێ و ساڵی ١٩٢٩ کورسی زمانی عەرەبی. خاوەن کۆمەڵێك بەرهەمی زۆری ڕۆژهەڵاتناسییە بە تایبەتیش لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام (چاپی یەکەم) لە بەرگی دووەم و سێیەمدا کۆمەڵێکی زۆر (دەروازە)ی ئینسیکلۆپیدیایی نووسیوە.

(2) C .J.Gadd, Rev .d’Assyr.et d’Archéol. Orient., et par Sidney Smith.

(٣) کەیخوسرەو یان هەوخوشترە، بە فەرەنسی کیاکسارCyaxar یەکێك لە بەهێزترین پاتشای مادەکان بووە (٦٢٥–٥٨٥ ی پ.ن)، (وەرگێڕ).

(٤) نەبووپۆلاسەر Nabopolassar یەکێك لە پاتشاکانی ئیمپراتۆریای دووەمی بابل بووە و باوکی مەلیکی مەزن نەبووخوزنەسر بووە و لە (٦٢٥—٦٠٥ ی پ.ز) حوکمڕانی بابلی کردووە، (وەرگێڕ).
(5) G.Roux ,Ancient Iraq, Londres, 1964, 247, 251, 312, 313
(6) Cf. Hoffmann, Aussügeaussyrischen A KienpersischerMârtyrer, dans Abh.für die Kunde des Morgenlands, VII/3 (1880), 267 sqq.
(7) J.M.Fiey, Assyrie chrétienne, III, Beyrouthn 1968.
(8) Fiey, Histoire de Karka d'BetSloh, dans Analecta Bolllandiana, LXXXII (1966), 203-209.
(9) Fiey, Assyrie, III, 23-8.
(١٠) یاقوت، ج ٤، ص: ٢٧٦
(١١) هەمان سەرچاوە، لا: 272
(12) Fiey, Assyrie, III, 44.
(13) Zafar-nâmah, composé vers 823/1424-5 ; trad. Petit de la Croix, Delft, 1723, II, 259.
(١٤) لێرەدا مەبەست لە دوژمنی ڕۆژهەلات، ئێرانە، (وەرگێڕ).
(١٥) خەلیفە، جهان نوما، ٤٤٥
(١٦) خەلیفە، جهان نوما، هەمان سەرچاوە
(17) E. B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, Londres 1912, 120.
(١٨) مەبەست ساڵی نووسینی وتارەکەیە، بە ئاگاداربوون لەوەی وتارەکە لە ساڵی ١٩٢٧ بڵاوبۆتەوە، (وەرگێڕ)
(١٩) کەرکووک ساڵی (١٩٦٤) لە سەردەمی کۆمارییەوە ناوەکەی لە لیواوە گۆڕدرا بۆ پارێزگا. (وەرگێڕ)
(٢٠) ئەم ناوە دوای ڕووخانی حکوومەتی بەعس (٢٠٠٣) لابرا و ناوی (کەرکووک) گەڕایەوە بۆ ناوی شارەکە، (وەرگێڕ).
(٢١) قزڵباش واتە (کڵاوسوور) بە زمانی تورکی. کۆمەڵێك ئێلی پەیڕەوکاری تەریقەتی سەفەوی بوون. هەروەها بەو سەربازە شیعانەش دەوترا، کە لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمی زایینییەوە وەکو سوپای ئێران بەکارهاتوون. بەگشتی ڕەوتێکی سۆفییانەی شیعەگەران و بە هیچ شێوەیەك لە ئایین هەڵگەڕاوە یان لە ئایین دەرچوو (هیترۆدۆکس) نین و موسڵمانی شیعە مەزهەبن، (وەرگێڕ).
(22) Edmonds, 267; Fiey, Assyrie, III, 54.
(٢٣) C. J. Edmonds, 267. ئیدمۆندز ئاماژە بە چەند ڕایەکی دیکەش دەکات
(24) TürkYurdu, 1915.

(25) Edmonds, 265-6.

(٢٦) ئەم زیادەیە لە نووسینی تۆما بوایە و مەبەست لێی دەورانی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ە، (وەرگێڕ)

(٢٧) ئەم دابەشکردنە بە مەبەستی سیاسی و گۆڕینی پێکهاتەی ئیتنیکی شارەکە لە رۆژگاری حکوومەتی بەعسدا کراوە، (وەرگێڕ).

(٢٨) ئەم هێڵە ئاسنینە دەمێکە نەماوە، (وەرگێڕ).

(29) V. J. Parry, Materials of War in the Ottoman Empire, Studies in the Economic History of the Middle East, 220.

(30) Vernier, 435

(31) Longrigg, Iraq, 252.

(32) Ibid, 338.

(٣٣) لە تێکستە فەڕەنسییەکەدا نووسراوە (باندە کوردەکان) کە ئەمە هەم بە واتەی گرووپ و هەم دەشێ بە واتەی (چەتە) و (ڕێگر)یش بەکاربێت، (وەرگێڕ).

(٣٤) ئەمە خوێندنەوەیەکی زۆر لایەنگیرانە و بە هیچ شێوەیەك باسی ئەوە نەکراوە کە کۆمیونیتەی تورکمانەکانی کەرکووك ئەوەندەی (قوربانی) ئەم ڕووداوە بوون ئەوەندەش زیاتر (هۆکاری) ئەم کوشتارگەیە بوون. ئەوان تەنیا لە پێناو پەیڕەوکردن و کلکایەتی کردن بۆ تورکیا سیاسەتێکی زۆر کورتبینانەیان پەیڕەو دەکرد، کە ئەمە دواجار سەری کرد بەوەی ئاگری ناکۆکی نێوان کەمینە نەتەوەکانی شارەکەی لێ بکەوتەوە، (وەرگێڕ).

(35) Khadduri, Republican Iraq, 125.

(36) E. O'Ballance, 161-162.

(٣٧) ئەم ئامارە باشترین ئامارە لە عیراق کراوە، کە هێشتا ئەوەندە گۆڕانکاری لەو وڵاتە نەکرابوو.

(٣٨) لە وتارەکەدا نووسەر بە هەڵە ساڵی لەدایکبوونی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە (دەوروبەری ساڵی ١٨٤٢) نووسیوە، کە ئەمە هەڵەیە و ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە ئێمە نووسیومانەتەوە، (وەرگێڕ).

(39) Cf. Soane, 134-135; Edmonds, 57-8, 290-5; Edmonds, A Kurdish lampoonist: ShaikhRizaTalabani," JRCAS, XXII,1, 111-27.

## بیبلیۆگرافیا

V.Cuinet, La Turquie d'Asie,11,Paris 1892,846,854 sqq.(Ritter s'appuie sur les observations des voyageurs Niebuhr, Shiel, Kerporter et Ainsworth); H. Pertermann, Reiseninorient,Leipzig 1861; Sarre-Herzfled, ArchaelogicheReisei, Euphrat-undTigrisgebiet,II,Berlin 1920,829 sqq.; E. B. Soane, To Mesopotamia and Kurdstan in disguise, Londres 1912,²1926;H. C. Lukas, Mosul and itsMinorities , Londres 1925; Société des Nations, Question de la frontière entre la Turquie et l'Irak, C.400,M.147,1925,VII,38; J. Labourt, Le Christianisme dans l'EmpirePerse, Paris 1904;C. J. Longrigg, Four Centuries of Modern Iraq, Oxford 1925; le même, Iraq 1900 to 1950. A political, social and economic History, Oxford 1953,²1956; le meme Oil in the middle East, Londres 1968; A. M. Hamilton,Road through Kurdistan, Londres 1937,1958;C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs.Politics, Travel and Rescarch in North-Eastern Iraq, 1919-1925, Oxford 1957;B.Vernier,L'Irakd'aujourd'hui, Paris 1963; MajidKhadduri, Republican Iraq.A study in Iraqi Politics since the Revolution of 1958,Oxford 1969;E.O'Ballance, The Kurdish Revolt 1961-1970, Londres 1973; Guide Bleu, Moyen-Orient, Liban, Syrie,Jordanie,Iraq,Iran,Paris 1965;Petroleum Tunes, 1950 sqq.

**سەرچاوە:**

J.H.Kramers [Th, Bois], "KIRKÜk", In Encyclopédie de l'islam (Nouvelle Edition), Tome V, Livraison 81-82, E.J.BRILL, Leiden & Editions G,-P. Maisonneuve & LAROSE S.A, Paris, 1980, pp : 146-149.

# هەنگاوێك  بە ڕێگەی ڕاستكردنەوەی
# مێژووی ڕۆژنامەی كوردستان- دەورەی دووەم
## ( ١٤ ی كانوونی دووەم-٨ ی نیسانی ١٩٠٩ )

د. نەجاتی عەبدوڵڵا

### بەرایی*

مێژووی ڕۆژنامەنووسیی كوردی وەكو بەشێك لە مێژووی كورد پڕییە لە حەشارگە و كەلێنی تاریك و نووتەك، كە تا ئێستا پسپۆرانی مێژووی ئەم بوارە نەیانتوانیوە پەی بەو هەموو حەشارگە زۆروزەوەندەیە ببەن و زۆر پرسیاریش هەن، كە هەر هیچ نەبێت لە ڕۆژی ئێستادا هەر بێ وەڵام ماونەتەوە. خۆشبەختانە لەم ساڵانەی دوایی لە سایەی دۆزینەوەی ژمارەیەكی (تاڕادەیەك) بەرچاوی ڕۆژنامە و گۆڤارە كوردییەكان وا خەریكە وێنەیەكی كەم تا زۆر دروست بۆ مێژووی ڕۆژنامەنووسیمان دروست دەبێت و تا دێت زیاتریش كەلێن و كونجە تاریكەكانی ئەم بوارە ڕووناكتر دەبنەوە.

لە ژمارە (٢٥) ی گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، برای بەڕێزم كاك عەبدوڵڵا زەنگەنە لە وتارێكدا بەناوی (دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیكەی ڕۆژنامەی كوردستان!)، لا: (١٢٩–١٣٦)، تەنیا (چوار) لاپەڕەی هەریەكە لە ژمارەكانی (٣) و (٤) ی ڕۆژنامەی كوردستان دەورەی دووەمی بڵاوكردۆتەوە و لەگەڵ خۆشیدا كۆمەڵێك پرسیاری ورووژاندووە، كە بە قسەی خۆی گوتەنی (لای ئێمە نەك هەر جێگەی سەرسوڕمانە، بەڵكو بۆتە مایەی نیگەرانیش!). ئێمە لەم وتارەدا هەوڵدەدەین بە هێمنی بەشوێن ئەو پرسیارانە بچین كە ناوبراو ورووژاندوویەتی و هەروەها هەوڵدەدەین بە پێی توانا سەرەداوی ئەو گرێكوێرانەش شی بكەینەوە كە بۆ زەنگەنەی خۆشەویست بووەتە مایەی (سەرسوڕمان و نیگەرانی).

* وەڵامی ئەم بابەتە ڕاستەوخۆ لە لاپەڕەكانی دواتر دانراوە .

## یەکەم:
## ڕۆژنامەی کوردستان
## دەورەی یەکەم ( پێنجشەممە: ۲۱ ی نیسانی ۱۸۹۸ )

نووسەر لە سەرەتای وتارەکەی نووسیویە: (*بەڵام ئەوەی لای ئێمە نەك هەر جێگای سەرسوڕمانە، بەڵکو بۆتە مایەی نیگەرانیش! ئەو ژمارەی (۱۳۱۳) یە، کە لەژێر لۆگۆی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە، دیارە ئەو ژمارەیەش ساڵی ڕۆمییەکەیە، کە لەسەر ڕووی ڕۆژنامەکانی ئەوسا دەنووسران. ئەگەر ئێوەش وەکو ئێمە بزانن ئەو ژمارەیەی (۱۳۱۳) یە ساڵی ڕۆمییە و ڕێك دەکاتە ساڵی (۱۸۹٦) ی زایینی، دڵنیام ئێوەش سەرتان سوڕدەمێنێت. خۆ ئەگەر تۆزەرێك بیەوێت ئەو نیگەرانییەمان بڕەوێنێتەوە بە پاساوی (هەڵەی چاپ) سەرسوڕمانەکەمان نەهێڵێت، زوو بە زوو پێی دەڵێین، باشە چ لەو هەردوو دەستەواژەی هەردوو زمانی تورکی و کوردییە بکەین، کە لە سەرەوەی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە کە ساڵی یازدەیە....)*[1]. ڕەنگە مرۆڤ لە خوێندنەوەی ئەم قسانەی سەرەوە کەمێك سەرسام بێت لەبەر ئەوە نا، کە کاك عەبدوڵڵا زەنگەنە کەوتووەتە ناو هەڵەیەکی گەورەی مێژوویی، کە بووەتە سەرچاوەی سەرسوڕمان و نیگەرانی بۆ خۆی، بەڵکو لە بەرئەوە بۆچی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیش هەستی بە هەڵەکانی نووسەر نەکردووە. من نازانم گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی چۆن ئەم هەڵە مێژووییەیان بەسەردا تێپەڕیوە، کە ساڵی (۱۳۱۳) ڕۆمی ڕێك بەرانبەر ساڵی (۱۸۹٦) زایینی دەوەستێ؟. من نازانم کاك عەبدوڵڵا لەسەر چ بنەمایەك و لە ڕووی کام سەرچاوەوە ساڵی (۱۳۱۳) ی ڕۆمی بەرانبەر بە ساڵی (۱۸۹٦) ی زایینی داناوە خۆزگە سەرچاوەکەی دەستنیشان دەکرد. جگە لەوە ساڵی ڕۆمی و ساڵی زایینی هیچ کات هاوتای یەك نین تا وا بە سووك و ئاسانی ساڵە زایینەکەی بەرانبەر دابنێ، ساڵی ڕۆمی هەمیشە بەر دوو ساڵی زایینی دەکەوێ، بەڵام لەم وتارە ڕێك تەنیا بەر ساڵی (۱۸۹٦) کەوتووە. بۆ ئەوەی سەرچاوەی نیگەرانییەکانی کاك زەنگەنەی خۆشەویست بڕەوێنمەوە وا بە وردی ساڵی (۱۳۱۳) ڕۆمی بەرانبەر ساڵی زایینی دەنووسمەوە: ( ساڵی ڕۆمی

هەمیشە لە (١)ی مانگی مارت دەست پێدەکات و لە ٢٨ ی شوباتی ساڵی دواتر کۆتایی دێت. بەم پێیە یەکەمین ڕۆژی ساڵی (١٣١٣) ی ڕۆمی دەکەوێتە بەرانبەر ڕۆژی شەممەی (١٣) ی مارتی ساڵی ١٨٩٧ تاوەکو ڕۆژی شەممەی (١٢) ی مارتی ساڵی (١٨٩٨)ی زایینی دەوەستێ، کە ئەو ڕۆژە دوایین ڕۆژی ساڵی (١٣١٣) ی ڕۆمییە. بەم شێوەیە دەبینین بە هیچ شێوەیەك یەك تاقە ڕۆژی ساڵی (١٣١٣) ی ڕۆمییش چییە ناکەوێتە ناو ساڵی (١٨٩٦) ی زایینی وەك ئەوەی کاك عەبدوڵڵا نیگەرانییەکانی خۆی لەسەر هەڵچنیوە. ئێستا ئەگەر بزانین یەکەمین ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ڕۆژی (پێنجشەممە، ٢١ ی نیسانی ١٨٩٨) دەرچووە ئەوا پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ساڵی (١٣١٣) ڕۆمی تاوەکو ڕۆژی شەممەی (١٢) ی مارتی ١٨٩٨ ی زایینی دەگرێتەوە، بەڵام یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لە (پێنجشەممە: ٢١ ی نیسانی ١٨٩٨) دەرچووە، واتە دروست تەنها (٣٩) ڕۆژی کەمە بۆ ئەم مێژووە. کاتێك سورەیا بەدرخان ساڵی (١٣١٣) ڕۆمی لەژێر لۆگۆی ڕۆژنامەکەیدا نووسیوە بەهیچ شێوەیەك بەهەڵەدا نەچووە و درکی بەوە کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارە یەکی ڕۆژنامەی کوردستان دەورەی دووەم لە ڕۆژی پێنجشەممەی (١) ی کانوونی سانی ساڵی ڕۆمی (١٣٢٤) دەرچووە و لەبەر ئەوەش ڕۆژنامەکەی خۆی بە درێژەپێدەری (کوردستان) ی خولی یەکەم زانیوە. بۆیە سەروبەندی مانگی دەرچوونی ئەم ژمارەیەی دەورەی دووەم ڕێك بەر ساڵی ڕۆمی (١٣١٣) ی ئەو ساڵە دەوەستێ بۆیە ساڵی (١٣١٣) ی ڕۆمی داناوە، لەسەر بنەمای ئەم ڕاستییانە سورەیا بەدرخان هیچ بە هەڵەدا نەچووە کە ئەم مێژووە ڕۆمییەی داناوە. ئەوە ڕێك لەو ماوەیەی کە دەورەی دووەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) ی لێ دەرچووە دەکاتە یانزە ساڵی ڕەبەق و بۆیە، کە سورەیا بەدرخان لەسەرووی ڕۆژنامەی کوردستان (دەورەی دووەم) نووسیویە (ساڵی یازدە) (اون برنجی سنە—ساڵا یازدەیی) هەر زۆر زیرەکانە ساڵی (١٣١٣) ی ڕۆمییەکەی داناوە کە ڕێك بەرانبەر کانوونی سانی ساڵی ( (١٣٢٤) ڕۆمی دەکاتە (یانزە ساڵی ڕەبەق). بۆیە سورەیا دروست ساڵی (١٣١٣) ڕۆمی بۆ ڕۆژنامەی کوردستان (دەورەی یەکەم) داناوە و بەگوێرەی دەرچوونی یەکەمین ژمارەی کوردستان (دەورەی دووەم) ڕێك ئەوساڵە بەرانبەر یانزەهەمین ساڵی دەرچوونی

ڕۆژنامــەی كوردســتان دەوەســتێ و ئــەو ڕۆژنامەكــەی خــۆی بــە درێژەپێــدەری كوردستان زانیوە. كاتێكیش سورەیا نووسیویە سالی یازدەهەم ئەوە بە هیچ شێوەیەك بەو مانایە نییە، كە ڕۆژنامەی كوردستان هەر ئەو یانزە ساڵە بەردەوام بووە، بەڵكو تەنها ئەوە دەگەیەنێ كە رۆژنامەكە بۆ یەكەم جار بەر لە (یانزە) بڵاوبۆتــەوە و هــەمووشمان دەزانــین دوا ژمــارەی رۆژنامــەی كوردســتان دەورەی یەكـــەم (ژمـــارە (٣١) و لـــە ڕۆژی دووشـــەممە١٤ ی نیســـانی ســـاڵی ١٩٠٢) بڵاوكراوەتەوە.

ڕاسـتییەكەی سـورەیا بـەدرخان یـەكێك لـەو بـەگزادە و مێـژوونووس و ڕۆژنامـەوان و سـەركردە كوردانـە بـوو كـە دركـی بـەوە كردبـوو كـورد چـەندە لـە كاروانی شارستانی بە دواكەوتووە، چاوپێداخشانێك بەو نامە فەرەنسییانەی كە بۆ دەسەڵاتكارانی ئینگلیز و فەرەنسای بەرزكردۆتەوە دەبینین هەمیشە هـەوڵی داوە وێنەیەكی زۆر بەرچاوی (كورد) بە دەستەوە بدات و كورد بە خاوەنی (شارستانی) و (پێشكەوتوو) لە قەڵەم بدات، (نەتەوەیەك) كە هیچـی كـەمتر نـەبێت لـە گـەلانی دیكەی ناوچەكە. سورەیا یەكێك لە خوێنـدەوار و مێژوونووسـە زۆر هوشـیارەكانی سەردەمی خۆی بووە، دەیتوانی لەبەرانبەر ساڵی دەرچوونی ڕۆژنامەی كوردستان خولی یەكەم ساڵی (١٣١٤) ی ڕۆمی بنووسێ، كە ڕێك ئەو ساڵە بەرانبـەر ( ١٣ ی مارتی ١٨٩٨ تـاوەكو ١٢ ی مـارتی ١٨٩٩) دەوەسـتێ، بـەڵام ئەوسـا دەبوایـە لـە برێتی ساڵی (یازدە) بنووسێ ساڵی (دەیـەم). بـە لەبەرچـاوگرتنی ئـەم ڕاسـتییانە مرۆڤ دەگاتە ئـەو ڕاسـتییەی كـە بـەڵێ سـورەیا بـەدرخان هـەقی بـووە كـە سـاڵی (١٣١٣) ی ڕۆمـی بـۆ سـاڵی دەرچـوونی یەكـەمین ڕۆژنامـەی كوردسـتان دانـاوە، چونكە نەیویستووە تەنها بۆ (٣٩) ڕۆژ، ساڵێكی تەمەنی ڕۆژنامەكە كەم بكاتەوە، كە دیارە بەلای ئەو گرینگ بووە تەمەنی ڕۆژنامەكە بە (یازدە) ساڵ بنووسـێ وەك لەوەی بنووسێ (دە ساڵ).

## دووەم:
## ڕۆژنامەی کوردستان
## دەورەی دووەم ( پێنجشەممە : ١٤ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩ )

تـا ئێسـتا مێـژووی دەرچـوونی ڕۆژنامـەی کوردسـتان (دەورەی دووەم) بـە تـەواوی نەنووسـراوەتەوە چـونکە هـیچ کـەس هـیچ ژمارەیـەکی ئـەم ڕۆژنامەیـەی لەبەردەستدا نەبووە تا بەتەواوی زانیارییەکان تۆمـار بکـات. ڕەنگـە ئـەو وتـارەی ئێمـە کـە بـەناوی (چـەند زانیـارییێکی نـوێ لـەبارەی چـەند ڕۆژنامـەییێکی کـوردیی سـاڵەکانی ١٩٠٨-١٩١٠) لـە ژمـارە (٢) ی گۆڤـاری (کوردناسـی) (٢٠٠٧) [٢]بڵاوکرایەوە، بە پشتبەستن بە زانیارییەکانی بەرگی هەشتەمی گۆڤاری (دونیـای جیهانیی موسـڵمان)[٣] کـە سـاڵی ١٩٠٩ بـە زمـانی فەرەنسـی بڵاوکراوەتـەوە، بـۆ یەکەم جـار مێـژووی دروسـتی دەرچـوونی ڕۆژنامەکـەمان دەستنیشـان کردبێـت. لەوێـدا نووسـراوە: *لـە لاپـەڕە (٩٧) دا لـە وتـاری (چـاپەمەنییەکانی جیهـانیی موسلمان) [٤] لیستێکی دووروودرێژی ناوی ڕۆژنامە و گۆڤارە عوسمانییەکانی دوای مەشرووتەی تێدایە. لە پێشەکی وتارەکەدا هاتووە، کە ئەم لیستـەیان لـە ڕێگـەی هاوکاری پایەبەرزمان کۆلۆنێل ئیسماعیل حەقی بەگەوە بۆ هاتووە. بـە گـوێرەی وتارەکـە لیسـتەکە هـی چـاپکراوەکانی ڕۆژنامـە و گۆڤارەکانـە لـەوەتای ١٦ی تـەمووزی ١٣٢٤، واتـە لـە ٢٩ی تـەمووزی ١٩٠٨-ەوە. لـەناو لیسـتەکە ئـەم زانیارییانـە لـەبارەی ڕۆژنامـەی کوردسـتان (دەورەی دووەم) هەڵـدەکرێن: "کوردسـتان Kurdistân . بـەدرخان خـانزادە ئەحمـەد سـورەیا بـەگ. کۆنستانتینۆپل. نیو بەشی تورکی و کوردی، هەفتەنامـە". ئـەم زانیارییانـە هـیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵنـەوە کـە ڕۆژنامـەی کوردستان (دەورەی دووەم) بەڕاسـتی دەرچووە و مێژووی دەرچوونەکەشی دەکەوێتە دوای ٢٩ ی تەمموزی ١٩٠٨. جـا ئەگەر مێژووی گیرانی ئەحمەد سورەیا بەگ بـە ١٣ ی نیسـانی ١٩٠٩ بـزانین ئـەوا بێگومـان دەگەینـە ئـەو ڕاسـتییەی کـە دروسـت ڕۆژنامەکـە لـەنێوان ( ٢٩ ی تەمووزی ١٩٠٨-١٣ ی نیسانی ١٩٠٩) دەرچووە*[٥].




هەر لەم وتارەدا ئەوەم دەستنیشان کردبوو کە (ماوەی یەك دوو ساڵێکە لە سەرچاوەیێکی ئاگادارەوە دەزانم کەوا ژمارە یەکی ئەم ڕۆژنامەیە لە یەکێك لە کتێبخانەکانی وڵاتێك دەست دەکەوێ، بەڵام داخەکەم تا ئێستە نەمتوانیوە بەردەستی بخەم)[٦]. لە ڕێگەی کتێبە تورکییە سێ بەرگییەکەی حەسەن دومان (*بیبلیۆگرافیا و پێڕەستی یەکگرتووی ڕۆژنامەوانیی عوسمانی–تورکی (بڵاوکراوە و ڕۆژنامە) لە سەرەتاوە تاوەکو گۆڕینی ئەلفوبێی نوێی تورکی (١٨٢٨–١٩٢٨)*، چاپی ئەنقەرە، ساڵی (٢٠٠٠) [٧]دەمزانی (چەند) ژمارەیەکی ڕۆژنامەی کوردستان (دەورەی دووەم لە کتێبخانەی ئەتاتورك) لە ئەرزەرۆم دەستدەکەوێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ڕێگەی زانکۆی سۆربۆن–ەوە، کە ئەوکات من خۆم لە پاریس خوێندکاری دکتۆرا بووم، داوامان لە باڵیۆزخانەی فەڕەنسا لە تورکیا کرد، کە هەرچۆنێك بێت هەوڵێك بدەن و مشووری ئەوەبخۆن کۆپییەکی ئەم ڕۆژنامەیەمان بۆ پەیدا بکەن، تا لە بیرمە بە خانمی بەرپرسی کتێبخانەی زانکۆم گوت تکایە بە ناوی قوتابییەکی فەڕەنسییەوە داوای ڕۆژنامەکە بکەن، چونکە ئەگەر تورکەکان بزانن ناوێکی ڕۆژهەڵاتییە و بەتایبەت کوردیشە، ڕەنگە گومان بکەن و ڕۆژنامەکە کۆپی نەکەن. پاش زیاتر لە شەش مانگ وەڵامی باڵیۆزخانە ئەوە بوو "ئیتر پێداگری لەسەر داواکردنی ئەم ڕۆژنامەیە نەکەن".

ئێستا شوکر وا بەسەر یەکەوە چوار لاپەڕەی ژمارە (٣) و ژمارە (٤)مان لەبەردەستدایە و لەسەر بنەمای زانیارییەکانی ئەم ژمارانەی لەبەردەستە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بە پێچەوانەی ئەوەی لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکە نووسراوە (هەفتەنامە)یە کەچی وادیارە نەتوانراوە ڕۆژنامەکە هەفتانە دەربکرێت و بەڵکو سێ هەفتە جارێك دەرچووە. بۆ ئەم مەبەستە بە پشتبەستن بە ژمارە (٣) و (٤) ی ڕۆژنامەکە گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی ژمارە یەکی ڕۆژنامە لە ڕۆژی

BAŞLANGICINDAN HARF DEVRİMİNE KADAR OSMANLI-TÜRK SÜRELİ YAYINLAR VE GAZETELER BİBLİYOGRAFYASI VE TOPLU KATALOĞU, 1828-1928

*A BIBLIOGRAPHY AND UNION CATALOGUE OF OTTOMAN-TURKISH SERIALS AND NEWSPAPERS FROM BEGINNING TO THE INTRODUCTION OF THE MODERN TURKISH ALPHABET, 1828 - 1928*

by
Hasan DUMAN
حسن دومان

البيليوغرافيا والفهرس الموحد للصحافة العثمانية - التركية ( الدوريات والصحف ) من البداية الى ثورة تغيير الأحرف
( ١٩٢٨ - ١٨٢٨)

I. Cilt/*Vol.*/الجلد
A - N

ENFORMASYON VE DOKÜMANTASYON HİZMETLERİ VAKFI
*FOUNDATION FOR INFORMATION AND DOCUMENTATION SERVICES*
جمعية وقف خدمات الاعلام والوثائق

Ankara - 2000 - أنقره

پێنجشەممەی ١٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩ بڵاوکراوەتەوە و هەر تەنها (٥) ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە. ئەگەر ئەوە بزانین کە سورەیا بەدرخان رۆژی ١٣ ی نیسانی ١٩٠٩ سورەیا بە تۆمەتی (کۆنەپەرستی) و ئامادەسازی بۆ یاخیبوونی عەسکەری دەخرێتە ناو زیندانی (بەکر ئاغا) لە ئەستەمووڵ تاوەکو ساڵی ١٩١٠، کە وا دیارە لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسییەکانی وڵات دەبەخشرێ و ساڵی ١٩١٢ دەگەڕێتەوە کۆنستانتینۆپل و (کۆمیتەی نهێنی شۆڕشگێڕانی کورد پێکدەهێنێ) کە زۆری نابا دیسان بۆ جاری سێیەم دەخرێتە کونجی زیندان و ئەمجارە سزای لەسێدارەدانی بۆ دەردەکەن، بەڵام سورەیا لە زیندان هەڵدێت و ئیدی بۆ دوایین جار ئیمپراتۆریای عوسمانی بەجێ دەهێڵێ و لەم مێژووە بەدوا ڕوو دەکاتە قاهیرە[٨].

بۆیە ڕێی تێ دەچێ و شیمانەی زۆرە ژمارە (٥)یش کە دەبوو لە ٨ ی نیسانی ١٩٠٩ بڵاوبکرێتەوە، دەرچووبێت، یان لە خراپترین باردا ڕەنگە لە چاپخانە دەستی بەسەردا گیرابێت. بەڵام شیمانەی زۆر هەیە ژمارە (٥) دوا ژمارە بێت و بڵاویش کرابێتەوە.

لە پێناو نووسینەوەی مێژووی ڕۆژنامەی کوردستان دەورەی دووەم وا لە خوارەوە ژمارە و ڕۆژی دەرچوونی هەر (٥) ژمارەکەی ڕۆژنامەی کوردستان بە مێژووی ساڵەکانی: ڕۆمی، کۆچی و زایینی دەنووسینەوە.

## سەرجەم ژمارەكانی كوردستان

(دەورەی دووەم)

| ژمارە | مێژووی ڕۆمی | ڕۆژ | مێژووی كۆچی | مێژووی زایینی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | ١ی كانوونی سانی١٣٢٤ | پێنجشەممە | ٢١ی زیلحیجەی١٣٢٦ | ١٤ ی كانوونی دووەمی ١٩٠٩ |
| ٢ | ٢٢ی كانوونی سانی ١٣٢٤ | پێنجشەممە | ١٣ی محەرەمی١٣٢٧ | ٤ ی شوباتی ١٩٠٩ |
| ٣ | ١٢ ی شوباتی١٣٢٤ | پێنجشەممە | ٥ ی سەفەری١٣٢٧ | ٢٥ ی شوباتی ١٩٠٩ |
| ٤ | ٥ ی مارتی ١٣٢٥ | پێنجشەممە | ٢٦ی سەفەری١٣٢٧ | ١٨ ی ئاداری ١٩٠٩ |
| ٥ | ٢٦ی مارتی ١٣٢٥ | پێنجشەممە | ١٧ی ڕەبیعولئەوەلی ١٣٢٧ | ٨ ی نیسانی ١٩٠٩ |

***(بۆ زانینی ڕۆژ و مانگ و ساڵی زایینی، لە ڕاستییدا مێژووە ڕۆمییەكە كراوەتە بناغە و لەسەر بنەمای ئەو مێژووە، ئێمە مێژووە زایینییەكانمان جێگیر كردووە، چونكە** (لە هەندێك باردا)* ***مێژووە ڕۆمی و كۆچییەكان** (یەك)* ***ڕۆژ جیاوازییان هەیە و ئەمەش بەڕاستی كێشە دروست دەكات. بۆیە بۆ دووركەوتنەوە لەمە مێژووە ڕۆمییەكان لێرەدا كراونەتە بناغەی ئەم وتارە و ئێمە مێژووە ڕۆمی و زایینییەكەمان بە دروست زانیوە)***

## سێیەم:
## گرێکوێرەی ژمارە (٢٦٤)

لـە چـمکێکی وتارەکەیدا نووسـەر نووسـیویە: ( نـەك هـەر ئەوەنـدە لـەوەش سەرسوڕهێنتر، کە لـە سـەرەوەی ڕۆژنامەکـە و لـە پـاڵ هـەردوو ژمـارەی (٣،٤)ی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە: (عدد–٢٦٤–٣)، (عدد ٢٦٤–٤)...). نازانم ئەمە دەبێت چ سەرسـوڕهێنییەکی تێـدا بێـت، بـە چاوپێداخشـانێك لـە دووبارەبوونـەوەی ژمـارە (٢٦٤) لە هەردوو ژمارە (٣ و ٤) دا ئەوە دەردەکەوێ، مەبەست لـەو (٢٦٤) ە بـە هیچ شێوەیەك بەردەوامی ژمارەی ڕۆژنامەکە نییە بـەڵکو واتـە تـیراژی ڕۆژنامەکـە دەگەیەنێت و هیچی تر. واتـە ڕۆژنامەکـە تـەنها (٢٦٤) دانـەی لـێ چـاپکراوە، کـە نووسراوە (٢٦٤–٣) واتە ژمارە (٣) تیراژ (٢٦٤) دانە. تـەنها بـە چاوپێداخشـانێك بەوەی لە هەردوو ژمـارە (٣) و (٤) دا ژمـارە (٢٦٤) دووبـارە بۆتـەوە و دواتـر لـە لاپەڕەکانی دیکـە (عـدد) یـش بـە واتـەی (ژمـارە) نووسـراون بۆیـە هـیچ گومانێـك لەوەدا ناهێڵێتەوە کە مەبەست لەوەوە تیراژی ڕۆژنامەیـە و هیچـی تـر. ئەگـەر لـە ژمـــارە (٣) ی ڕۆژنامەکـــە بنووســـرابوایە (٢٦٤–٣) و لـــە ژمـــارە (٤)ەکـــەش بنووسرابوایە (٢٦٥–٤) ئەوسا ڕێی تێ دەچوو کـەمێك سەرسـوڕهێن بوایـە. بـەڵام کاتێك ٢٦٤ لە هەردوو ژمارەکە نووسراوە و لە هەردوو ژمارەکەش (عدد٣) و (عـدد ٤) زۆر بە ڕوونی نووسراوە ئـەوە هـیچ گومانێـك لـەوەدا ناهێڵێتـەوە کـە مەبەسـت لەوە تیراژی ڕۆژنامەکەیە و بەس.

## ئەنجامگری

لە ڕێگەی ئەم بەدواداچوونەدا دەگەینە ئەم ئەنجامەی، كە ڕۆژنامەی كوردستان (دەورەی دووەم) كە خۆی بە درێژەپێدەری ڕۆژنامەی كوردستانی دایك زانیوە و لەژێر لۆگۆی ڕۆژنامەكەش مێژووی دەرچوونی یەكەم ژمارەی كوردستانی دایك بە ساڵی ڕۆمی (١٣١٣) نووسراوە، كە ڕێك بەرانبەر ساڵەكانی (١٨٩٧–١٨٩٨) زایینی دەوەستێ. ژمارە یەكی خولی دووەمی ڕۆژنامەی كوردستان، كە لە ١٤ ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٩ دەرچووە ڕێك دەكاتە ساڵی یانزەهەمی بڵاوكردنەوەی ڕۆژنامەی كوردستان دەورەی یەكەم. شایانی گوتنە دوا ژمارەی (دەرچوو) یان (دەست بەسەرداگیراوی) ڕۆژنامەی كوردستانی دەورەی دووەم دەبێت ژمارە (٥) بووبێت، كە لە ٨ ی نیسانی ١٩٠٩ پێنج ڕۆژ بەر لە گیرانی سورەیا بەدرخان بڵاوكرابێتەوە.

لە كۆتاییشدا سوپاسی زۆرم بۆ كاكە زەنگەنەی خۆشەویست، كە وتارەكەی ئەو بوو بە سۆنگەی ئەم بەدواداچوونانە و ئەگەر وتارەكەی ئەو نەبوایە ئەم وتارەی ئێمەش لە دایك نەدەبوو، بۆیە ئەم وتارەم پێشكەش بە ماندووبوونەكانی زەنگەنەی خۆشەویست دەكەم.

## پەراوێز و سەرچاوەكان

(١) عەبدوڵڵا زەنگەنە، (دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیكەی ڕۆژنامەی كوردستان!)، گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی ، ژمارە (٢٥)، ٢٠١٣، لا: ١٣١

(٢) نەجاتی عەبدوڵڵا، "چەند زانیارییێكی نوێ لەبارەی چەند ڕۆژنامەییێكی كوردیی ساڵەكانی ١٩٠٨–١٩١٠"، *گۆڤاری كوردناسی، بەرلین، ژمارە (٢) ، بەهاری ٢٠٠٧، لا: ٧–١١*

(3) Revue du Monde du Musulmane, tom VIII, 1909, Paris, p. 130

(4) La presse musulmane

(٥) نەجاتی عەبدوڵڵا، هەمان سەرچاوەی پێشوو، *لا: ٧–٨*

(٦) نەجاتی عەبدوڵڵا، هەمان سەرچاوەی پێشوو، *لا: ٨*

(7) HasanDuman, Osmanlı-Türksüreliyayınlarıvegazeteleri, 1828-1928, Volume 3, Ankara, 2000

(٨) كۆمیتەی سەربەخۆیی كورد، **كوردستان یا ئەرمەنستان– شەهیدەكان یا ملهوڕەكان**، لە فرانسییەوە وەرگێڕانی و پەراوێزنووسیی نەجاتی عەبدوڵڵا، لە چاپكراوەكانی بنكەی ژین، ٢٠٠٩، لا:٦

# دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیکەی ڕۆژنامەی کوردستان

**( جاری دووەم )**[*]

**عەبدوڵڵا زەنگەنە**

## پێشگۆتن

گۆڤار و ڕۆژنامە، لای زۆربەی مێژوونووسان، بە یەك لە سەرچاوە ڕەسەنەكانی نووسینەوەی مێژوو دادەنرێ، هەر لەسەر ئەم بنەمایەیە ئێمە دەمێكە هەموو مەراق و خەممان بۆتە نووسینەوەی مێژوویەكی ڕاست و دروستی ڕۆژنامەنووسیی كوردی، ئەم چەمكەشمان بێ دوودڵی لە چەندین بۆنەدا دووبارە كردۆتەوە، پێمان وایە ئەم لایەنە ئەگەر فەرامۆش بكرێت، ئەوا كەلەبەر دەكەوێتە نێو زنجیرەی نووسینەوەی مێژووی ڕووداوەكانی هەر لێكۆڵینەوەیەك، ئەو بۆچوونەشمان ئەگەر لای هەندێكان، ئاوەها بە ڕەهایی، لە سەر مێژووی نوێی كوردان جێی گومان بێت، ئەوا نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخ دانوستانی لەسەر ناكرێ، بە نموونە: قەت ناكرێ و نابێت بەبێ ڕۆژنامەی **(كوردستان)**ی بیری حیزبی دیموكراتی كوردستان و بڵاوكراوەكانی دیكەی سەردەمی **(كۆمار)** لە مەهاباد، لێكۆڵینەوەیەكی تەواو و تێر و تەسەلْ لەسەر ڕووداوەكانی دەور و زەمانی ئەوسا بكرێت، هەروەها بەبێی ڕۆژنامە و گۆڤارەكانی سەردەمی **(شۆڕشی ئەیلوول)** نووسینەوەی مێژووی ڕووداوەكانی ئەم ساڵانە ڕاستەڕێ نابێت. ئەگەر بێینە سەردەمی ڕۆژانی دوای شەڕی ئێران و عیراق و بار و زرووفی ئەوسای كوردان، ئەوا دەڵێین: یەكێك بیەوێ مێژووی كارەساتی ئەنفالەكان بنووسێتەوە، نەك هەر بە

---

[*] داوا لە خوێنەران و توێژەران دەكەین، بەر لە خوێندنەوەی ئەم بابەتە، تەواوی بابەتی **(هەنگاوێك بە ڕێگەی مێژووی ڕۆژنامەی كوردستان)** بخوێننەوە كە لە پێش ناوونیشانی ئەم بابەتە دانراوە.

بێی متمانەکردنە سەر بڵاوکراوە کوردییەکان و گێڕانەوەی ڕووداوەکان، بەڵکو بیّ سیّ و دوو لێکردن دەڵێین: تۆژەران لەسەریانە بە هەموو بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەی ڕژێم، بە تایبەتیش هەموو ڕۆژنامەکانی (**الثورة، العراق والجمهورية**) تەنانەت بە ژمارەکانی (**الراصد**)یشدا بچنەوە[1]، ئینجا دەکرێت بڵێین بوارەکە تا ڕادەیەك هەقی خۆی دەدرێتیّ! دیارە هەموو ئەو کارانەش لە پاڵ بەڵگەنامە ڕەسمییەکانی حکومەتەکان و سەرچاوەی دیکە و بەراوردکردنیان دەبێت.

ئێمەش، لە ڕۆژانی (١٠٠) سەدساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بە دواوە، هەوڵمان داوە بایەخێکی تایبەتی بەم سەرچاوە گرنگانە بدریّ، ئەو کارەشمان بۆ ئەوە بووە جۆرێك لە (**دژەبۆچوون و دژەتەوەر**) بخەینە بەردەم خوێنەرانمان تا هەمووان لەگەڵ یەکتریدا بیر بکەنەوە. زیندووکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی پێشین، بە تایبەتی ڕۆژنامەی (**کوردستان**) یەك لە خەمە سەرەکییەکانمان بووە، ئەوەتا ئێمە دوای دۆزینەوەی هەردوو ژمارە(٣،٤)ی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی ساڵی (١٩٠٨ــ١٩٠٩)، بە یارمەتی هاوکارانمان، (٤) لاپەڕەمان لە ڕۆژنامەکە بڵاوکردبووەوە، ئەم هەنگاوەمان دەنگدانەوەی خۆی هەبوو، ئەوەندەی نەبرد داوامان لیّ دەکرا هەنگاوی دواتری بۆ هەڵنێین و ئەو سۆزەی بە خوێنەرانمان دابوو بەجێیان بێنین، بۆیە وا جارێکی دیکە، دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە، وەکو دەبینن وا تەواوی ڕێنووسگۆڕکێی دەقە کوردییەکان، لەگەڵ تەواوی دەقە وەرگێڕدراوەکانی ناوەڕۆکی بابەتە تورکییەکانی ئەم دوو ژمارەیەی (**کوردستان**) لەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمان خراونەتە بەر دەست (بنوارە: پاشکۆی ژمارە (١)و (٢))، هەروەها لە تەنیشتیانەوە تەواوی لاپەڕەکانی هەردوو ژمارەی ڕۆژنامەکە، ئەگەر بۆمان چووە سەر بە ڕەنگی خۆی، واتە بە ڕەنگاوڕەنگی، لە پاڵیاندا بڵاودەکەینەوە (بنوارە: لاپەڕە (٢٢١، ٢٢٥ ))، دواتر ئەگەر پێویستیشی کرد دانوستان لەگەڵ هەر کەسێك دەکەین زانیاریی نوێی لە بارەیانەوە هەبێت، پێمان وایە ئەم کارەمان، جگە لەوەی دەبێتە هاندەر بۆ ئەوانەی بایەخ بەم بوارە دەدەن، کارئاسانییەکیشە بۆ ئەکادیمییەکانمان[2]، هەر نەبێت دەبێتە هاندەر تا بە دوای ژمارەکانی دیکەی ڕۆژنامەکەدا بگەڕێن و بیاندۆزنەوە. هەروەها بۆ زیاتر سوودوەرگرتنی تۆژەران لە بابەتەکەمان پێویست دەکات هەندیّ ڕوونکردنەوەی

دیکەی لەسەر بدەین، بۆ وەدیهاتنی ئەم مەرامەشمان ئەم جارەیان بەم شێوەیەی خوارەوە لە دەرگای دوو دەروازەی تەوەرەکانی ئەم بابەتە دەدەینەوە:

**دەروازەی یەکەم**

لە ژمارەی رابردووی **(گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**[٣]) دا ناچار بووین بەتەنیا پێناسەیەکی کورتی هەردوو ژمارە (٤،٣)ی ڕۆژنامەی **(کوردستان)**ەکە بڵاوبکەینەوە، دیارە سەرەتا بڕیار وا بووە نووسینەکە هەموو لایەنەکانی مێژووی ئەو ڕۆژنامەیە بگرێتەوە، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك تەنیا بە هەندێ وردەکاری و زۆر بە کورتی بابەتەکە خرابووە بەردەم توێژەران[٤]. دیارە تۆژەر حەزی کردووە نووسەرانی دیکەش، لە ئاشکراکردنی نهێنییەکان و ساخکردنەوە و پڕکردنەوەی کەلەبەرەکانی بابەتەکە بەشداری لەگەڵدا بکەن، هەروەها ئەم دەقە ئەسڵییەی خوارەوە، کە وەکو سەروتاری ژمارە (١)ی خولی سێیەمی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی ساڵی ١٩١٧ بووە، لە لایەن دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە لە ژێر ناونیشانی: **(ئێمە دوخینین)** نووسراوە، بەشێکی وەکو خۆی بە بیر تۆژەوان بێنینەوە، چونکە وەکو دواتر بۆتان دەردەکەوێ ئەم بابەتە زۆر لایەنی شاراوە و مەبەست ڕوون دەکاتەوە:

**"دیتین ژی حکومەتا عوسمانا هەر ڕۆژ دبێژیت کو قەنجیا وەلاتێرە بخەپتیت، ئەو هەر ڕۆژێ درەڤا دکت تشتەکی قەنج چێناکت گۆتین کو مادام حکومەتێ عوسمانا خوە خرا دیکت چرە ئەم ژی وە رە خرابین و ژ ساڵی ١٣١٣ ژ قەنجیا وەلاتا کرمانجا رە خەبتینێرا شوغل کرن. حەیا قەنجیا کرمانجا رە بخەپتیت، ریێن راست و قەنج مەرە بێژیت سالی ١٣١٤ کورێ میرێ مە، مەقامێ ڤی جەنەت بیت، مەدحەت بەگ کورێ میر بەدرخان ژ مالێ بۆتانا چوو میسرێ، قاهیرەیێ جەریدەیی کوردستان دەرێخست، پاشی سالەکی مەدحەت بەگ نەخۆش کەت برای ڤی عەبدولڕەحمان بەگ چو ئەسویچرەیێ، ژونەڤێ جەریدەیی کوردستان دەرێخست، کەنگی سولتان حەمید حەمی مالا میر بەدرخان حەپس کر، کەسا نەما ڤی جەریدەیێ دەرێخە، کەنگی مەشرووتیەتی چێ بوو، حەمی مالی بەدرخان دەرکەت ژ حەپسێ. دیسا ژ قەنجیا وەلاتی کرمانجا را د خەپتینێ**

**دەست ئایێن، نەڤی یا میر بەدرخان سورەیا بەگ ژ ئەستانبۆلی کوردستان دەرێخست، پاشی رۆژی ٣١ مارتی سالی ٣٢٥ کەنگی مەحمود شەوکەت پاشا ب لەشکرێ خوە ئەستانبوولی گرت جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی ژ رویی خوە ماسکەیێ ئاڤێت، گەلەك ژ مرۆڤێن قەنج وەلاتی رێکر حەپسی و نەفی، سورەیا بەگی ژی ئیرتیجاعی رە ئیتیهامکیر و ئاڤێت حەپسێ ناڤێ ڤی (بەکر ئاغا بلوکی) جەریدەی کوردستان ژی دادا، ژ ڤێ رۆژێ کرمانجا گەلەك خراپی دیتن ژ جەمعییەتی ئیتیحاد و تەرەقی یا دیسا قەبول نەکرن تشتەکی خراپ چێکن ژ دەولەتا عوسمانا رە گوتن حەمی خەلقێ وەلاتێ عوسمانا بدەست هەڤ بگرن و خراپیا جەمعیەتێ مەنع بکن"**[٥].

بە وردبوونەوە لەم دەقە، کە لە لایەن سێیەم خاوەنی ڕۆژنامەکە (**سورەییا بەدرخان**) خۆی نووسراوە، تێدەگەین:

١ـ سەرەتا (**میقداد میدحەت**) کە چۆتە میسر لە قاهیرە ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی پێشینی دەرکردووە، بەڵام دوای ساڵێك نەخۆش دەکەوێ و(**عەبدولڕەحمان بەگ**) لە (**جنێف**)ی وڵاتی سویسرە ڕۆژنامەکەی دەرکردۆتەوە.

٢ـ کەواتە بە پێی ئەم دەقەی سەرەوە، هەروەها ئەو رۆژنامەیەی بەردەست بێت، هەموو ئەو بۆچوونانە هەڵدەوەشێنەوە، کە لە سەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە تاوەکو ئەمڕۆکە لێرە و لەوێ دەوروژێنرێن، گوایە هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەی (**کوردستان**) لە میسر چاپ کرابن و بۆ شوێنە ونیی ناوی (**جنێف**) و (**فۆلکستۆن**) و (**لەندەن**) لەسەر هەندێ لە ژمارەکانی نووسرابێت.

٣ـ هەروەها بەپێی ئەم دەقەی سەرەوە بێت، ڕۆژنامەی (**کوردستان**) دەبێت تا ساڵی ١٩٠٦، ساڵی بەندکردن و دوورخستنەوەیماڵباتی بەدرخانییان بە هۆی کوشتنی <u>ڕەزوان پاشا</u>، بەردەوام بووبێت!.

٤ـ دوای مەشرووتەی ١٩٠٨، (**سورەییا بەدرخان**) جارێکی دیکە دەستی بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (**کوردستان**) کردۆتەوە.

ئەم دوو ژمارە تازە دۆزراوەی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)، کە تاوەکو ئێستا هەندێ جاران گومان لە دەرچوون و هەندێ جارانیش گومان لە کەوتنەوە

بەردەستیان دەکرا[٦]، تەنیا ئاماژەیەك ئومێدی پێ دەخوازرا ئەوەبوو لە دەورەی سێیەمی ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆی کردووە و لە سەرەوە نووسیومانەتەوە، هەواڵێکی ئەوتۆی لە بارەوە نەبوو، خەمخۆرانی ئەم بوارە بۆی لە مەراق مابوونەوە و کۆمەڵێك پرسیاریان لە بارەیەوە هەبوو، تا بڵاوکردنەوەی هەواڵی دۆزینەوی تەنیا (٣) لاپەڕەی لە گۆڤاری (**ڕۆژنامەنووس**)[٧]دا بینینی ببووە مەحاڵ، ئەوە بە چاوپۆشین لە ئاماژەیەکی تەمومژاوییش کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە لایەن (**د. نەجاتی عەبدوڵلا**) لە گۆڤارێکدا بە ناوی (**کوردناسی**) کە لەلایەن ئەنستیتووتی کورد لە بەرلین بڵاوکرابووەوە، هیچی ئەوتۆی لە سەر نەبوو، بەم دواییەش جگە لە هاوکارانی (**کۆما خەباتێن کوردۆلۆژیێ**[٨]) و جگە لەو یەك - دوو کەسانەش کە پەیوەندییان بە بابەتەکەمانەوە هەبووە، هەموو لاپەڕەکانی بەتەواوەتی نەبینرابوون و لەبەر دەستی کەسێکی دیکە نەبووە، بە تایبەتی کە ئێمە، لە کۆی (٨) لاپەڕە، تەنیا (٤) لاپەڕەمان خستبووە بەردەست، ئەمەش لەبەر چەند هۆ و هۆکار بووە[٩].

وا لەم ژمارەیەی گۆڤارەکەماندا، وەکو دەبینن، تەواوی ئەم حەزانەمان هاتوونەتە دی و هەردوو ژمارەی ڕۆژنامەکە، چ ئەو بابەتانەی بە زمانی تورکی نووسرابوون و چ ئەوانەیان بە ڕێنووسی کۆنی کوردی نووسرابوون، وا لێرەدا بە زمانی کوردی نووسراونەتەوە[١٠].

دڵنیاین پێشتریش کۆسپ لە بەردەم هیچ کەسێ نەبووە، بەبێ لاپەڕەکانی دیکە، زانیاری نوێ لەم چەند لاپەڕە هەڵێنجێ و زانیاریی نوێی دیکەش بخاتە سەر کەمە زانیارییەکانی ئێمە.

**دەروازەی دووەم**

وا دیارە (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)، لەم ژمارەیەی (**گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**)دا هەلی بڵاوکردنەوەی ئەم چەند لاپەڕەیەی قۆزتۆتەوە و وتارێکی لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە، بەر لە تاوتوێکردنی بابەتەکەی دوکتۆر حەزمان دەکرد بتانزانیبا ئەو ڕۆژنامەیە چۆن هێنراوەتە بەردەست[١١]، بەڵام ئەگەر ئەوە نەکرابێت، لە ڕێی ئەم بابەتەی (**د.نەجاتی عەبدوڵلا**) و بۆ ئەوەی زوو لێمان حاڵی

بن، ئومێدەوارین بە هەموو لایەکمان هەر نەبێ لە نهێنییەکان نزیك بینەوە، سەرەتا بە باشی دەزانین بابەتەکەی (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**)تان هەروا سەرپێیی نەخوێندبێتەوە، ئەگەر نا پێشنیاز دەکەین جارێکی دیکە بە بابەتەکەی ئەودا بچنەوە، کەوا لە پێش ناوونیشانی ئەو بابەتەی ئێمە دانراوە و هیواداریین وردتر بیخوێننەوە.

ئەوسا ئێوەش وەکو ئێمە هەست دەکەن وا (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) دەیەوێ، نەك هەر زۆر بە هەرزان بەڵکو بە خۆڕایی و بە ئاسانی، هەموو ئەو ماندووبوونەمان بە ئاقارێکی دیکەدا ببات، نەك هەر خۆشیی دۆزینەوەیان، بەڵکو ئەو نیگەرانییەشمان، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لێ بێ بایەخ بکات. سەرەتا لە بارەی چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی وتارەکەی ئێمە، حەز دەکەین بزانن و پێتان بڵێین کارەکە نەك هەر خێرا، بەڵکو لە زرووفێکی تایبەتیش بوو، بە کوردییەکەی ئێمە لە سەر سەفەر بووین بۆ دەرەوەی وڵات، ئەو وتارە (١٢) لاپەڕەییەی کە باسی سەفەرەکەمان بۆ ئەستەنبۆڵ و چۆنیەتی دەستخستنی (**کوردستان**)ەکەمان تێدا کردبوو، سەرنووسەری گۆڤارەکەمان شێوازی نووسین و خستنەڕووەکەی ئێمەیان لەم گۆڤارەدا بە دڵ نەبوو، بە کوردییەکەی حەزی نەدەکرد جگە لە باسی (**کوردستان**)ەکە، باسی دیکەی تێدا بکرێ، دوای چەند جاران لێ لابردن و گفتوگۆ، دیسان سەرپشکیان کردین لە نێوان ئەو وتارەی بە دڵی خۆمان نووسیبوومان و بڵاوکردنەوەی بە شێوازی نووسینەکەی خۆمان، یانیش پشتگوێخستنی بۆ ڕەخسانی هەلێکی دیکە لە ڕۆژنامەیێکدا و نووسینی وتارێکی دیکە بەم شێوەیەی ئەو ئامۆژگاری کردبووین تا مەرامەکانی خۆمانی تێدا بڵێین، ئەوە بوو، لە ماوەی (٤٨) سەعاتاندا، بە پەلە وتارێکی چڕوپڕ و دوو لاپەڕەییمان نووسی، پێشنیازیشمان بۆ ئەو کرد، ئەگەر بیەوێ ئەویش پێشەکییەك بۆ بابەتەکە بنووسێ، ڕۆژی دواتر، کە سەفەرمان تێیدا دەکرد، هەر خۆمان زۆر بە پەلە هەڵەچنییەکی خێرامان لە (**وتەیەکی پێویست**)ەکەی (**سەرنووسەر**) و بابەتەکەی خۆماندا کرد و گەردنی (**د. جەبار**)یش ئازاد کرا بە هەوەستی خۆی هەر گۆڕانکارییەکی تێدا بکات[١٢]. دوای گەڕانەوەمان، بە دوو- سێ ڕۆژان، وەکو بە بیرم دێتەوە ڕۆژی پێنجشەممە بوو، ئێمە ئاگادار نەبووین گۆڤارەکە لە چاپخانە

هێنرابووەوە، بەڵکو ئەوە (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)یە هـەواڵی هێنانـەوە و دەرچـوونی پێداین، واش دیار بوو بابەتەکـەی ئێمـەی خوێنـدبووەوە، هـەر زوو مـەرامی خـۆی پێگوتین، کە شتێك لـە بـارەی ئـەو دوو ژمارەیـەی (**کوردستـان**) بنووسـێ، **خـۆی گوتـەنی** گوایـە وەڵامـی هـەموو ئـەو پرسـیارانەی ئێمـە بداتـەوە کـە لـە بـارەی ڕۆژنامەکـە کردبوومـان! دوای چـەندان جـار داوا و دووبـارە لـێ کردنـەوە، ئینجـا قەڵەمی هاتە بەرهەم، بە ڕاستی دەتوانین بڵێین هەموو وەڵام و ڕاکانی دوو دیون و هی ئـەوەن هەڵوەسـتەیان لەسـەر بکرێت. ئەگـەر وا نـەبێ نـەك هـەر ئـەو(٢١٤٥) وشەیەی ڕیزیان دەکات بابەتەکە دەوڵەمەند ناکات، بەڵکو زۆر بە ئاسانی دەیـەوێ دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەش تێوەبگلێنێ و گوناهباریان بکات، ئـەوەی باشـە کە ئێمە بایی ئەوەندە بوێریمـان تێدایـە پـێ لـە هەڵـەی خۆمـان بنـێین، فـەرموون ببینن و بیخوێننەوە:

**یەکەم**: بابەتەکەی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) وەکو چۆن بۆ (**گۆڤاری ئـەکادیمیای کوردی**) هاتووە، بە پێویست زانراوە، بێی هەڵەی چاپ و ڕێنـووس، ئاوەهـا وەکـو خـۆی بڵاوبکرێتـەوە[١٣]. ئـەوە بـە چاوپۆشـین لـەوەی نووسـەر نـاوەڕۆکی ئـەو (**بـەرایی**)یـەی بـە هـەمان نەفـەس نووسـیوە، کـە سەرنووسـەری گۆڤارەکـەمان، (**د.جـەبار قـادر**) لـە (**وتەیـەکی پێویسـت**)دا بـۆ وتارەکـەی پێشـووتری ئێمـەی نووسیوە، لە هەمان کاتیشدا نووسەر لەو (١٦) دێڕەی ئەو (**بەرایی**)یەدا کۆمـەڵێك (**دا**) و (**وێرگوڵ**) و ئەوانەی لە بیر کردووە[١٤].

**دووەم**: ڕاسـتە (**د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) لـە بـواری مێـژوودا، کتێبخانەکـەی دەوڵەمەندە[١٥]، لە وەرگێڕانی بابـەتی مێژوویيشـدا کەسـێکی پـڕ بەرهەمـە، بـەڵام هەنـدێ جـار وەرگێـڕان کاریگـەری لەسـەر ئـەو بابەتانـە دەەبێـت کـە خـۆی دەیاننووسـێ، ئـا لـەم وەزعـەدا دوکتـۆر هـەر بابـەتێك کـە دەیاننووسـێ، یـان بـۆ گۆڤارەکـەمان ئامادەیـان دەکـات، دەبـێ خەمـە گەورەکـەی هـەر بـۆ ئێمـە بێـت، چونکە هەرچەندەی هەندێك جاران پاکانەشـی بـۆ دەکـەین، بـەڵام ئـەو بـەردەوام هەوڵی داوە پـێ لـە کـەلێنی بابەتـەکانی خـۆی نـەنێ، ئـەم بابەتەیشـی کـە خـۆی نووسـیویە، بـەم شـێوەیەی خـوارەوە دابـەش کراوەتـە سـەر (**بـەرایی**) و سـێ ناوونیشانی یەك بە دوای یەك و (**ئەنجامگری**) لەم لایەنە بەدەرنییە:

**یەکەم: ڕۆژنامەی کوردستان (پێنجشەممە ٢١ی نیسانی١٨٩٨)**

بـە پێـی ڕێنماییـەکانی گۆڤارەکـەمان بێـت باسـکردن و بیرهێنانـەوەی ئـەو ناوونیشانە نەك هەر پێویستی نەدەکرد، بەڵکو ورووژاندنی لێـرەدا، کـە ئێمـە لـەم گۆڤارەدا (**بەڕێوەبەری نووسین**)ین، دەبا قابیلی قبوڵکردن نەبێ، چونکە بابەتەکە (٣) ساڵێك لەمەوبەر لە لایەن (**فـەرهاد شـەکەلی**) ورووژێنـدراوە و بڵاوکراوەتـەوە، ئێمـەش لـە ڕۆژنامـەی (**ئاسـۆ**)ی جـاران و لـە سـەر لاپـەڕەکانی گۆڤـاری (**ڕۆژنامـەنووس**)ی سـەندیکای ڕۆژنامەنووسـانی کوردسـتاندا، وەڵامـی نووسـەرەکەیمان داوەتـەوە، ئـەم بابەتـە سـەرەتا لای ڕۆژنامەنووسـان و سەندیکاکەشیان بە هەنـد وەرگیرا، بـەڵام دواتـر کـە لێـی کۆڵرایـەوە کاردانـەوەی جارانی نەما، خاوەنەکەیشی پێدەچوو زیاتر بەلای بێدەنگیدا چوو بێ، کەچی تازە بە تازە وا (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)، کە ئەو خـۆی هـەتا (٥٠) جـاران، بـە بۆنـە و بـێ بۆنە، ڕووبەڕووی ئێمە بە برادەرانی گوتووە: (**فـەرهاد شـاکەلی دەڵـێ: هـەتا ئـەو عەبدوڵڵا زەنگەنەیە لە ژیاندا مابێـت، (...) نییـە ئـەو مێـژووەی ڕۆژنامەنووسـیی بگۆڕێت!**) دوای ئەو قسەیە، ئەگەر بۆ ورووژاندن و برینـدارکردن نـەبێت، خێـرە وا لە ئێستادا هاتووە باس لە بابەتێك دەکات، کە بە ورووژانـدن و گـۆڕینی، جگـە لـە بێبایەخکردنی پیرۆزییەکانمان، هیچی دیکەی لێ وەدەست نایـەت. بـەڵام ئـەوەش هەیە، دەڵێن: (**ئەوەی لە خوای غافڵـە، ئـەوە کـافرە**)، ئـەوەتا جـارێکی دیکـەش کـاتێ (**د.نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) دەسـتکاری بابەتەکـەی خـۆی، وەکـو بابەتـەکانی ژمارەکـانی پێشـووتری گۆڤارەکـەمان، دووبـارە دەکاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر جـارانی پێشوو بەم جۆرە هەڵسـوکەوتەی قـەڵس ببـووین وا ئـەم جارەیـان، بـەبێ ئـەوەی نووسەرەکەی مەبەستی بووبێت، خۆی ڕاستییەکی زانسـتیمان بـۆ تۆمـار دەکـات، ئەوەتا (**نووسەر**) لە ژێر ئەو خشتەیەدا، کە بۆ خۆی پێکی هێناوە، نووسیویە: (**بۆ زانینی ڕۆژ و مانگ و ساڵی زایینی، لە ڕاستییدا مێژووە ڕۆمییەکە کراوەتە بناغە و لەسەر بنەمای ئەو مێژووە، ئێمە مێژووە زایینییەکانمان جێگیر کـردووە، چـونکە** (لە هەنـدێك بـاردا) **مێـژووە ڕۆمـی و کۆچـییەکان (یـەك) ڕۆژ جیاوازییـان هەیـە و ئەمەش بە ڕاستی کێشە دروست دەکـات. بۆیـە بـۆ دوورکەوتنـەوە لەمـە مێـژووە**

**ڕۆمییــەکان لێــرەدا کراونەتــە بناغــەی ئــەم وتــارە و ئێمــە مێــژووە ڕۆمــی و زایینییەکەمان بە دروست زانیوە**[١٦]).

نووســەر کــە ئــەو بیرۆکــە و بۆچــوونەی بــۆ دیــارکردنی ڕۆژانــی دەرچــوونی ژمارەکانی ڕۆژنامەی (**کوردسـتان**)ی سـاڵی ١٩٠٨ــ ١٩٠٩ بـەکار هێنـاوە، ئێمـەش دەقاودەق لەگەڵ بژاردەکەی ئەوین، چونکە ئێمەش لـە وەڵامەکەمانـدا، کـە کـاتی خۆی بۆ (**فەرهاد شاکەلی**)مان نووسیبووەوە، هەر وامان گوتبوو، هەر بە ڕاستیش ئەمــەیان ڕێگــای ڕاســت و دروســتە، چــونکە ئــەوەی لــەژێر لۆگۆکــەی ڕۆژنامــەی (**کوردســتان**)ی ســاڵی ١٩٠٨ــ ١٩٠٩ نووســراوە، ســاڵی (١٣١٣)ی ڕۆمییەکەیــە، هەرچی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی یەکەمە ئـەوا نـەك هـەر لـە ژێـر لۆگۆکـەی سـاڵی (١٣١٥)ی کۆچی نووسراوە، بەڵکو ئـەو ڕۆژژمێـرە کۆچـییە لای خـاوەنی دووەمـی کراوەتە بنچینە، کەواتە لـە هـەموو حاڵەتێکدا دەبـێ سـاڵە کۆچـییەکە بـە بناغـە وەربگیرێ، ئاسانترین ڕێگەش بـۆ گـۆڕینی ڕۆژی مانگـەکانی سـاڵە ڕۆمییـەکان بـۆ زایینی ئەوەیە (١٣) ڕۆژ بخرێتە سەر ڕۆژە ڕۆمییەکان، بە تایبەتی ئەگـەر بزانرێـت هەموو ئەو ڕۆژژمێرانەی بۆ گۆڕینی سـاڵە ڕۆمـی و کۆچـی و زایینییـەکان دانـراون، جیـاوازی لـە نێوانیانـدا هـەر دەبێـت[١٧]، ئێمـە پێمـان وایـە لـە نێـو ئاڵۆزییـەکانی ڕۆژهەڵاتـدا ئـەو وردە جیاوازییانـە هـەر دەبـن! ئـەوەی دانیشـیان پێـدا نـەنێ بـە درێژایی ژیانی دەبێ هەر بە نیگەرانی ژیان بگوزەرێنێ![١٨].

ئەوە جگە لەوەی ئێمە خۆمان دواتر لە ٢٠١٣/٤/٢٢دا، لەو موحازەرەیەدا کـە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی سـەلاحەدین/ هـۆڵی عەبـدولقادر فـەرهادی پێشـکەشمان کرد، کاتێ پرسیاریان لە بارەی ڕاست و هەڵەیی **١٨٩٨/٤/٢٢** لێ کردین، **لە پـێش پتر لە (١٠٠)** کەسی ناو هۆڵەکـە، کـە (٩٠) کورسـی تێدایـە خـەڵك لـە ڕاڕەوەکـەدا لەسەر پا وەستابوون، ئێمـە زۆر بـە وردی باسـی دەسـتپێکردنی سـاڵی ڕۆمـی بـە مانگی ئادار و هەر سـاڵێکی ڕۆمـی بەرانبـەر دوو سـاڵی زایینیمـان بـۆ کـردن، هـەر لەوێ بوو ئەو جیاوازییەی نێوان هەردوو ڕۆژنامەکەمان بە نزیکـەی مـانگ و نیوێـك بۆ مەزەندە کردن، لە نێو چەپڵەڕێزانی خەڵکیشدا بە پـیرۆز مانـەوەی ڕۆژی (**٢٢ی نیسان**)ی هەموو ساڵێکمان پێگوتن[١٩].

**سێیەم**: لە وتارەکەی ئێمەدا هاتووە: (**ئەگەر ئێوەش وەکو ئێمە بزانن ئەو ژمارەی (١٣١٣) ساڵی ڕۆمییە و ڕێك دەکاتە ساڵی ١٨٩٦ی زایینی**) [٢٠]. (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) لە سەر ئەو دەقە کارێکی وای پێ کردووین وەکو دەڵێن: (**با بە دەواری شڕی نەکردبێ**)، بەڵام وا ئێمە بەبێ ئەوەی پێی نیگەران بووبین! بە هەندمان وەرگرتووە و وەڵامێکی زانستییانەی دەدەینەوە، بەڵام ئەوەی زۆر نیگەرانی کردووین و پێمان ناخۆشە (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) لەسەر ئەو هەڵە بچووکەی ئێمە ئاوەها نائەکادیمییانە (**شەلم کوێرم کەس نابوێرم**)، هەموو دەستەی نووسەرانی (**گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**) تێوە بگلێنێ و گوناهبباریان بکات. سەرەتا بۆ بەرچاوڕوونیی هەموو لایەك و لابردنی تۆمەت لەسەر هەموو هاوکارانی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان دەڵێین: هەر هەڵەیەك لە وتارەکەدا هەبووبێت، تەنیا خۆمان لێی بەرپرسیارین، پاشان ئەوەندەی ئێمە هایدارین دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان، بێجگە لە سەرنووسەر، سەرەتا کەسیان ئاگاداری ئەو نووسینە و بڵاوکردنەوەی لاپەڕە ئۆرجینالەکانی ئەو ڕۆژنامەیە نەبوون، مەگەر دواتر ئەوان لەو کۆبوونەوەیەدا ئاگادار کرابنەوە و پێیان زانیبێ و بینیبیان کە دوای چوونی ئێمە بۆ دەرەوەی وڵات سازکراوە، ئەوا جارێکی دیکەش دەیلێینەوە ئەو هەڵەیە، ئەوە لە کاتێکدا ئەگەر هەڵەکە بووبێت، هەر دەبێ لە ئەستۆی خۆمان بمینێتەوە، بەتایبەتی کە ئێمە نەهاتووین تۆژینەوەمان لە سەر هەموو لایەنەکانی ئەم ڕۆژنامەیە کردبێ! بەڵکو هەموو پەیامەکەی ئێمە لەم وتارەدا ئەوە بووە، دوای پتر لە (١٠٠) ساڵ لە دیار نەمانی ڕۆژنامەکە چاوی هەموو لایەکی پێ ڕوون بکەینەوە، هەروەها سوپاسی ئەو کەسانەش بکەین کە هاوکارمان بوون بۆ دەستخستنی ڕۆژنامەکە، جگە لەمانەش ئێمە مەبەستمان بووە ئەم ڕۆژنامەیە بە چەند ڕۆژێك بەر لە (١١٥)مین ساڵیادی ڕۆژنامەنووسی بخرێتە بەر دەستی هەموو لایەك، ئەوسا خۆیشمان لە ڕۆژانی ئەو یادە و دوای وەرگێڕانی تەواوی ناوەڕۆکەکەی، پێیاندا بچینەوە، پاشان ئێمە دوای وتاری ئاماژە بۆکراو، هەروەك گوتمان لە ڕۆژی ٢٠١٣/٤/٢٢دا، واتە لە ڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، محازەرەیەکمان لە بارەی ئەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە، لە هۆڵی (**عەبدولقادر فەرهادی**)ی کۆلێژی ئاداب داوە، (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) ئەگەر نەشیتوانی بێت

ئامادەی ئەم کۆڕە بێت[٢١]، دەبوایە لە بارەی ناوەرۆکەکە لە خۆمان یان لـە هـەر کەسێکی دیکەی بپرسیبا، بەڵام وا دیارە د. نەجات ئەمەی بـۆ نەچۆتەسـەر، بۆیـە وا لە خوارەوە ئەو ئیشارەتانەی دەدەینێ:

١ـ لێرەدا ئێمە زۆر بە ئاسانی دەمانتوانی بە پاساوی هەڵەی چاپ، واتـە ئـەو ساڵی (١٨٩٧) یان (١٨٩٨)یـەی دەبوایـە بەرانبـەر سـاڵی ١٣١٣ی ڕۆمـی دابنرایـە بۆتە (١٨٩٦)، بەڵام ئایا ئەمە خێری بۆ هیچ لایەك دەبێت، ئێ خۆ ئێمە دەمێکـە، بەپێی ئەو کەمە زانیارییـەی لـەم بـوارەدا هەمانـە، کـار بـۆ گەیانـدنی (**پـەیام**)ێك دەکەین، کەواتـە هـەر پرسـیارێکمان لـێ بکـرێ دەبـێ بـە ڕاسـتگۆیی و ڕاشـکاوی وەڵامیـان بدەینـەوە، یـەك لـە پرسـیارەکانیش ئەوەیـە گوایـە ئێمـە (**هەڵـەی مێژوویی**)مان کردووە، کەچی ئێمە ئەوەندەی وردبووینەوە، ئینجا (**گەنم گـرد جـۆ بەڵاو**) تێیگەیشتین، هەبێ و نەبێ ئەو برادەرەمان خۆی هەڵەی کـردووە، (**هەڵـەی مێژوویی**) و (**هەڵەی تەقویمی**) لێك جوێ نەکردۆتەوە و نـەیزانیوە ئـەوەی بەسـەر ئێمەدا تێپەڕیوە هەڵەی دووەمیانە، کەواتە ئەو سەرسامییەی (**نووسـەر**) بەرامبـەر بە گۆڤاری ئەکادیمیا نیشانی داوە گوایە ئـەوانیش ئـەو (**هەڵـە مێـژوویی**)ەیـان بـە سەردا تێپەڕیوە ئەوە زێدەڕۆییەکی بێ بنەمایە!.

٢ـ (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) لێی پرسیوین (**لەسەر چ بنەمایـەك و لـە ڕووی کـام سەرچاوەوە ساڵی (١٣١٣)ی ڕۆمی بەرانبـەر بـە سـاڵی (١٨٩٦)ی زایـینی دانـاوە خۆزگە سەرچاوەکەی دەستنیشان دەکرد**).

ئێمەش دەڵێین هیچ خۆزگەی پێ نـاوێ، وا بـە ڕاشـکاوی پێتـان دەڵـێین ئـەو سەرچاوەیەی **ساڵی (١٣١٣)ی ڕۆمی بەرانبەر بە سـاڵی (١٨٩٦)ی زایـینی دانـاوە** ئەو کەسەیە کـە ئێـوە خۆتـان بـە جـوامێر پەسـنتان کـردووە و دەڵـێن لـە پشـت پشـتگیریی ئامـادەکردنی کتـێبی (**شـێخ سـەعیدی پـیران**)ەکـەت و ئامـادەکردنی بەشێکی زۆری بەرهەمە بەڵگەنامەییەکانتانە، هەروەها خۆتان ئاوەهاش پەسنتان کردووە: (**پیاوێك سـپی وەکـو نیشـتمان، بـەرز وەکـو دار سـنۆبەر، خـاکی وەکـو ئەرخەوان**)، پێمان وابی ئێستا زانیتان ئەو کەسە کێیـە؟ بـەڵام ئەگـەر ئێمـە بـاین لەجیاتی ئێوە ئەوەندەشمان بۆ ئەو وەسفەی سەرەوە زیاد دەکرد: (**ئەو پیـاوەی لەئەکادیمیای کوردیدا، کاتێ هەستی کـرد پەیامەکـەی خـۆی گەیانـدووە، زۆر بـە**

**بوێرییەوە وازی لە کورسیی ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردی هێنا، ئێمەش کە ئێستا لەسەر کورسییەکەی ئەو دانیشتووین، بەڵێن بێت هەوڵ بدەین وەکو ئەو سپی و بەرز و ئەرخەوانی بین، پەیمان بێت هەڵەشە نەبین و وەکو ئەویش هێمن بین..!)**[٢٢].

فەرموون ئەوەش دەقە کرمانجییەکەی سەرەوە، کە لە لایەن ئەو پیاوە ئاوەها کراوەتە: کرمانجیی خواروو کە ئەو هەمووجار بە ڕێزەوە قسەی لەگەڵ کردووین و ئێمەش شەرممان لە خۆ کردووە ناوی بێنین، ئێستاش (**د.نەجاتی عەبدوللا**) کەوا سەر کورسییەکەی ئەوی پڕ کردۆتەوە، لەوە دەچێت نووسینەکانی ئەوی بەوردی نەخوێندبێتەوە: (**حکوومەتی عوسمانی هەر ڕۆژە دەڵێت بۆ چاکەی وڵات هەوڵ ئەدەم، هەر ڕۆژە درۆیەك ئەکات و شتێکی باش ناکات ـ وتیان مادام حکومەتی عوسمانی خۆی خراپ دەکات بۆچ ئێمەش لەگەڵ ئەو خراپ ببین، لە ساڵی ١٣١٣ (١٨٩٦)ەوە بۆ چاکەی وڵاتی کورد بە نهێنی کەوتنە کار بۆ ئەوەی لەپێناوی چاکەی کوردا تێبکۆشێت ڕێی ڕاست و باش بە ئێمە بڵێت، ساڵی ١٣١٤ (١٨٩٧) کوڕی میر جێگای بەهەشت بێت مەدحەت بەگ کوڕی میر بەدرخان لە بۆتانەوە چوو بۆ میسر، لە قاهیرە ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دەرکرد، پاش ساڵێك مەدحەت بەگ نەخۆش کەوت، برای ئەو عەبدولڕەحمان بەگ چووە سویسرە سەرلەنوێ ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دەرکردەوە. کاتێك سوڵتان حەمید هەموو ماڵی بەدرخانی بەند کرد، کەس نەما ئەو ڕۆژنامەیە دەربکات، کاتێك مەشرووتییەت بەرپا بوو هەموو ماڵی بەدرخان لە بەندی دەرچوون دیسانەوە بۆ چاکەی وڵاتی کورد دەستیان کردەوە بە خەبات. نەوەی میر بەدرخان سورەیا بەگ لە ئەستەمۆڵ (کوردستان)ی دەرکرد، پاش ڕۆژی ٣١ی مارتی ساڵی ٣٢٥ (١٢ی نیسانی ١٩٠٩) کاتێك مەحمود شەوکەت پاشا بە لەشکری خۆی ئەستەمولی گرت** (کۆمەڵەی یەکگرتن و پێشکەوتن) **پەردەی لە ڕووی خۆی داماڵی. گەلێك کەسانی باشی وڵاتی ڕەوانەی بەندیخانە کرد و دووری خستنەوە، سورەییا بەگیشیان بە کۆنەپەرستی تاوانبار کرد و فڕێیان دایە بەندیخانەی "بەکر ئاغا بلۆك"یەوە، ڕۆژنامەی کوردستانیشیان داخست.** [٢٣]).

٣ــ پاشــان (**د. نــەجاتی عەبــدوڵڵا**) کــاتێ بــەراوردی نێــوان ســاڵی ڕۆمــی و زایینیمان بۆ دەکات وای لێ دەخوێنینــەوە پێــی وابــێ ئێمــە تەنانــەت ئاگامــان لــە ئەلف بێی ئەم بوارە نەبووبێ، ئەوەتا پێمانی دەڵــێ: (**جگــە لــەوە ســاڵی ڕۆمــی و ساڵی زایینی هیچ کات هاوتای یەك نین تا وا بە سووك و ئاسانی ساڵە زایینەکــەی بەرانبــەر دابــنێ، ســاڵی ڕۆمــی هەمیشــە بــەر دوو ســاڵی زایــینی دەکــەوێ**)، دوای ئەوەش خوا هەڵناگرێ زۆر خۆی ماندوو کردووە و حیسابێکی وردی بۆ کردووین تا مــاوەی (٣٩) ڕۆژی نێــوان کۆتــایی ســاڵی ١٣١٣واتــە (١٢)ی مــارتی ١٨٩٨و ڕۆژی دۆزینەوەی یەکەم ژمارەی (**کوردستان**)ی یەکەم، ئەو هەموو شێر و ڕێوییەشی بــۆ پاساوی ئەوەیە پێمان بڵێ: (**لەسەر بنەمای ئەم ڕاستییانە سوڕەیا بەدرخان هــیچ بە هەڵەدا نەچووە کە ئەم مێژووە ڕۆمییەی داناوە**). (**نووسەر**) دوای خەریککردنی خوێنەران بە خوێندنەوەی دوو لاپەڕە لە بۆچوونە سەیر و تێکــەڵ و پێکەڵــەکانی، دوای ئــەوە زیــاتر لــە لاپەڕەیــەکی بــۆ نووســیوین، هــەر هــەمووی پیاهەڵدانــە بــە (**سوڕەیا بــەدرخان**) و بــە (**بــەگزادە** و **مێــژوونووس** و **ڕۆژنامــەنووس** و **ســەرکردە**) پەسنی کردووە، ئێمە ئەوەندەی بیرمان لــێ کــردەوە تێنەگەیشــتین کۆکردنــەوەی ئەو هەموو پێناسە جیاوازانە لە پای چی و چ ڕاســتییەك دەخاتــە ســەر هــەڵێنانی مەتەڵی دانانی ساڵی (١٣١٣)ی ڕۆمی و (**اون برنجی سنه–سالا یـازدەیی**) لەســەر ڕووی ڕۆژنامەکە و زیرەکیی ئەو زاتە؟!. ئایا (**سورەیا بــەدرخان**) ئەگــەر جــارێکی دیکە بێتەوە ژیان ئەو هەموو پیاهەڵدانە قەبووڵ دەکات؟!.

**دووەم: ڕۆژنامــەی کوردســتان، دەورەی دووەم ( پێنجشــەممە: ١٤ کــانوونی دووەمی ١٩٠٩)**

بۆ ئەوەی هەمووان لە مەبەستەکانی هەردوولامان حاڵی بــن، پێمــان باشــە لــە وەڵامەکانماندا، بەر لەوەی بچینە ناو وردەکارییەکانی ئەم تەوەرە، زیــاتر بــەراورد لە نێوان هەندێ بۆچوونی (**نووسەر**) و خۆماندا بکەین:

١ ـ ئــەوەتا (**د.نــەجاتی عەبــدوڵڵا**) لــە بابەتەکەیــدا کــە ئامــاژە بــۆ (**دەورەی دووەم**)ی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)، واتە ئەو ڕۆژنامەی بەردەست، دەکات، پێی وایە مێژووی ئــەم ڕۆژنامەیــە تــا بڵاوکردنــەوەی نووســینێکی خــۆی لــە ســاڵی (٢٠٠٧)دا باسی نەکراوە: "**کوردستان *Kurdistan*. بەدرخان زادە ئەحمــەد ســورەیا بــەگ.**

**کۆنستانتینۆپل. نیو بەشی تورکی کوردی، هەفتەنامە"** گوایە ئەوان (**بۆ یەکەم جار مێژووی دروستی دەرچوونی ڕۆژنامەکەمان دەستنیشان کردبێت**). دوای ئەوەش ئەو دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکەی دەکەوێتە بەردەست، ئینجا دەنووسێ: (**ئەم زانیارییانە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵنەوە کە ڕۆژنامەی کوردستان (دەورەی دووەم) بەڕاستی دەرچووە و مێژووی دەرچوونەکەشی دەکەوێتە دوای ٢٩ ی تەمموزی ١٩٠٨.**) .

ئەوانە هەمووی لە کاتێکدایە، نە ئەم نووسینەی ئەو یەکەمە لە دەستنیشانکردنی مێژووی دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە، نە ئەویش بە دیارکردنی مێژووی دەرچوونی ڕۆژنامەکە شتێکی نوێی بۆ تۆمار کردووین، چونکە لە ماوەی (٢٥) ساڵی ڕابردوودا، ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین، (**د. کەمال فوئاد**) بە تەنیا، لە دووتوێی (٣) سەرچاوەی جیاوازدا، یەکلاییکردنەوەی دەستنیشانکردنی مێژووی دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیەی لە دووتوێی باسی (**کوردستان**)ی (**دەورەی سێیەم**) بۆ تۆمار کردووین[٢٤]. وەنەبێ (**نووسەر**) دوای (٥) ساڵ لە بڵاوکرنەوەی وتاری ئاماژە بۆ کراوی هاتبێ تەوازعی نواندبێ و بەم زانیارییانەی خۆیدا چووبێتەوە و ڕاستی کردبنەوە، بەڵکو دوای ئەم ماوەیە هاتووە شانازی بەم دەقەی خۆیەوە دەکات کە تیایدا دەڵێت: (**ماوەی یەك دوو ساڵێکە لە سەرچاوەیێکی ئاگادارەوە دەزانم کەوا ژمارە یەکی ئەم ڕۆژنامەیە لە یەکێك لە کتێبخانەکانی وڵاتێك دەست دەکەوێ، بەڵام داخەکەم تا ئێستە نەمتوانیوە بەردەستی بخەم**). جارێ لای هێروە دەمانەوێ بە (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) و توێژەران و خوێنەرانیش بڵێین کاتی خۆی، دوای دەرچوونی ژمارە (٢)ی گۆڤاری (**کوردناسی**)یەکەی (**نووسەر**) لە ئەڵمانیا، کە ئەم دەقەی سەرەوەمان تیایدا خوێندبۆوە لە داخی ناڕەوایی ئەم دەقە ئێستاش نازانین ئەم گۆڤارەمان تووڕ هەڵداوەتە کام قوژبنی کتێبخانەکەمان، دەزانن بۆ؟ چونکە لای ئێمە هیچ تۆژەرێك نابێت سەرچاوە و زانیاری لە خوێنەرانی و توێژەرانی دیکە بشێرێتەوە، لای ئێمە کاری وا ئەگەر خەڵك بە سەرچیغ بردن نەبێ، ئەی دەبێ چی دیکە بێت؟ کاتێ ناوی سەرچاوەکەی و کتێبخانەکەی ئەم وڵاتە نابات کە ڕۆژنامەکەی لێیە و دوای (٦) ساڵان کە دەستی لە بنی هەمبانەکە بەردەبێ، واتە (**کوردستان**)ەکەیی (**دەورەی سێیەم**)

دەدۆزرێتـــەوە و ئـــەویش هیچـــی ناکەوێتـــە بەردەســـت، ئینجـــا هـــاتووە نـــاوی سەرچاوەکەی و شوێنی پاراستنی ئەم ڕۆژنامەیەمان پێ دەڵێ! نەك هەر ئەوەندە (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) وا دەزانی ئەو سەرچاوانە هەر ئەو پێیـان دەزانـێ یـان هـەر لای ئەو هەن، ئەوەش بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە سەرچاوەکەی ئەو، هەر هیچ نەبێت، کە لە وڵاتێکی وەکو تورکیا چاپ بووە، دەبـێ چـەند هـەزار دانەیـەکی لـێ چاپ کرابێ، ئێ خۆ ماقوول نییە چەند دانەیەکی نەگەیشتبێتە دەست خوێنـەرانی کـورد، ئـەوەتا (**بنکـەی ژیـن**) مـاوەی چـەند سـاڵێکە ئـەم سەرچـاوەیان لـە کتێبخانەکـەیان پاراسـتووە، هـەروەها هاوکارمـان (**د.ئـازاد عوبێـد**) بـەم دواییـە ناردوویە لـە تورکیـاوە هەرسـێ بـەرگی کتێبەکـەیان بـۆ هێنـاوە، ئـەوەی شـایانی باسیشە دانەی ئەو کتێبـەی (**حەسـەن دومـان**) کـە (**د.نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) وێنـەی بەرگەکەی بەبێ چاکەتەکەی[٢٥] نیشانی خوێنەرانی دەدات، لای ئەو دوو شـوێنەی ئاماژەمان بۆیان کرد چاکەتەکەشیان لـە بـەر دایـە و هـەموو کەسـێکیش دەتـوانێ سوودیان لێ ببینێ!.

٢ ـ لـە بـارەی هەوڵـدان بـۆ دەستخسـتنی ئـەو ڕۆژنامـەی (**کوردسـتان**)ەوە، (**نووسەر**) چیرۆکێکی سەیر و سەمەرەی بەم شێوەیە بۆ گێڕاوینەتەوە:

ا ـ گوایە (**نووسەر**) کاتێ لە پاریس خوێنـدکار بـووە لـە ڕێگـای باڵیۆزخانـەی ئەو وڵاتە لە تورکیا داوایان کردووە کۆپییەکی ڕۆژنامەکەی بۆ پەیدا بکەن.

ب ـ (**نووسەر**) نیگەران بووە لە سـەر ئـەوەی ناوەکـەی خـۆی ڕۆژهەڵاتییـە و کوردیشە، بۆیە بە گومان بووە تورکەکان ڕۆژنامەکەی بۆ کۆپی بکەن، لەبەر ئەوە وەکو خۆی دەڵێ بە خانمی کتێبخانەکەی گوتووە: (**تکایـە بـە نـاوی قوتابییـەکی فەرەنسییەوە داوای ڕۆژنامەکە بکەن**).

ج ـ پاشـان بـەبێ لێکدانـەوە بـۆی نووسـیوین: پـاش زیـاتر لـە شـەش مـانگ وەڵامی باڵیۆزخانە ئـەوە بـوو "**ئـیتر پێـداگری لەسـەر داواکردنـی ئـەم ڕۆژنامەیـە نەکەن**[٢٦] ".

ئەگـەر بـە (**د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) بڵـێین زۆر مخـابن! هەقـە خوێنــەران و توێژەران گلەییمان لێ نەکەن، دەزانن بۆ؟ چونکە ئێمە پێمـان وایـە ئـەو داوایـەی (**نووسەر**) لە سەرچاوەی ڕاست و دروستی خۆی نەبووە، هەر کەسێ تـۆزێ ئاگـای

لە تێکەولێکەی بەڕێوەبردن هەبێت دەزانیٚ ئەو داوایەی (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) دەبێت لە ڕێگەی زانکۆوە بێت نەك لایەنی دیکە، پاشان هەقە بپرسین بۆ دەبیٚ ئەم جۆرە داوایانە لە (**ڕێگەی باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە تورکیا**)وە بێت، تۆ بڵێی زانکۆکانی فەرەنسا پێوەندییان لەگەڵ زانکۆکانی دەرەوە ئەوەندە لاواز بووبێت، تا نەیانتوانیبیٚ راستەوخۆ یان لەڕێگای ئینتەرنێتەوە ڕاستەوخۆ داوای سەرچاوەیەکی ئاوەها لە زانکۆکە بکەن؟.

سەیر و سەمەرەیە (**نووسەر**) پێی وابووبێت خەڵکی تورکیا ناوەکەی خۆی و باوکی لە منداڵەکانی خۆیان نەنێن! لەبەر ئەوەی گوایە ناوەکان کوردی بن!

**هەروەها** تۆ بڵێی ئەو کەسەی وەڵامی باڵیۆزخانەی گەیاندۆتەوە زانکۆکەی (**نووسەر**)، لەگەڵ دەستەواژەکەی "**ئیتر پێداگری لەسەر داواکردنی ئەم ڕۆژنامەیە نەکەن**" پەنجەیان لە زانکۆکەیان بەرز نەکردبێتەوە؟!.

(**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) ئەگەر بە خەیاڵی خۆی، یان بە پێی ئەو سەربوردانەی کە ساڵانی زوو لە هەموانیان دەگەیاند، گوایە کوردان لەم وڵاتەدا هیچیان نەکردووە و بواری هیچ جوولەیەکیشان نەبووە، لە ئێستادا ئێمە دەڵێین: ئەوە ئێمە خۆمانین، زۆر جارانیش لە نێو خۆمان، خۆمان دەستخەرۆ کردووە، نەوەك خەڵکی دیکە لە لاوە! ئەوە نییە ئێمە ڕۆژنامەکەمان هێناوەتەوە و پێویستیشمان بەم پێوەندییە دبلۆماسییانە نەبووە، ئەوە نییە باکوورییەکان دەمێکە ڕاچەنیون؟. نەك هەر ئەوەندە، لە ساڵی ١٩٧٦دا (**عەبدولسەتار تاهیر شەریف**[٢٧]) هەردوو ژمارە (٨،٩)ی (**کوردستان**)ی (**محەمەد میهری**) لە تورکیا هێناوەتەوە، هەرچی (**د.کەمال فوئاد**)ە تاقە ژمارە (١٨)ی (**کوردستان**)ی (**میقداد مەدحەت**)ی هەر لەو وڵاتە هێناوەتەوە و خۆیشی لە (١٠٠) ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دووبارە بڵاوی کردۆتەوە[٢٨]. ئێمە کە ئەم نموونانەتان بۆ دێنینەوە مەبەستمان ئەوە نییە لە هەموو لایەکی بگەینین، یان کارەکە ئەوەندە ئاسان بکەین، بەیانی ئاشقانی ئەم بوارە (**کوتك و سینگ**) ڕوو لە تورکیا و ئێران و شوێنانی دیکە بکەن! نەخێر زۆر جارانیش ئەم بوارە ماندووبوون و قوربانیی خۆی دەوێت. کەواتە دەکرا (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) لە ڕێگای کوردانی باکوور هەوڵی دەستخستنی ئەم جۆرە بڵاوکراوانەی بدابایە نەوەك ناوی سەرچاوەکان ئاوەها بە پەنهانی

بۆخۆی بهێڵێتەوە، دواتریش هیچی لێ دەست نەکەوێت، ئەوەتا ئێمە چەند ساڵێك بەر لەوەی لە نزیکەوە (**مالمیسانژ**) بناسین، لە ڕێگای (**نووسەر**) خۆیەوە فۆتۆیەکی ژمارە (٣)ی گۆڤاری (**هەتاوی کورد**)مان لای ئەو زاتە بۆ هاتووە، ئەگەرچی دواتر دانەی ئۆریجناڵی ئەو گۆڤارەمان کەوتۆتە بەردەست، بەڵام هێشتا هاریکاریکردنی هەردوو لامان مەبەستە و لە شوێنی خۆیدا تۆماری دەکەین، دڵنیاشین (**مالمیسانژ**) ئەو ژمارەی گۆڤارەکەی لە کتێبخانەکانی حکوومەتی تورکیاوە دەرهێناوە یان بۆی هاتووە.

دوای هەموو ئەمانە (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) دەگەڕێتەوە لای ڕۆژنامەکەمان و شوکرانەبژێری دەکات، گوایە چوار لاپەڕەی ژمارە (٣) و ژمارە (٤)ی ڕۆژنامەکەیان لەبەر دەستدایە، ئەوە لە کاتێکدا هەر ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە (٤) لاپەڕەیە، لەبەر ئەوەش کە هەردوو ژمارە تازە دۆزراوەکەی ڕۆژنامەکە، ماوەی نێوانیان سێ هەفتە بووە، واتە وەکو لەسەر رووی هەردوو ژمارەکە نووسراوە: هەفتانە دەرنەچووە، بۆیە (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) هاتووە لەسەر پێوەری ئەو سێ هەفتەیەی ئاماژەی بۆ کراوە، تەنانەت بە بێ ئەوەی بڵێ (**پێم وایە، وای بۆ دەچم، یان بە بۆچوونی من**) و زۆر دەستەواژەی دیکەی ئاوەها، بەڵام ئەو هاتووە خشتەیەکی بۆ دیار کردووین و زۆر بە ڕەهایی پێمان دەڵێت گوایە ژمارەکانی ڕۆژنامەکە بەپێی ئەو ڕۆژانەی تیایدا دیار کراون دەرچووبن، کە ئەو دیاری کردوون، لەوەش سەیرتر (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**)، جگە لەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی دیکەی لە بەر دەست بووبێ، شیمانەی ئەوەی کردووە ژمارە (٥)ی ڕۆژنامەکە لە چاپخانە دەستی بەسەردا گیرابێ!، دیارە بە هەبوونی ئەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە ناکرێت بزانرێت ژمارەکانی دیکە لە چ کاتێدا دەرچوو ون.

دیارە ئەو هاوکارەمان بەبێ وردبوونەوە و خوردکردنەوە و بیرکردنەوە، خۆی ماندوو کردووە، بۆیە لەم لایەنەشەوە کورتی هێناوە، ئەرێ بە ڕاست یەکێ بەڵگەیەکی لە بەر دەستدا نەبێ، یان هەندێ حاڵەتی هاوشێوە و پێشووتری نەبێت، چۆن دەبێت ماوەی نێوان دوو ژمارە تازە دۆزراوەی ئەم ڕۆژنامەیە، ئاوەها بە ڕەهایی بۆ خۆی بکاتە پێوەر و بنەمای ژمارەکانی دیکەی لەسەر هەڵنێ

و بگاتە (**ئەو باوەڕەی ژمارە یەکی ڕۆژنامە لە ڕۆژی پێنجشەممەی ١٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩ بڵاوکراوەتەوە و هەر تەنها (٥) ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە**)؟ ئەوەتا ئێمە بەم هەموو ئاگادارییەی خۆمانەوە، کە لە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردی پێی ناسراوین و هەمانە، ڕێگەمان بە خۆمان نەداوە پێشبینیی ئاوەها بکەین، تەنیا و تەنیا گوتوومانە: (**ئەگەر هەردوو ژمارەی(٢٦٤_٥) و (٢٦٤_٦)یش دەرچووبن**). دوای هەموو ئەمانە (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) خشتەیەکی بە شێوە جوان و ڕێکوپێکی بۆ کردووین، دیاریشە خۆی پێوە ماندوو کردووە، بەڵام ناکرێت بایەخێکی زانستی بۆ دابنرێ و بکرێتە سەرچاوە بۆ هەر پرۆژەیەکی نووسینەوەی مێژووی ڕۆژنامەنووسی، چونکە (**نووسەر**) لەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە زیاتر هیچ بەڵگەیەکی دیکەی بە دەستەوە نییە، کێ دەڵێ ژمارەکانی دیکە لە کات و ساتی خۆیاندا، واتە هەفتانە دەرنەچوون، یان کاتی زۆرتریان بۆ دەرچوونیان پێ نەچووە؟ ئەوەتا ئێمە لە سەر ئەو بنەمایە، بە گریمانەی ئەوەی ڕۆژنامەکە هەفتانە دەرچووبێ، پێشبینیی ئەو دوو ژمارەیەی سەرەوەمان کردووە، لەوانەیشە لەم ماوەیەدا هیچ ژمارەی دیکە، واتە ژمارە (٦،٥)ی ڕۆژنامەکە دەرنەچووبێ، هەروەها ئەگەر گریمانەی ئەوەش نەکەین ژمارە (٢،١)ی ڕۆژنامەکە، ئەوە ئەگەر ڕۆژنامەکە ژمارە (**سفر**)ی لێ دەرنەچووبێ[٢٩]، وەکو لە سەر ڕووی نووسراوە هەفتانە دەرچووبێ، ئەوا مەرج نییە بە سێ هەفتە جارێکیش دەرچووبێ[٣٠].

**سێیەم: گرێکوێرەی ژمارە (٢٦٤)**

ئەمەیان دوا تەوەری بابەتەکەی (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**)یە، هەر لە سەرەتادا ئەم دەقەی لە بابەتەکەی ئێمە هێناوەتەوە کە دەڵێ: ( **نەك هەر ئەوەندە لەوەش سەرسوڕهێنتر، کە لە سەرەوەی ڕۆژنامەکە و لە پاڵ هەردوو ژمارەی (٣،٤)ی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە: (عدد–٢٦٤–٣)، (عدد ٢٦٤–٤)...**)، پاشان (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**) دەپرسێ: نازانم ئەمە دەبێت چ سەرسوڕهێنییەکی تێدا بێت، وەکو دەبینن (**نووسەر**) نیشانەی پرسیاری دانەناوە، بەڵام دیارە ئەوە مەبەستێتی و هەر خۆیشی وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: (**مەبەست لەو (٢٦٤)ە بە هیچ شێوەیەك بەردەوامی ژمارەی ڕۆژنامەکە نییە بەڵکو واتە تیراژی ڕۆژنامەکە دەگەیەنێت و**

**هیچی تر. واتە رۆژنامەکە تەنها (٢٦٤) دانەی لێ چاپکراوە)**. پاشان لە بڕگەیەکی دیکـەی بابەتەکەیـدا دەڵێت: (**ئەگـەر لـە ژمـارە (٣) ی ڕۆژنامەکـە بنووسـرابوایە (٢٦٤-٣) و لە ژمارە (٤)ەکەش بنووسرابوایە (٢٦٥-٤) ئەوسا ڕێی تـێ دەچـوو کەمێك سەرسوڕهێن بوایە**).

دیارە ئێمە هەر لە بەراییەوە ڕێزی ڕاکانی (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**)مـان گرتـووە، بۆیە نەبووینەتە ڕێگری بەردەم بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی، بەڵام هەندێ پێوەر بـۆ سەلماندنی ئەم جۆرە بابەتانە هەن وا پێدەچێت (**د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) ئـەلف و بێیەکەشیانی نەزانیبێ! ئەگەرنا چۆن ئاوەها بە سـادە و سـاکاری و بـەبێ بـوونی بەڵگە یان پرسکردن بە کەسێکی شارەزا ئەم جۆرە ڕایانە بدات؟، بە نموونە ئێمـە تـاوەکو ئـەمڕۆ دەیـان، بـەڵکو سـەدان ڕۆژنامـە و گۆڤارمـان بینیـوە و هـەڵگێڕ و وەرگێڕمان کردووە، نەمان بینیوە هیچ کام لەم ڕۆژنامانە تیراژیان بـەم شـێوەیە و لـەم شـوێنە نووسـرابێ، زۆر باشـیش دەزانـین تـیراژ لـەناو (**تەرویسـە**[٣١])دا دەنووسرێ، نەوەك شوێنێکی ئاوەها، بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیش زۆر بە تەوارزوعـەوە پرسمان بەم کەسانەش کردووە کە زانیومانە ڕۆژانـە مامـەڵیان لەگـەڵ دەرهێنـانی گۆڤار و ڕۆژنامان هەبووە[٣٢]، بۆ ئەم ڕۆژنامەی (**کوردسـتان**)ەش ڕای **هەریـەك** لـە (**محەمەد زادە**) و (**عەبدولقادر عەلی مەردان** ) و (**عوسمان پیرداود**)مـان وەرگـرت، **هیچ** کام لەو بەڕێزانە بۆچوونەکانی (**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**)یان لە سـەر (**تـیراژ**) پـێ ڕاست نەبووە، بەڵکو ئەوان تەنیا کۆی ژمارەکانی سـاڵانی پێشـوویان بـۆ ژمـارەی (٢٦٤)ەکە داناوە، دووەم ناویشیان گریمانەی (**ژمـارەی تۆمـارکردن**)یشـی بـە بـیر **هێنا**ینەوە، هەرچی (**د. ئـازاد عوبێـد**)ە دەسـتەواژەی (**هـەر نـابێ!**)ی بـۆ تـیراژی (٢٦٤) دانـاوە. خۆمـانیش لامـان سـەیر بـووە کـە چـۆن (**د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) پرسـیاری ئـەوەی لـە خـۆی نـەکردووە چـۆن دەبـێ ڕۆژنامـەی (**کوردسـتان**) لـە ئاوارەیی دەرەوەدا، با نەڵێین (٢٠٠٠) دانە بەڵکو بڵێین (٢٠٠) دانەی لێ هاتبێتـەوە (**کوردستان**)، خۆ دەبێ ئەوەندەشی لای خاوەنەکەی مابووبێـت، جـا چـۆن دەبـێ لەم ئازادییەی دوای تەممووزی ١٩٠٨ تیراژی تەنیا (٢٦٤) حەب بووبێت؟ ئەوە بـە چاوپۆشین لەوەی، ساڵانی دواتـریش تـا ئـەمڕۆ، کۆمـەڵێك نموونـەمان لـەو شـێوە ژمارە لەسەردانانە هەن، لە محازەرەکەشماندا، کـە ڕۆژی ٢٠١٣/٤/٢٢ لـە کۆلیـژی ئاداب بۆیان ساز کردبووین، پێشبینیمان کردبوو لە دواڕۆژدا ڕووبەڕووی ئەم جۆرە

پرسیارانە ببینەوە، بۆیە هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامەمان هەڵبژاردبوو تا نیشانی ئامادەبووانی بدەین، بەڵام بە داخەوە هەندێ کەس پەلەیان دەکرد و لێ نەدەگەڕان باسی وردەکارییەکانی ئەم لایەنەیان بۆ بکەین، پێیشیان بڵێین لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا چەند حاڵەتێکی لەم جۆرەمان هەیە، بە نموونە (**بانگی کوردستان**[٣٣])ی مستەفا پاشا یامولکی، ڕۆژنامەی (**برایەتی**[٣٤])ی ساڵی (١٩٧٤) و (**بەربانگ**[٣٥])ی فیدراسیۆنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کوردستان لە سوید.

ئەوە جگە لەوەی بە چەند ڕۆژێك دوای ئەو محازەرەی (**کۆلێژی ئاداب**)، پەیامنێرێکی ڕۆژنامەی (**کوردستانی نوێ**) هاتەماڵەوە و چاوپێکەوتنێکی تێر و تەسەلی لەگەڵ کردووین و وەڵامی زۆربەی ئەو بابەتەی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)ی تێدا نووسراوەتەوە، کە لە بڕگەیەکیاندا هاتووە:

"بەڵام ئێمە بیرۆکەی ئەوەشمان هەیە کە یەکەم ڕۆژنامەی (**کوردستان**) بە قۆناغ دەرچووبێت، وەکو دەبینن ئەو دوو ژمارەی ئێستا لەبەر دەستە، ژمارە (٢٦٤- ٣) و (٢٦٤- ٤) لەسەری نووسراوە، لەوانەیە ئەو (٢٦٤)ی پێش تەقەڵەکە نیشانەی دەرچوونی قۆناغی یەکەم جاری دوای دەرچوونی یەکەم جاری پێش وەستان ساڵی (١٩٠٦) ی بووبێت، بەم (٣١) ژمارانەی دەورەی یەکەمیشەوە، دواتریش لە دوای مەشرووتە لە ئەستەمبوڵ جارێکی دیکە دەرکرابێتەوە و ژمارەکانیان بەم شێوەیەی باسم لێوە کرد، لەسەر دانابێ، چونکە دەبینین لە ساڵی ١٩٠٦دا سوڵتان عەبدولحەمید هەموو خێزانیی بەدرخانییەکانی، بە خزمەتکارەکانیشیانەوە گرت و دەربەدەری کردن و سواری کەشتی کردن و ناردنی بۆ دوور، ئەوانە ژمارەیان سێ هەزار کەس بوو، ئیدی ئەوکاتە ڕۆژنامەکە لە ژمارەی ٢٦٤ ڕاوەستابێت و لە ساڵی ١٩٠٨، کە مەشرووتە بووە، دووبارە گەڕاونەتەوە ئەستەمبوڵ و ڕۆژنامەکەی خۆیان دەرکردووەتەوە، واتە (٢٦٤- ١) و (٢٦٤- ٢) و (٢٦٤-٣) و (٢٦٤-٤)، ئەگەر هەردوو ژمارەی (٢٦٤-٥) و (٢٦٤-٦)یش دەرچووبن، من ئەو مەزەندەیە لە هەمووان بە نزیکتر دەزانم. (**د. کەمال مەزهەر**)یش بە پاڵپشتی (**ڕامزوور**) دەڵێت تا ساڵی ١٩٠٤ بەردەوام بووە[٣٦]، بەڵام هەر خۆیشی ڕەتی داوەتەوە، هەندێ لە نووسەر و تۆژەرانی دیکەش دەڵێن (**کوردستان**) تا ساڵی ١٩٠٦ بەردەوام بووە، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەمین (**زەکی بەگ**)یش[٣٧] دەڵێت یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە ئەستەمبوڵ دەرچووە، پێم وایە ئەو زانیارییانەی کە (**ئەمین زەکی**) داویەتی هەندێ ڕاستی دروستی دەبێت تێدا

بێـت[٣٨]". زانیارییـەکی دیکـەی زۆر سـەرنجڕاکێش لـە سـەر زاری (**ڕەوشـەن بەدرخان**) ی کچی (**محەمەد صالح بـەدرخان**)ە. دەقێکـی یـەجگار سەرنجڕاکێشـی لەسەر ئەم ڕۆژنامەیەی بۆ تۆمار کردووین[٣٩]

دواجار، ئێمە نە پاڵپشتییەکی دارایی دەزگایەکمان هەبووە، نە پێویستیشمان بـە قونسـولخانەی تورکیـا هـەبووە وە ئـەم دوو ژمارەیـەی (**کوردسـتان**)مـان هێناوەتـەوە، چـەند ڕۆژێکـی دیکـەش وا (**د.نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) لەسـەر حیسـابی ئەکادیمیای کوردی دەچێتە ئێران، بابزانین ئەویش عـەقڵی پێدادەشـکێ هـیچ کـام لەژمارەکانی ڕۆژنامەی (**کورد**)ی سمکۆی شـکاك یـان تـەنها یـەك دانـە لـە ژمـارە بزرەکانی (**کوردستان**)ی سەردەمی (**قازی محەمەد**)مان بۆ دێنێتەوە؟!

ماوەتەوە ئەوەش بڵێین (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)، لەم بابەتەیدا هەتا (٤) جـاران دەستەواژەی (**زەنگەنەی خۆشەویست**)ی بۆ بەکار هێنـاوین، نووسـەر دەبوایـە لـە نـاو دوو (**جووتکەوانـە**)ی بچـووك دانابـا، چـونکە ئـەم دەسـتەواژە تایبەتـە بـە (**د.کـەمال مەزهـەر**) و هـەر ئـەویش، دایهێنـاوە و زۆرجـاران لـە چـاوپێکەوتنە ڕۆژنامەنووسییەکانی بەکاری هێناوە. بەهەر حاڵ ئومێدەوارم چرنووکەکانم کەسـی بریندار نەکردبێت، مەبەستی هەموو لایەکمان تەنیا لەوی دیکە زیاتر خزمەتکردنە، چارەنووسـیش هـەر لای ئـەو خاکەیـە کـە شـەڕی لەسـەر دەکـەین، سـوپاس بـۆ (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) و هەموو ئەوانی دیکـە کـە بوونەتـە هـۆی مانـدووبوونمان بـۆ گەڕان بە دوای ئەوندە ڕاستی و ساخکردنەوانە!

## ئەنجام

هەندیٚ جاران (**سەرەنجام**)یشی دەخرێتە شوێن، ئێمە کە نە (**زمانـەوان**)یـن و نە هیچیش لە پەرەسەندنی زمانەکان دەزانین، ڕێ بە خۆمان نادەین بڕیار لە سەر هیچ بابەتێك بدەین لایەنی زمان و زمانەوانی بگرێتەوە، بەڵام ئـەوەش دەزانـین لـە زمانی دایکدا سەلیقە ڕۆڵی خۆی هەیە تا کەسیٚ بزانیٚ ئەم وشەیان لـەوی دیکـەیان ڕەسەنترە. ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین ئەم دوو وشەیە لای فارسانی ئامۆزاشمان بە کار دەبریٚ، بەڵام هەردوو وشەکە لای توێژەرانی خۆمان سەنگ و بایەخی تایبـەتی خۆیان هەیە، چونکە لە هەر لێکۆڵینەوەیـەکی ئـەکادیمی دەبـیٚ هانـای بـۆ بـبریٚ! ڕەنگە نرخەکەشیان لە توێژەرێکـەوە بـۆ یـەکێکی دیکـە بگـۆڕیٚ، هەیـە بـە تـەنیا بە(٥٠) وشـە وازی لـیٚ دێـنیٚ و مەبەسـتەکانی دەداتـە دەسـت، یـەکێکی دیکـەش، خۆمان ئاسا، بە (٣٠٠) وزیاتریش، ئینجا لەوانەیە هێشـتا بۆیـان ڕایـی نـەبێت، لای (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)یش لە ژێر ناوی دوا ناوونیشاندا، ببوورن لە بیرمان کرد بڵێین لەژێر ئەو ناوونیشانەی کە دواتر لە جاری دووەم یان سێیەمدا خستوویەتییە سـەر ئەو بابەتە، نرخەکەی تەنیا (١٣٣) وشە بووە، بەڵام نـەك بـەم ناوانـەی سـەرەوە، بـەڵکو بـە نـاوی (**ئـەنجامگری**)ییـەوە، ئێمـە کـە تـاوەکو ئێسـتا پـتر لـە (١٠) فەرهەنگمان زیاتر هێناوەتە بەردەست، نەك هەر نەمانبینیوە هـیچ کامیـان مانـای ئەم وشەیان لێك دابێتەوە، بەڵکو لە هیچ کامیاندا نەبووە! سوێند لە سـەر وشـەی (**انجم گری**) فارسی ناخۆین کە لە (**فەرهەنگی هەژێر**)دا بە (**مەکر و فێڵ**) مانای بـۆ لێك داوینەتەوە، لای (**فەرهەنگی مامۆستا**)ش (**ئەنجام گـیری کـردن**) هەیـە و مانـا کوردییەکەی بە (**دەرهێنان، لیٚ پەیداکردن**) لێدراوەتەوە، کەواتـە ئـەوە ڕێگـەمان پیٚ ناگریٚ هەر بە سەلیقە بڵێین ئەو (**گری**)یـەی (**د.نـەجاتی عەبـدوڵڵا**) بـاری ئـەم (**ئەنجام**)ە بەسەزمانەی پیٚ گران کردووە، ئەوە بێی سەلیقەی کوردەواری دانـراوە ئاگاداری ئەوەین لە لاپەڕە (٢٧٩)ی ژمارەی ڕابردووی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی وشـەی (ئەنجامگیری)یـەك بـەکارهێنراوە، بەداخـەوە لێـرە نـەبووین قسـەیەکی لەبارەوە بکەین، تۆ بڵێی د.نەجاتی عەبدوڵڵا لەژێر کاریگەری ئەم بابەتەدا وشـەی (ئەنجامگری)یەکەی خۆی دانەهێنابیٚ؟. بە هەر حاڵ لێرەدا ئێمە قسـەمان لەسـەر

ڕۆژنامەی (**کوردستان**) و ئەو (**ئەنجام**)انەیە کە (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) پێیان گەییوە، بە چاوپۆشین لەوەی چەندە بە دەرهێنانیانەوە ماندوو بووە، ناکرێ بە وەڵامی بنەبڕ و دوا ئەنجام و کۆتایی دابنرێن، پرسیارەکان هێشتا چاوەڕێی گەڕان و سووڕان و ساخکردنەوە و وەڵامی ماندوونەناسانن، ئەم کارانەش لەسەر دەستی هەرکەسێکەوە بێ ئێمە هەر لە ئێستاوە بە گەرمی دەیانگوشین. با ئەوەش بزانرێت ٢٢/٤ی هەر ساڵێك لای ئێمە پیرۆزیی خۆی هەیە و بەم جۆرە بابەتانە کاڵ نابێتەوە.

لە ئێستادا ئەوە سەلمێنرا کە هەردوو دەستەواژەی (**عدد-٢٦٤-٣**)، (**عدد ٢٦٤-٤**) ناکرێ بە ژمارەی تیراژ دابنرێن، بەڵام لەوە دەچێ ئەم بابەتە چەندەی لێی بکۆلرێتەوە ئەوەندەی دیکە پرسیارەکان بە سەر یەکدا بکەون، بەردەوامیش پرسیاری نوێ بە دوای خۆیاندا بهێنن..! ئەوەتا کاتێ دەمەویست ناوەرۆکی ئەم بابەتە بە کورتی ببڕمەوە و خەریکی نەخشەسازی بووین، تەلەفۆنێکی د. ئازاد عوبێد و هێنانی سەرچاوەی ئەم دەقەی خوارەوە هەڵوەستەی دیکە پێ کردوم: (لە سەرەتای ساڵی ١٩٠٨دا بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی سەری هەڵدا و داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد، (**سورەیا بەگ بەدرخان**) کە یەکێك بوو لە بنەماڵەی بەدرخانییەکان، سەرۆکی ئەو بزووتنەوەیە بوو، پێش ئەم بزووتنەوەش بەدرخانییەکان دژی دەوڵەتی عوسمانی شۆڕشیان کردبوو، **لەپاش شۆڕشەکە سورەیا بەگ ڕووی کردە ئەستەموڵ و لەوێش نیشتەجێ بوو**، کە لە ئەستەموڵدا بارودۆخی نوێی بەدیی کرد و کاربەدەستانی نوێی تورکیاش ئەو بارودۆخەیان پێ باش بوو، **بۆیەکا سورەیا بەگیش ئەو هەلەی قۆستەوە و ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دامەزراند، لە ڕۆژنامەکەدا بیری (قەوارەیەك)ی بۆ کوردی خستە ناوناوان و کەوتە لێدوانی**، لە ئەنجامی پەیدابوونی ناکۆکی و نەگونجانی بیروڕای سورەیا لەگەڵ کاربەدەستانی ئیتیحاد و تەرەقیدا، **بە ناچاریی ئەستەموڵی پایتەخت جێ بهێڵێ و ڕوو بکاتە میصر، لەوێش ڕۆژنامەکەی خستەوە کار و لە هەفتەیەکدا دوو جار دەکەوتە بازاڕ**).

بنوارە: کورد و کوردستان، کۆمەڵێك لە پسپۆران و ئەفسەرانی سیاسیی ئینگلیز، وەرگێڕان: حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی و حسێن ئەحمەد جاف،

بڵاوکـراوەی ئـاراس، ژمـارە: (١٩١)، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٢، ل (٣٧).

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا ئەم دوو دێڕەی کۆتایی ئەم دەقەی سەرەوە، مەبەستی ڕۆژنامەکەی دەورەی سێیە بووە کە هەر (١٥) ڕۆژ جارێك، لە ساڵانی ١٩١٧ـ١٩١٨دا لە میصر بڵاوکراوەتەوە و (١١) ژمارەی لێ دەرچووە و ئێستا وا لە بەر دەستە؟ یان وەکو ئەو سەرچاوەی سەرەوە باسی کردووە، (**ئەحمەد ئازیزی**) هەر ئەوسا دوای دەرچوونی لە ئەستەموڵ و چوونی بۆ میصر، نەك هەر بەردەوام بووە لە سەر بڵاوکردنەوەی (**کوردستان**)ی دەورەی دووەم، بەڵکو ڕۆژنامەکەی لە هەفتەدا دوو جاریش دەرچووە؟!!

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) ئـەوە مـاوەی پـتر لـە (١٠) سـاڵێکە هەسـتمان کـردووە ئەرشـیفکردنی ئـەم بڵاوکراوانـەی سەردەمی ڕژێم بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەو کاتە چەندە گرنگن، بەڵام سەرەتا هەبوو دژی ئەم بۆچوونەی ئێمە بوو، بە داخەوە دوای ڕاپەڕین، لە کوردستان کەسانێك هەبوون هەموو ئەم بڵاوکراوانەیان لەناو بردووە، نەبادا یەکێك جێ پەنجە یان وێنەیەکیان لەگەڵ سـەرۆك و داروودەستەکەی ڕژێم ببینێ، واتە لە ئێستادا ئەم جۆرە بڵاوکراوانە لـە کوردسـتان زۆر کـەم بوونەتەوە، ئومێدەوارین ئەوانەیان کە لە کتێبخانە گشتییەکاندا هەڵگیراون باش پارێزراون.
بیرمـە ژنێـك لـە هـەولێر، کـە پێشـتر دراوسـێی مـاڵی بـاوکم بـوو، شـووی بـە پیـاوێکی خانەقینی کردبوو، کە ئەوسا لەم شارە دادەنیشت، کابرا هەوەستی بـە وتارەکـانی سـەدام دەهات و هەر هەموویانی لای خۆی پاراستبوو، لە دوای ڕاپـەڕین لێـی قـەوما و لـە ناچـاریا ڕووی لە یەمەن کرد، ژنەکەیشی لە کوردستان مابووەوە، لەبەر پێویستی دەسـتی کـرد بـە فرۆشـتنی ماڵەکـەیان، لـە ڕێـی خوشـکێکم پێشـنیازی کردبـوو ئێمـە بچـین هـەر (٥٠٠) کاسێتەکەی وتارەکانی صەدامی لێ بکڕینەوە و لای خۆمان ئەرشیفیان بکەین، بە داخـەوە من ئەوسا لە توانامدا نـەبوو کاسـێتەکان بکڕمـەوە، کـاتێکیش هـەوڵم دا پـارەی بـۆ دابـین بکەم، هەندێ کەس کە بە مەبەسـتیان زانـیم لـە کڕینـەوەی سـاردیان کردمـەوە، خانمەکـە ناچار بوو هەموو کاسێتەکانی بردنـە دەلالخانـە و وتارەکـانی ڕەش کردنـەوە و بـە بـەتاڵی فرۆشتنی، لە ئێستاشدا ئەوانەی ڕێگرییان لە ئێمە دەکرد وا خۆیان بە دوایانـدا دەگـەڕێن و پەشیمانبوونەوەش داد نادات!.

(٢) هەر کەسـێك تێبینییـەکی لـە سـەر وەرگێڕانـی ئـەم دوو ژمارەیـەی ڕۆژنامەکـە هەیـە، یـان زانیاریی دیکەی لە بارەیانەوە هەیە، بەر لەوەی ڕۆژنامەکە بخرێتە سەر ئەو پرۆژەیـە، کـە چـەند سـاڵە لەسـەر (**کوردسـتان**)ی (**میقـداد میدحـەت**) و دەورەی سـێیەمی (**سـورەیا بەدرخان**) ئیشی لەسەردەکەین، ئاگادارمان بکاتەوە، هەرلە ئێستاوە سوپاسی دەکەین.

(٣) بنوارە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیکـەی ڕۆژنامـەی کوردسـتان، گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی، ژ (٢٥)ی ٢٠١٣، هەولێر ٢٠١٣، ل(١٢٩ـ ١٤٥).

(٤) کاتێك هەستمان کرد وەرگێڕانی تەواوی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەمان لە کات و ساتی خۆیدا بۆ ناچێتە سـەر، بـە تایبـەتی کـە لـە ٢٠١٣/٤/٢دا دەبوایـە سـەفەری دەرەوەی وڵات بکـەین، هەروەها لەبەر چەند هۆیەکی پەیوەست بە سروشتی گۆڤاری ئەکادیمیای کـوردی نـەکراوە هەموو بۆچوونەکان بخەینە سەر کاغەز.

(٥) د. کەمال فوئاد، کوردسـتان یەکـەمین ڕۆژنامـەی کـوردی، دەورەی سـێیەم ١٩١٧ـ ١٩١٨، کۆکردنەوە و پێشەکی، سلێمانی ١٩٩٨، ل ٣.

(٦) جەمال خەزنەدار تا ساڵی (٢٠١٠) پێی وابووە: "لە هەندێ سەرچاوە تۆمارکراوەکانی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، دەستنیشانی ئەوە کراوە، کە لە ساڵی ١٩٠٨ و بە دواوە، ڕۆژنامەی کوردستان بۆ جاری دووەم لە ئەستەنبووڵ لە لایەن نەوەی بەدرخانییەکان، ((**سورەییا بەدرخان**))ەوە دەست بە بڵاوکردنەوەی کراوەتەوە. بەڵام بە داخەوە تا نووسینەوەی ئەم باسە هیچ ژمارەیەکی ئەم قۆناغە نەبینراوە و هیچی لەسەر نەنووسراوە و فۆتۆکۆپی هیچ ژمارەیەکیشی بڵاونەکراوەتەوە، لەبەر نەبوونی زانیاری کۆنکریت و تەواو لەبارەی ئەم قۆناغە، ئەم پرسیارانەی خوارەوە سەر هەڵدەدەن و پێویستییان بە وەڵام هەیە: ژمارەی (١)ی لە چ ڕۆژێك دەرچووە؟. ئایا هەر بە زنجیرەی ژمارەکانی قۆناغی یەکەم دەرچووە، یاخود زنجیرەی تازەی بۆ دانراوە؟. بە چەند لاپەڕە و بە چ قەوارەیەك دەرچووە؟. چەند ژمارەی لێ دەرچووە و دوا ژمارەی چەند بووە و کەی دەرچووە؟. دیارە تا دۆزینەوەی ژمارەکانی ئەم قۆناغە، ئەم پرسیارانەی سەرەوە بێ وەڵام دەمێننەوە".

بنواڕە: جەمال خەزنەدار، ئینسكلۆپیدیای ڕۆژنامەگەریی کوردی، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل(٢٨).

(٧) بنواڕە: کوردێکی یەکڕەنگ = عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕۆژنامەنووس (**گۆڤار**)ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە (٢٣,٢٤)ی زستانی ٢٠١١، ل(٣-١٠).

(٨) کۆمەڵێك خەڵك و جوانی خۆبەخشن، ماوەی سێ ساڵێك دەبێت، بە پاڵپشتی (**ئەنستیتوی کورد لە ئەستەمبۆل**) و بەبێ هاوکاری دارایی حکومەت، کار بۆ دۆزینەوە و خستنەوە بەردەستی کولتووری شاراوە و گومکراوی کوردان لە باکوور دەکەن، تا ئێستا چەند کارێکی بەرچاویان کردووە، دوا بەرهەمیان چاپکردنەوەی هەرچوار ژمارەکەی گۆڤاری (**ڕۆژی کورد - ١٩١٣**) بوو، ئەوە بوو لە سەد ساڵەی ساڵوەگەڕی گۆڤارەکە کۆنگرەیەکیان لە ئەستەنبۆڵ بۆ بەستا، ئێمەشیان وەکو شارەزایەکی (**ڕۆژی کورد**) و نوێنەری (**بنکەی ژین**) بانگ کردبوو، ئەم ڕۆژنامە دانسقەیە بەرهەمی ئەم سەفەرەیە و بە خەبات و یارمەتیی ئەو سێ ئەندامەی کۆمەڵەکە (**تاهیر بایکوشاك و سەرحەد بۆزگورد و یەنەر ئوچ**) دۆزراوەتەوە.

(٩) ا- هەواڵی دۆزینەوەی ئەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە و وێنەیان، بەر لە ساڵیادی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی پێشین، تەنیا وەکو مژدە و زوو بە زوو بە پێوەندیداران ڕابگەیێنین.

ب - زۆربەی لاپەڕەکانی ئەم دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە بە زمانی تورکی بوون، تا لە ناوەڕۆکەکانیان تێبگەین، دەبووایە بۆ زمانی کوردی یان عەرەبی وەربگێڕدرابان، نەك هەر ئەوەندە بابەتە کوردییەکانیش وەکو خۆیان خوێندنەوەیان هەندێك گران بوو، بۆیە دەبوایە بهێنرێنە سەر ڕێنووسی باو و خوێندنەوەیان ئاسان بکرێت، ئەوەش ماوەیەکی دەویست.

(١٠) بابەتەکانی ئەم دوو ژمارەیەی (**کوردستان**)یش بە هەمان شێوەی جزیر و بۆتان، کە ڕۆژنامەکەی جاری یەکەمی پێ دەرکراوە، بڵاوکراوەتەوە، چەند ساڵێك لەمەوبەر، کاتێ کارمان لەسەر ڕۆژنامەی یەکەم دەکرد، زەحمەتییەکی ئەوتۆمان هەست پێ نەدەکرد، بەڵام دوای ئەوەی بابەتە کوردییەکانی ئەو دوو ژمارەیەمان هێنانە سەر ڕێنووسی نوێ، بۆ دڵنیابوون لە کاری ڕێنووسگۆڕکێیەکە، ناردمانە دهۆك بۆ لای مامۆستا(**موسەدەق توفی**)، بەڵام نایشارینەوە و دەبێ بڵێین لە هەردووکمان وردتر بۆ ئەم کارە (**شێرزاد فەقێ ئیسماعیل**)ی هەڵەگری گۆڤارەکەمان بوو، بابەتە تورکییەکانیش، لەلایەن مامۆستا (**ئەمین شوان**) کراونەتە کوردی.

(١١) لە دوای (٦) ڕۆژ چاوەڕێکردن و نیگەرانیمان لە ئەستەنبۆڵ، ئینجا کاك (**تاهیر بایکۆشاك**) ڕۆژی ٢٠١٣/٣/٢٠ لە ڕێگەی نامەی ئەلیکترۆنییەوە وێنەی هەردوو ژمارەکەی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی بۆ وەرگرتین، ئەگەر بڵێین لەو کاتەدا ماوەی چەند سەعاتێك، لەجیاتی خۆشی، زیاتر نیگەران ببووین، تا وام لێهات لەجیاتی گەڕانەوەمان، خۆم و هاوسەرەکەم زیانی فڕینی ئەو ڕۆژەی فڕۆکەکەمان قبوڵ بێت و بە ناچاری بمێنینەوە، شەوەکەی ئەو ڕۆژە هەموو نیگەرانییەکەی خۆمان بەوە لابرد لەگەڵ هاوسەرەکەم و (**تاهیر بایکۆشاك**)ی هاوکارمان لە ناو ئەستەنبۆڵ بە هەموو ئەو شوێنانەدا بسووڕێینەوە کە کاتی خۆی ئەم ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ە و (**ڕۆژی کورد**) و (**هەتاوی کورد**)یان لێ دەرچووە، نەك هەر ئەوەندە بە دوای ناوی ئەو باڵەخانانەشدا گەڕاین کە کاتی خۆی بارەگای ئەم بڵاوکراوانەی لێ بووە، چونکە باڵەخانەکانی ئەوسا زۆربەیان ناو و ساڵی دروستکردنیان لە سەر سەردەرەکانیان نووسراون.

(١٢) بەڵام بەر لە هەر شت، ئێمە هەستە ڕۆژنامەنووسییەکەمان پێمان دەڵێت ئەم جۆرە بابەتانەی وەکو هەواڵی دۆزینەوەی ئەم دوو ژمارەیەی (**کوردستان**) دەبێت بە شێوازێك بنووسرێن کە مەبەستەکانی تێدا بپێکێرێ، تۆژەرانیش ئاگاداری هەموو وردەکارییەکان بکرێن، کاتی خۆیشی د. مارف خەزنەدار و د. کەمال فوئاد، بەم دواییەش مالمیسانژ و د.جەلیلێ جەلیل، تەنانەت محەمەد ئەمین بۆزئارسلانیش. هەر بەم شێوازە نووسینە وردەکارییەکانییان لەسەر (**کوردستان**) بە خوێنەران داوە.

(١٣) ئەگەرچی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) زۆر جاران هەوڵی داوە، دان بە ماندووبوونمان لە بابەتە بڵاوکراوەکانی خۆی نەنێت، **<u>بە قسەی خۆی</u>** گوایە ئەو زەمانەکەی ڕەوانە!، بەڵام ئێمە لە گۆڤارەکەماندا هەموو جار بە پێی ڕێنماییەکان کارمان لە سەر کردووە، بە نموونە نووسەر لەو (**بەرایی**)یەی کە بۆ بابەتەکەی خۆی نووسیویە، کاتێ دەیەوێ ئاماژە بە کورتە دەقێکی وتارەکەی ئێمە بکات نووسیویە: (**<u>بە قسەی خۆی گوتەنی</u>**)، ئێمە لە ئێوە دەپرسین و دەڵێین: ئەرێ بە ڕاست لە کوردەواریدا، بە تایبەتی لەو دەڤەرەدا کە نووسەر

تێیدا گەورە بووە، ئاوەها وشە و دەستەواژەکانیان گۆ دەکەن؟ یان وەکو ئێمە لە سەرەوە نووسیومانە، دەڵێن: **به قسەی خۆی** یان دەبێ بنووسرێ: **خۆی گوتەنی**..!

(١٤) با خوێنەران خۆیان چاوێك بە وتارەکەی (**د.جەبار قادر**)دا بخشێننەوە و لەگەڵ ئەوەی ئێرەدا بەراوردی بکەن، هەر زوو هەست دەکەن کەلێنێك هەیە و هەست دەکەی ئەوەی ڕەخنەگرەکەی ئێمە، نەك هەر هەمان بۆچوونە بەڵکو هەناسەش تەنگ دەکات!.

(١٥) ئەوەندی ئێمە ئاگادارین، ئەو دوای بڕیاری گەڕانەوەی بۆ کوردستان، سەرباری دەستتەنگی کاتی بەجێهێشتنی پاریسی دەلال، هەموو کتێبخانەکەی خۆی، کە سەدان کتێبی دانسقە و گرنگ و هەزاران بەڵگەنامەی ئەرشیفخانەکانی لەندەن و پاریسی تێدایە، بە پۆستە ناردوویەتییەوە وڵات، بە ڕاشکاوی دەڵێم: ئەو کارەی ئەو برادەرەمان زۆر پیرۆزترە لەهەندێ لەو دوکتۆرانەی لای خۆمان، کە زۆربەیان، دوای دەرچوونیان، ئاگایان لە پسپۆری و کتێبەکانیان نامێنێ، هەندێکیشیان، دوای دەرچوونیان، ئەوەی هەیانە لە کتێبەکانیان....!

(١٦) ئەم برگەیە دەقاودەق لە دوا دانەی نووسینەکەی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) وەرگیراوە و خۆیشی لەسەر یەکەم لاپەڕەی نووسیویە:دوا نوسخەی متمانەپێکراو- تکایە ئەوە بۆ چاپە- ٢٠١٣/٦/٩، واتە ئەم دەقە لە سەر ئەو دانەیان نەبووە کە یەکەم جار بۆی ناردووین و هەڵەبژێریمان تێیدا کردووە و ڕێنووسەکەیمان چاك کردبۆوە!

(١٧) لە مێژووی نوێشماندا ئەو جیاوازییانە بەپێی ڕۆژژمێرەکان لە نێو هەموو ڕووداوەکاندا هەن، فەرموون ئەوە ڕۆژی لە سێدارەدانی هەر سێ شەهیدەکەی سەردەمی کۆمار لە مەهاباد، ڕۆژەکەی بە ڕۆژژمێری زایینی، تاوەکو ئەمڕۆکەش، ساغ نەبۆتەوە، ئایا (٣٠) مارت دروستترە یان (٣١)؟.

**هەروەها گۆڤاری (زاری کرمانجی)** کە لە (١٢)ی زیلقەعدەی ١٣٤٤دا بڵاوکراوەتەوە، ئەوانەی ڕۆژی دەرچوونەکەیان بۆ زایینی گۆڕیوە ڕێك ڕۆژی (٢٥)ی مایسیان بۆ داناوە، کاتی خۆی کە دۆسیەیەکەیمان لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (**ڕۆژنامەڤانی**)دا بڵاوکردۆتەوە، لەوێدا حیسابێکی وردم کردووە و ڕێك ڕۆژی دووشەمەی ڕێکەوتی (٢٤)ی مایسی ١٩٢٦ دەکات، کەچی هەموو سەرچاوەکان هەر ڕۆژەکەی پێشوو دەنووسن، ئێمەیش بەپێی ئەم پێوەرانەی سەرەوە بە پێویستمان نەزانیوە جارێکی دیکە بچینەوە سەر ئەم بابەتە!

هەندێ جار ئەم بەروارانە بە شێوەیەکی دیکە دەچنە ناو مێژوو، ئەوەتا (**شۆڕشی ئەیلوول**) کە ڕۆژی دەستپێکردنی بە ڕۆژی (١١)ی ئەو مانگە دیار کراوە، نەك هەندێ لە سەرکردە کۆنەکانی کورد، بەڵکو ئەفسەرێکی عیراقی وەك (**سەعید حەمۆ**)، وا ئاماژەیان بۆ کردووە گوایە شۆڕشی ئەیلوول لە ڕۆژی (١٠)ی ئەو مانگە دەستی پێ کردبێت، کەچی (١١)ی مانگ کراوەتە بنچینە؟!

بنواڕە: سعيد حمو (فريق)، مذكرات آمر لواء مشاة، مطبعة التوجيه السياسي، ١٩٧٧، ص(٧).

(١٨) خۆ ئەگەر (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**)، هەر کەسێکی دیکەش، ئەو بۆچوونانەمان لێ نەسەلمێنێ، ئەوا ناچار دەبین لە بنی کودوەکە بدەین و بڵێین ئەوەتا زۆربەی خەڵکی عیراق! بە خەڵکی کوردستانیشەوە، تەنانەت ئەوانەشیان کە لە هەمووان زیاتر خۆیان بە نوێگەر دەزانن و باس لە پۆست مۆدیرنە دەکەن و گلۆبالیزم رووگەیانە، ئەگەر گرەو لەسەر ڕۆژی لەدایکبوونیان بکرێ دەبینین ئەو ڕۆژە بۆ لەدایکبوونیان دیار کراوە، جا (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) پێی خۆشبێت یان نا، ئێمە گرەومان لە سەر ڕۆژی لەدایکبوونی ئەویش کردووە و (٧/١)ی بۆ دانراوە، کەی ئێوە، یان هەر کەسێکی دیکەش، توانیتان ئەو مەتەڵەمان بۆ هەڵبێنن، کە زۆر جاران گرفتی بۆ کوردەکانی نیشتەجێی ئەوروپاش هەبووە، بەڵێن بێ خۆمان بچینە لای ئەنجوومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و بۆ گۆڕینی ئەم مێژووە بەیانێکیان پێ دەربکەین! بەڵام دڵنیاشتان دەکەینەوە ئەو کاتیش جیاوازییەکان بە کۆتا نایەن، ڕاستیان گوتووە: گاڕان بە گردەوە دەڕۆیشت، **ئەو تازە لە گوڵکە سۆرەی دەپێچایەوە!**

(١٩) تەنانەت بیرمە د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکە سوور هاتە سەر سەکۆکە مایکرۆفۆنی لە د. فرسەت وەرگرت و باسی لە گۆڕینی (**قبیلە**)ی موسوڵمانان و دەستپێکی ساڵی کوردی لە (٦١٢)ی پێش زایینەوە بۆ (٧٠٠)ی پێش زایین کرد.

دیارە ئەم بابەتە پێشتر لەلایەن ئێمەوە باس کراوە و یەکلا کراوەتەوە، کە ئەمەش لەسەر پێشنیازی (**بەشیر مشیر**) بووە. بۆ پتر زانیاری و وردەکاری ناو ئەم باسە بنواڕە:

(٢٠) لەبەر ئەوەی بابەتەکەی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) لەم ژمارەیەی گۆڤاری ئەکادیمیا و لە تەك ئەم بابەتەی ئێمە بڵاو دەکرێتەوە، ناشزانرێ جێگای دەکەوێتە کام مەلزەمە و لاپەڕەکان، بۆیە هەرجار دووبارە ناوهێنانی بابەتەکەی (**نووسەر**) وەك ژێدەر دووبارە نەکراوەتەوە!

(٢١) لە هەمان ئەو ڕۆژەدا (**ئەکادیمیای کوردی**) کۆڕێکی لە ئەکادیمیا ساز کردووە، دیارە (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) وەکو سکرتێری ئەکادیمیا کۆڕەکەی بەڕێوە بردووە، بۆیە ئەو ڕۆژە نەیتوانیبوو ببێتە بەشداریکی کۆڕەکەی لای ئێمە.

(٢٢) ئەوەی لە سەرەوە خوێندتانەوە با کەس بە توانجی تێنەگا، بەڵکو ئەوە ڕاستییەکە و ئێمە لای خۆمان پێشکەشکردنی تەنیا کتێبێکی بۆ بە کەم دادەنێین، هەروەها هێنانەوەی ئەو بەڵگەیەمان وەکو نوقورچەیەکە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بەتەمان پەیامێکیان لە ژیاندا هەبێ.

(٢٣) د. کەمال فوئاد، ***هەمان سەرچاوە،*** ل (٤, ٥).

(٢٤) ڕۆژنامەی کوردستان، دەورەی سێیەم، ١٩١٧ــ ١٩١٨، چریکەی کوردستان، ژمارە(٣)ی ساڵی ١٩٨٠، ل(٥٧ـ ٦٨). ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ د. کەمال فوئاد، نە لە سەر ئەم

بابەتە و نە لەسەر هەواڵی بڵاوکردنەوەی ئەم وتارەیدا لە ل(١٠) و (٩٦)ی ژمارە (١)ی هەمان گۆڤار لە ساڵی ١٩٧٩دا، ناوی خۆی دانەناوە، بە هۆی ئەم وتارەی دواتر نەبا لەوانەیە تا بیرەوەریی (١٠٠) ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی نەزانرابا نووسەری ئەم وتارە ئەو بووە.

ـ د. کەمال فوئاد، ڕۆژنامەی کوردستان، دەورەی سێیەم، ١٩١٧ـ ١٩١٨، نووسەری کوردستان (**گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کوردستان**)، ژمارە(٣)ی شوباتی ١٩٨٠.

ـ هەرچی سەرچاوەی سێیەمە، ئەو کتێبەیە کە لەم بابەتەدا، چەند جاران ئاماژەی بۆ کراوە.

(٢٥) بەم بەرگەی کە لە سەر بەرگی دەرەوەی هەر کتێبێکە دەڵێن: (**چاکەت**)، بەمەی ناوەوەش، کە ناوی دەزگا یان کتێبەکەی لە سەر چاپ دەکرێ، دەگوترێ (**کراس**).

(٢٦) خوێنەران و توێژەران، ئەگەر لەم دەقە خوازراوانەی (**نووسەر**) حاڵی نەبووبن، با تەواوی دەقەکان لە لاپەڕە (؟)ی ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمان بخوێننەوە.

(٢٧) بنواڕە: عەبدولسەتار تاهیر شەریف، ڕۆژنامەی کوردستان ئەستێرەیەکی گەشە لەئاسمانی کوردەواریدا، ئاسۆ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٣٩)ی ٢١/٤/١٩٩٠ بەغدا.

هەروەها بڕوانە: مارف خەزنەدار (د.)، دوو ڕۆژنامەی "کوردستان" لە ئەستەموول، ڕۆژی کوردستان (**گۆڤار**)، بەغدا، ژمارە (٤٣ـ ٤٤)ی ساڵی ١٩٧٦.

(٢٨) بنواڕە: د.کەمال فوئاد، هەمان سەرچاوە، ل ٤.

(٢٩) د. ئازاد عوبێد ئەو گریمانەیەی ژمارە (**سفر**)ی قبوڵ نییە، چونکە ئەو پێی وا نییە ئەوسا ژمارە (سفر)ی زنجیرەی بڵاوکراوەکان لە ئارادا بووبێت. لە ڕاستیدا ئێمە خۆیشمان لەسەر ئەم بیرۆکەیەین، بەڵام ئەمەیان گریمانەیە و بەس!.

(٣٠) لە ژمارە (٨)ی گۆڤاری (**ڕۆژنامەڤانی**) ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستاندا، ئێمە خشتەیەکی ئاوەهامان بۆ هەر (٣١) ژمارەکەی دەورەی یەکەمی (**کوردستان**) کردووە، بەڵام ئەوەی ئێمە بنەمایەکی زانستی هەیە، بۆیە جیاوازییان لەگەڵ ئەوەی (**د.نەجاتی عەبدوڵڵا**) ئاسمان و ڕێسمانە!

(٣١) بەم شوێنەی دەوروبەری لۆگۆی هەر بڵاوکراوەیەك دەگوترێ، کە لە نێوان دوو هێڵ، یان لە ناو چوار گۆشەیەکدایە، هەموو زانیارییەکی لە بارەی بڵاوکراوەکە تێدا دەنووسرێ.

(٣٢) لەم بارەیەوە پرسمان بە چەند کەسێکی خاوەن ئەزموون، لە نەخشەسازی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، کردووە، لەوانە:

* **محەمەد زادە**: لە ساڵی ١٩٤٦ هاتۆتە دونیاوە، دەرچووی کۆلێژی ئاداب/ بەشی کوردیی زانکۆی بەغدایە، لە ساڵی ١٩٦٨وە کاری نەخشەسازی و خۆشنووسیی لە گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی دەکات.

* **عەبدولقادر عەلی مەردان:** لە ساڵی (١٩٤٢)دا لە بەغدا لەدایك بووە، دبلۆمی دوای ئامادەیی لە (**الصحافة**) لە (**دارالصیاد**)ی بەیروت لە لبنان هێناوەتەوە، لە ساڵی (١٩٦٦)ەوە لە (**دار المطابع**) لە گەڕەکی (**بەتتاوین**)ی بەغدا کاری کردووە، هەر ئەوسا لەگەڵ (**بورهان قانع**) لە ڕۆژنامەی (**الاخبار ـ دەنگوباس**)ی محەمەد بریفکانی کاری ڕۆژنامەنووسییان کردووە...
* **عوسمان پیرداود:** لە ساڵی ١٩٦٠دا چاوی بە دونیادا هەڵێناوە، دەرچووی ساڵی ١٩٨٤ لە کولیەی ڕاگەیاندن/ عەممان ـ ئوردن، لەوساوە تاوەکو ئێستا، بەبێ پچڕان کاری لە ڕۆژنامەنووسیی کوردی کردووە، نەخشەسازیی گۆڤار و کتێبەکانی ئەکادیمیای کوردی لەلایەن ئەوەوە دەکرێن.
* **د. ئازاد عوبێد:** بەر لەوەی ماستەرەکەی لە سەر کاریگەری شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕۆژنامەنووسیی کوردی باشووری کوردستان ١٩٦١–١٩٧٥ بێنێتەوە و دواتر چەند ساڵێك وانەی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بە خوێندکارانی بەشی ڕاگەیاندنی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین بداتەوە، نەك هەر چەند ساڵ بوو لاپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی هەڵداونەتەوە، بەڵکو زۆربەیانی لای خۆی پاراستوون.

هیچ کام لەو بەڕێزانە بۆچوونەکانی (**د. نەجاتی عەبدوڵلا**)یان لە سەر (**تیراژ**) پێ زانستییانە نەبووە.

(٣٣) ئەم ڕۆژنامەیە سەرەتا، لە ساڵی (١٩٢٢ـ١٩٢٣)دا لە سلێمانی (١٤) ژمارەی لێ دەرچووە، لە ساڵی ١٩٢٦دا خاوەنەکەی جارێکی دیکە لە بەغدا دەری کردۆتەوە، بەڵام ئەمجارەیان ژمارەکانی ئاوەها (١٤ـ ١، ١٤ـ٢، ١٤ـ ٣) ڕیزبەند کراون. بنواڕە پاشکۆی لاپەڕە (٢٢٩، ٢٣٠).

(٣٤) بەشە کوردییەکەی ڕۆژنامەی (**التآخي**) بە ناوی (**برایەتی**) چەند جاران بە شێوەی جیاجیا و بە ژمارەی نوێ بڵاوکراوەتەوە، لە ٢٦ی مایسی ١٩٧٢دا، جارێکی دیکە دەست بە بڵاوکردنەوەی کراوەتەوە و تا ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ بە شێوەیەکی هەفتانە (٨٢) ژمارەی لێ دەرچووە، دوای ئەم ژمارەیە خاوەنەکانی، بەبێ مۆڵەتی حکومەت، دەیکەنە ڕۆژانە، بێجگە لە ژمارە (**سفر**)، (٢٦) ژمارەی لێ بڵاودەکەنەوە، لەم ماوەیەدا وەزارەتی ڕاگەیاندن لێیان دەکەوێتە تەقە و بە نووسراوێك ڕۆژنامەکە ڕادەگیرێ، برادەران جارێکی دیکە بە هەفتانە دەست بە بڵاوکردنەوەی دەکەنەوە و ڕیزبەندی ژمارەکانی ئاوەها دادەنێن: ( ٢٦/٨٣، ٢٦/٨٤، ٢٦/٨٥، ٢٦/٨٦) دیارە لەبەر دەستپێکردنەوەی شەڕی کورد و حکومەتی عیراق ئەو ڕۆژنامەیەش ڕادەگیرێ، ئەگینا داخوا چەند ساڵان ڕیزبەندی ژمارەکانی ئاوەها دەمایەوە. بنواڕە پاشکۆی لاپەڕە (٢٣١).

(٣٥) ئەم گۆڤارەش کە زمانی (**فیدراسیۆنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کوردستان لە سوید**)ە، لە ساڵی ١٩٨٢دا دەست بە بڵاوکردنەوەی کراوە، سەرەتا ماوەی سێ ـ چوار ساڵان تەنیا بە ڕێنووسی لاتینی دەرچووە، لەم ماوەیەدا دوو ژمارە لە سەر بەرگەکەی دەنووسرا، بە

نموونە: (١/٨٢، ٥/٨٢، ١٣/٨٣، ١/٨٥...هتد)، دیارە ئەو ژمارە گەورەکان ئەو ساڵەیە گۆڤارەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە، هەرچی ژمارەکانی دیکەن دەبێ ڕیزبەندی ژمارەکانی گۆڤارەکە خۆی بووبێت!. بنوارە پاشکۆی لاپەڕە (٢٣٢).

(٣٦) بنوارە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨، ل(٧٠، ٧١). یان بنوارە: کەمال مەزهەر، **دیسان ڕۆژنامەی کوردستان**، ڕۆژنامەڤانی **(گۆڤار)**ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ل(١٣١).

بە چاپۆشین لەوەی د. کەمال مەزهەر هیچ کات بەم ناوونیشانە لە گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی)دا وتارێکی ئاوەهای نەنووسیوە، ئەوە ئێمەین ئەو وتارەمان، بە ڕەزامەندی خۆی، لەو سەرچاوانەدا کە خۆی پێشتر نووسیبوونی، بۆ ئامادە کردووە. لێرەدا مەبەست لە تۆمارکردنی ئەم خاڵە ئاشکراکردنی چۆنیەتی نووسین یان ئامادەکردنی ئەم وتارە نییە، بەڵکو هەندێ ڕاستی مێژوویییە کە د. کەماڵ مەزهەر، بەبێ هەڵوەستە لەسەر کردن، تەنیا ئاماژەیەکی خێرای بۆ کردوون، یەکێکیان ئەم ڕایەی (**ڕامزوور**) بووە، کە هەر لەوساوە سەرنجی ئێمەی ڕاکێشاوە، بەڵام ئەوسا، لەبەر هەر هۆیەك بووبێت هیچ پەراوێزێکمان بۆ ئەم بابەتە نەکردبوو، دیارە ئەم بابەتە بۆ ڕۆژگارێکی دیکە مایەوە، دواتر لە هەندێ بابەتی جیا جیا بە خێرایی پەنجەمان بۆ ڕاکێشاون، ئەوە جگە لەوەی ئەوەتا لەم وتارەی د. کەمال مەزهەردا هەموو زانیاریی و پەراوێزی نووسینەکانی ئەومان ئاوەها تێکهەڵکێش کردووە: "تا ئێستا بۆمان ساغ نەبۆتەوە (کوردستان، چۆن و بۆ لە دەرچوون وەستا. وەك ڕامزوور باس دەکا گوایە: (نوێنەرانی سوڵتان ساڵی ١٩٠٤ توانیویانە (عەبدولڕەحمان بەدرخان ـ ك. م) قایل کەن دەست لە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەی هەڵگرێ)(٩٣) هەرچەندە دوور نییە وەستانی (**کوردستان**) ئەنجامی کارێکی وا بووبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێویستە چەند ڕاستییەك بۆ مێژوو تۆمار بکەین. بەر لە هەموو شت دوا ژمارەی زانراوی (**کوردستان**) نیسانی ساڵی ١٩٠٢ دەرچووە نەك ١٩٠٤، لەو کاتەشدا عەبدولڕەحمان بەدرخان لە ڕیزی پێشەوەی ناحەزانی سوڵتان عەبدولحەمید بوو، هەموو مانگێك بوو لە یەکەم کۆنگرەی تورکانی لاو گەڕابۆوە جنێف. جگە لەوە تا دوا ژمارەی زانراوی (**کوردستان**)(٩٤) بە تۆسقاڵ بۆنی ئەوە ناکرێ خاوەنی لە ڕێبازی کوردایەتی ڕاست و خاوێن لای دابێ، دوور نییە لە بەر کەم دەستی یا لە ژێر فشاری چەتەوڵەکانی سوڵتانا یا لەبەر مەبەستێکی سیاسی تر (**کوردستان**) لە دەرچوون وەستابێ".

هەردوو ژمارە (٩٣، ٩٤)ەکە کاتی خۆی بۆ پەراوێز دانراون، لە دووەمیاندا هاتووە: (**بە قسەی مامۆستایان محەمەد ئەمین زەکی و محەمەد عەلی عەونی** (کوردستان) **دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ ماوەیەکیش لە ئەستەمبوڵ چاپ کراوە**).

چی بکەین جارێکی دیکە تەمەن ئەو سەردەمە زێڕینەی نووسینەکانی هیچ کامێکمان بۆ ناگەڕێنێەوە، دڵنیام بە یەکگرتنی ئەو ڕاستیانە لە گەڵ ئەو سەرچاوانەی ئەمڕۆ لەبەر دەستن زۆو ڕاستی دیکەی (کوردستان) ئاشکرا دەبن، ئەوە بە چاوپۆشین لەوەی ئەم ڕۆژنامەیە تاوەکو ئەمڕۆ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی جیددی لەسەر نەکراوە، ئەوەی هەبووە و نەبووە ساڵانە هەندێ وتار یان لیکۆڵینەوەی خێرا لەسەر ڕۆژنامەکە و هەردوو خاوەنی کراون و هیچی تر!.

(٣٧) محمد امین زکی، خلاصه تاریخ الکر د و کردستان من اقدم العصور حتی الان، ترجمە: محمد علی عونی، بغداد، مگبعه السعاده، بجوار محافڤه مصر، سنه ١٩٣٩،

(٣٨) بنواڕە: عەبدوڵا زەنگەنە، لەبارەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردییەوە مشتومڕمان لەسەر ڕۆژێ بوو، کەچی ئێستا گومان دەکرێت جیاوازییەکە بە ساڵ بێت، چاوپێکەوتن: سەرتیپ جەوهەر، کوردستانی نوێ (**ڕۆژنامە**)، ژمارە (٦٠٧١)ی ڕۆژی چوارشەمەی ڕێکەوتی ٢٠١٣/٥/٨، ل(١٦،١٧).

(٣٩) ئاوەها دەڵێت: (**تقول الامیرة روشن بدرخان بأن هذه الجریدة کانت تصدر في اسطنبول قبل صدورها في القاهرة**).

بنواڕە: الامیر جلادت بدرخان، حیاته و فکره، سلمان عثمان (کۆنی ڕەش)، دمشق، ١٩٩٢، ص (٤١).

ئەو زانیارییە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبە و وەکو پەراوێزی ژمارە (٤) دانراوە، ئەمیش دوای ئەمە دێت کاتێ نووسەر باسی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی میقداد میدحەت لە میصر و چۆنیەتی دابەشکردنی لە ڕێگەی سووریاوە دەڵێت (**حیث کانت اعداد کثیرة منها توزع في مناطق مختلفة من کردستان عن طریق سوریا**).

**تەنیا بۆ دۆزینەوەی وشەی (ئەنجامگری)یەکەی (د.نەجاتی عەبدوڵڵا) سوود لەم فەرهەنگانە وەرگیراوە:**


١- م. جەمال حەبیبوڵڵا بێدار، **فەرهەنگی وەرقول**، بەرگی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی زنجیرەی (٦٢٩)، سلێمانی ٢٠٠٨.

٢- **هەژیر** عەبدوڵڵا پوور، **فەرهەنگی هەژیر**، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای تۆژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، زنجیرەی (٣١٦)، هەولێر ٢٠٠٨.

٣- دکتر محمد تقی ابراهیم پور، واژەنامە: فارسی ـ کردی، انتشارات تفنوس، تهران ١٣٧٣.

٤- شەوکەت مەلا ئیسماعیل حەسەن، **فەرهەنگی مامۆستا: هاوواتای کوردی ـ ئینگلیزی**، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، هەولێر، چاپی دووەم، ٢٠١٢.

٥- جەمال عەبدول، **فەرهەنگی ڕاگەیاندن:** ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، لە بڵاوکراوەکانی چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٦ـ هەژار، هەنبانە بۆرینە، **فرهنگ کردی ـ فارسی،** سروش، تەهران، ١٣٦٩.
٧ـ عەباس جەلیلیان، **فەرهەنگی باشوور،** کوردی ـ کوردی ـ فارسی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٨ـ فازیڵ نیزامەدین، **فەرهەنگی شیرین،** زنجیرەی کتێبی چاپ و پەخشی سەردەم (١٤٠)، سلێمانی ٢٠٠١.
٩ـ ئۆگست ژابا، **فەرهەنگی کوردی فەرەنسی،** پێشەکی و وەرگێڕانی پێشەکی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، هەولێر، ٢٠١٠.
١٠ـ محەمەد ناهید، **فەرهەنگی ناهید،** کوردی ـ کوردی ـ فارسی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١١.
١١ـ محەمەد ساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، **فەرهەنگی کانی،** کوردیا ژووری ـ کوردیا ناوەڕاست، پێداچوونەوەی ئەمین بۆتانی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٠.
١٢ـ محەمەد ئەمین دۆسکی، **فەرهەنگا سپیرێز،** عەرەبی ـ کوردی، چاپخانا حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨.
١٣ـ د. نووری تاڵەبانی، **فەرهەنگی قانوونی،** کوردی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی، پێشەکی ئەحمەد هەردی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٤.

## ملخص البحث
## العثور على عددين مفقودين من جريدة "كوردستان"

الصحف والمجلات، لدى اكثر الباحثين، من المصادر المهمة للتأريخ، وعلى هذا الاساس، وخصوصا في السنوات الاخيرة، كانت محل اهتمام اكثر الباحثين في الصحافة الكردية، بما فيهم باحث هذه الصفحات الموجودة الان بين يدي القارئ، وخصوصا انه كان مهتما ب(**كوردستان**) الجريدة الكوردية الاولى والتي صدرت في (**قاهرة**) المصرية عام ١٩٩٨، وكانت صدور هذه الجريدة على ثلاثة مراحل، انحصرت المرحلة الاولى في صدورها خلال اعوام(١٨٩٨-١٩٠٢). واما المرحلة الثانية كانت بعد الثورة الدستورية في الدولة العثمانية، اي خلال عامي(١٩٠٨ــ ١٩٠٩). والمرحلة الثالثة والاخيرة، فكانت صدورها خلال اعوام ١٩١٧ــ ١٩١٨. والجدير بالذكر ايضا ان اعدادا من هذه الصحيفة بقيت مفقودة خلال مرحلتها الاولى، اما اعداد مرحلتها الثانية فكانت صدورها بقت بين (**القيل والقال**) لدى الباحثين في مجال كتابة تأريخ الصحافة.

اثناء زيارته لتركيا، وبدعوة من (**كۆما خەباتێن كوردۆلۆجيێ**) للمشاركة في مؤتمر حول مجلة (**ڕۆژی كورد/١٩١٣**)، عثر الباحث، وبالتعاون مع بعض اعضاء الجمعية المذكورة، ولاول مرة على اعداد (٤،٣) من الصحيفة الصادرة فى هذه المرحلة، وكان نشر (٤) صفحات من الجريدة، عشية ذكرى (١١٥) من الصحافة الكوردية، وفي العدد (٢٥) من (**مجلة الاكاديمية الكوردية**)، محل اهتمام كثير من المؤرخين ومثقفي الكورد، وكانت المعلومات الواردة على صدر صفحتها الأولى من الجريدة مثار جدل واستغراب اكثر الباحثين، بما فيهم الباحث نفسه. ومثال على ذلك وجود كتابة (**العدد ٢٦٤ــ ٣**) و(**العدد ٢٦٤ــ ٤**) وكذلك عبارة (**السنة الحادية عشر**)، وباللغتين التركية العثمانية والكوردية نهاية الصفحة الأولى، ووجود تأريخ (١٣١٣) مباشرتاً تحت كليشة الجريدة كان محل تساؤل استغراب الباحث والمهتمين، كون الجريدة الأولى صدرت في سنة ١٣١٤ بالتقويم الرومي، ويظهر ان الجريدة طبعت في مطبعة، وبتعبيره العثماني باسم(**مطبعهء اخوت**) أي بمعنى (**مطبعة الأخوة**)، والظاهر وبموجب بعض محتويات رسالة احد القراء، والمنشورة في

الجريدة، استنتج الباحث ان المطبعة تعود ملكيتها لعائلة البدرخانيين، والظاهر أن استنتاج وتساؤل الباحث حول كل هذه المعلومات اثار حفيظة، سكرتير وعضو الأكاديمية الكوردية، الزميل الدكتور نجاتي عبدالله، وعلى اثر ذلك كتب موضوعاً حول الصحيفة، وبين فيها معلوماته ومحاولاته وجهوده للعثور على الجريدة، مما اثار جدلاً علمياً بينه وبين الباحث، وهذا ما ادى الى خروج عدد من الأستنتاجات من قبل الباحث، منها:

١ـ كما معلوم لدى الكل إن صحيفة (**كوردستان**) الأولى صدر اعدادها (٣١) خلال سنوات (١٨٩٨ـ ١٩٠٢)، ولكن هناك معلومة غير مؤكدة نشرت في نهاية العقد الثامن من القرن الماضي، تشير الى استمرار الجريدة الى سنة نفي وابعاد البدرخانيين اي عام ١٩٠٦، ولكن هذه الأشارة لم تجلب انتباه احد من الباحثين، وها ان وجود العدد (٢٦٤) على صدر عددي (٣) و(٤) من الجريدة يقربنا من احتمال استمرار الجريدة في المرحلة الأولى، وبرأي الباحث، وكثير من المختصين في مهنة الصحافة، ان اعتبار العدد(**٢٦٤**) كاشارة الى عدد الطبع ضرب من الخيال، أي ان العدد لا تمثل عدد الطبع، باي شكل من الاشكال، كما يدعي بها (**الدكتور نجاتي عبدالله**) في متابعته لمقالنا المنشور في العدد المشار اليها من (**مجلة الاكاديمية الكوردية**).

٢ـ ان جريدة (**كوردستان**) الأولى صدر منها (٥) اعداد الأولى في القاهرة، اما الاعداد الاخرى فصدر في المدن الأوروبية كجنيف، لندن و فولكستون، بغض النظر عن الأعداد الأخرى الصادرة في مصر، وهذا يفند وجهات نظر هؤلاء الذين يدعون صدور جميع اعداد الجريدة في مصر، وكتابة اسماء المدن الأوروبية المذكورة، ليس الا لمجرد تمويه سلطات الدولة العثمانية!.

# Abstract

## Unearthing two more issues of KURDISTAN newspaper

To many researchers, newspapers and magazines are considered an important historical source. Accordingly, recent researcherss, including the present one, have attached considerable importance to this matter. The present researcher has written about, and has been considerably interested in 'Kurdistan', the Kurdish newspaper published in Cairo in 1898.

The publication of KURDISTAN was in three stages, the first of which fell between 1898-1902, the second stage fell between the years1902-1909K, while the last stage occurred during the years 1917-1918. It is worth mentioning that several issues of the newspaper remained missing during the first stage of its publication while those of the second stage remained controversial among the researchers of the history of Kurdish journalism.

In his last visit to Turkey, upon the invitation by Association of Kurdological Studies, the researcher managed to find the two issues 3 and 4. The publication of the four-page paper in Kurdish Academy Journal received the acclaim of many Kurdish historians and intellectuals, and the materials on its front page raised many controversies and debates among the researchers including the present one. For instance, the two most interesting and question-raising points were the presence of 264-3 and 264-4 as well as the statement 'year eleven' both in Ottoman Turkish and Kurdish, and the date 1313 directly under the newspaper title or heading, while the date directly under the first stage newspaper title or heading in Cairo is 1314.

It is also written on the front page that it is released in a printing press named 'Ukhuwat press'; however, based on a letter sent by a reader to the newspaper published therein, the researcher has concluded that the printing press belonged to the Badrkhanis (Badrkhan family).

The information and data stated above were readily criticized by my colleague Dr.Najat Abdulla, member and secretary of the Kurdish

Academy, which led him to write an article about the matter highlighting his background knowledge and his own efforts to find the newspaper issues. This encounter generated an academic controversy the results of which are the following conclusions drawn by the researcher:

1. As it is known, the 31 issues of ‘Kurdistan’ were published during 1898-1902, yet there are some unconfirmed information given out in late twentieth century pointing out that the newspaper continued to publish well into the year in which the Badrkhan Family members were sent to exile in 1906. This information, however, did not raise the concern of any of relevant researchers. But accessing these two issuesbrings us as close as possible to the possibility of the newspaper having continued to publish in its first stage. The researcher is in the opinion that considering the number 264 as number of copies is baseless as claimed by my colleague Dr.Najat Abdulla.
2. The first five issues of ‘Kurdistan’ newspaper were published in Cairo while the other issues were issued in European cities such as Geneva, London and Folkston regardless of those issued in Cairo. This fact refutes the claim that all the issued were published in Egypt and that carrying names of European cities as place of issue was but akind of camouflage to the Ottoman authorities!

بەکوردیکردنی دەقە عوسمانییەکان:

**ئەمین شوان**

پاشکۆی ژمارە(١)

ژمارە ٢٦٤ – ٣ | ( اون بیرنجی سنە- سالا یازدەیێ) | حەب ـ٣



هەفت رۆژا جارەکی دەردکەڤە ژبەر خوەشبوراندن و عەلماندنا صەنعەت و مەعریفەتێیە

**رۆژنامەیەکە بۆ گەیشتن بە زانست و هونەر و بۆ هاندانی کوردان هەفتانە بە زمانی تورکی و کوردی دەردەچێ**

**١٢ شباط ٣٢٤ | ٢٥ی شوباتی ١٩٠٩ | ٥ صەفەر ٣٢٧**

## مەرایی

مەراییکردن، ئەگەر هەستی برایەتی و دڵپاکی و نیازپاکی لێ دەردەچی، دەبێتە پردێك بۆ پەڕاندنەوەی درۆ و دەلەسە لەسەر حیسابی ڕاستی و دروستی.

مەراییکاری، چونکە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ڕەوشت هەیە، ئافاتێکی کۆمەڵایەتی و ترسناکە. جا با بە باشی ئاکامە خراپەکانی ئەم دیاردە خەتەرناکە تەتەڵە و گێژە بکەین و بە قووڵی بچینە بنج و بناوانی.

مەراییکردن لە گفتوگۆ و هەڵسوکەوتکردندا، گەر پرسیارێك ئاراستەی کەسێکی رووناکبیری ویژدان ئازاد بکەین، ئەو بێ دەربەستبوون بە هەڵوێستی بەرامبەر چی بە ڕاست بزانێ ئەوە دەڵێ، تەنانەت ئەگەر وەڵامەکەی بشبێتە مایەی ناڕەزایی یان دوژمنایەتی پرسیارەکەریش، بەڵام هەمان پرسیار ئاراستەی کەسێکی دیکە بکەین دەبینین بە گوێرەی هەڵوێستی بەرامبەر بە پرسیارکەر

راستییەکان ئاوەژوو دەکا و وەڵامەکەی دەردەبڕێ، ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە مەراییکاری.

ناچارین کەوا دان بەو راستییەدا بنێین کەوا ئەم نەخۆشییە ئەمڕۆکە، بەوپەڕی داخەوە، لە هەموو رۆژهەڵاتدا باوە.

ئەوەی راستە لە پەنای پاراستنی جیدییەت و ئازادیی ویژداندا مرۆڤ دەبێ راگرتنی دڵی بەرامبەر و نەشکاندنی خاتری ئەویشی لەبەرچاو بێ دوور لە رووشکاندن و رەق رەفتاری، بەڵام هەرگیز نابێ راستی بکرێ بە قوربانی ئەم نەزاکەت نواندنە. راستە مرۆڤ دەبێ خۆی دووربگرێ لە رەفتاری دڕ و دڵشکێنانە، بەڵام دەبێ ڕاستیش و ڕاستگۆییش مافی تەواوی خۆی بدرێتێ و هەر کەسێك بتوانێ هەردوو تای ئەم تەرازووە بەرامبەر ڕاگرێ ئەوا شایانی ڕێز و تەقدیرە، لە دنیای سیاسەتیشدا وەکو کەسێکی خۆشەویست و بەڕێز لای هەمووان سەیری دەکرێ. هەموو ئەو کەسانەی لەم بوارەدا ناوبانگییان دەرکردووە ڕێبازی راستگۆیی و نەرمونیانی گرتۆتە بەر بۆیە بوونەتە مایەی هیوا و ئومێدی خەڵکانی خۆیان.

کەچی لە ڕۆژهەڵاتدا مەسەلەکە لە شیرازە دەرچووە و کەسانێك سنووری ڕەوشت دەبەزێنن و دەمانگەیەننە لێواری هەڵدێری نەمان.

مەرایی و ڕیاکاری لە ڕۆژهەڵات ماکی لە ڕەوشتی خەڵکەکەدا نییە، ئەگەر لە خەڵکانی تریشەوە وەرگیرابێ، بە داخەوە لە سروشتماندا ڕەگی داکوتاوە، بۆیە زۆر کەس دەڵێ ماکەکەی هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە لە ناخماندا چەسپیوە. لەم ڕووەوە مێژوو پڕە لە نموونەی جۆراوجۆر.

بەڵام، ئایا ئەوە بەس نییە کە حەزرەتی فارووق (عومەر) دەچێتە سەر مینبەر و دەڵێ: خەڵکە ئەگەر چەوتییەکتان تێمدا بەدی کرد، ئاگادارم بکەنەوە، عارەبێك لێی ڕاست دەبێتەوە و پێی دەڵێ: عومەر، ئەگەر چەوتیت تێدا بەدی بکەین، بە شمشێر ڕاستی دەکەینەوە، تا دەرك بە جیدییەتی کردار و رەفتاری خۆمان بکەین؟

جێی داخە کە ئێمە ئەمڕۆ ئەم داستانە مێژووییانە بە دروستکراو دادەنێین و بڕوا بە ڕاستییان ناکەین، ئەمەش یەکێکە لە ئاکامە خراپەکانی ئەو باری گرانی

زەلیلی و زۆردارییەی بە زۆر و ستەم بەسەرماندا سەپێنراوە، چونکە میللەتی ئازاد کە دەستبەستی کۆت و زنجیری زەلیلی و ئەسارەت نەبێ، هەمیشە دەماخی بە هەوای ئازادی و سەربەرزی کەیلە و هەر لەبەر ئەوەش هەرگیز ئامادە نابێ ویژدانی خۆی بۆ هیچ مەبەستێك لەکەدار بکات. ئەو میللەتە کە عیزەتی نەفسی نەشکابێ و ویژدانی لەکەدار نەبووبێ، حوکمدارانیشی ناچارن لە رێگای دادپەروەری و راستی لانەدەن.

گەلێك کە مەحکوومی ژێردەستەیی و چەوسانەوەی زۆرداران بێ، ناچار پەنا دەباتە بەر بێدەنگی و سەرکزی و هەر لەوێشەوە پەنا دەباتە بەر ڕیاکاری و دەڵەچەیی. ئەمڕۆکە، هەر تاکێك لە ئێمە گەر ریاکاری ببێتە رابەری رەفتاری رۆژانەی و هەوڵ بدا وای دەرخات کە ئەمە جۆرێکە لە نەزاکەت و رەفتارباشی، با باش بزانێ کە بەو کردارەی پەیکەری کۆمەڵایەتیمان دەباتە لێواری هەڵدێری نەمان و تەفروتوونابوون، ئاوەدانیمان دەکا بە وێرانە و کەلاوە، ئیتر کەس باوەڕی بە کەس نامێنێ و بێباوەڕی و بەدگومانی دەست بەسەر کۆمەڵگادا دەگرن و کەس لا لە کەس ناکاتەوە. ئیتر کەس گوێ لە پەند و ئامۆژگاری کەس ناگری و هەموو لە گێژاوی بێبڕواییدا تا بناگوێ نقوم دەبین. هەر لەوێشەوە ئیتر نە یەکیەتی دەمێنێ، نە هەستی هاریکاری و هاوسۆزی، چونکە هەستی خۆشەویستی و پشتگیری کاتێك پەرە دەسێنێ کە خەڵك باوەڕی بە یەکدی هەبێ.

دووکەس کە لە یەك ئەمین نەبن، هەرگیز ناتوانن یەك بگرن و پشت بە یەك ببەستن، بێ یەکگرتن و پشت بە یەك بەستنیش ناتوانین پێکەوە یەکدەنگی و یەك ئامانجی و یەکڕیزی دروست بکەین.

پاشماوەی هەیە

صالح بەدرخان

**مارێکی حەوسەر**

**نەجمەدین مەنلا**

نەجمەدین مەنلا، ئەوە ناوێکە کە بە بیستنی هەر خاوەن ناموسێك لەرز دایدەگرێ، هەر خاوەن غیرەتێك بە بیستنی ناوی نەجمەدین مەنلا، دڵی پڕ دەبێ لە نەفرەت و بێزهاتنەوە.

نەجمەدین مەنلا، یەکێك بووە لە خولامە هەرە چاکەکان و بەندە هەرە خوێنڕێژ و دڵسۆزەکانی ستەمکاری و ئیستیبداد.

معین ظالمك دنیاده ارباب دنائتدر کوپکدر ذوق الان صیاد بی انصافه خدمتدن

چاوساغی ستەمکار لە دونیادا نەفس نزمەکانن سەگ شادە بە خزمەتکاریی راوچی بێویژدان..

ئایا هەڵبژاردن و دانانی کەسێکی درندە سروشتی پیاوکوژی وەکو نەجمەدین مەنلا بۆ والیەتی ویلایەتێکی گرنگی وەکو بەغدا لەکەیەك نییە بە ناوچەوانی مەشرووتیەتە پیرۆزەکەمانەوە؟ نەجمەدین مەنلا کە بەرپرس بوو لە دارِزاندنی سەدەها کەس لەناو ژێر زەوییە ترسناکەکانی بابی زەبتییەدا کە کوشتارگای مەزلوومان و ستەمدیدەکان بوو و کەسی وەکو نەجیب مەلحەمەی تێدا قامچی وەشێن و ئەشکەنجەدەر بوو، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئەم لەکەیە لەسەر مەشرووتییەت لابدرێ؟

دوێنێ نوێنەرێکی بەڕێزی ئەنجومەنی مەبعووسان لە کاتێکدا کە باسی پێویستی ناردنی نەجمەدین مەنلای بۆ لای نەجیب مەلحەمەی شەریکە تاوانی دەکرد، کەسانی وەکو نوێنەران ڕەحمی بەگ و قەرەسو ئەفەندی کەوتنە پاڕانەوە و پەڕاندنەوەی نەجمەدین مەنلا.

باوەڕناکەم ڕەحمی بەگ، لە سۆنگەی ئەو زاوا و خەزوورییەتەوە کە باسی دەکەن، ئەوها بە پێچەوانەی ویژدانی خۆیەوە، کەوتبێتە پاڕانەوە بۆ نەجمەدین مەنلا، بەڵام نەجمەدین مەنلا پاڵەوانێکی ئەوتۆ زیرەك و بە توانایە، کە چۆن توانی (نیرۆنی) ئەم سەردەمە بکاتە دۆستی خۆی، ئەوهاش دەتوانێ ڕەحمی بەگیش نەرم بکا و بیکا بە دۆست. بەڵام با ڕەحمی بەگ دڵنیا بێت.

جا بەو شێوەیەی کارگوزارانی (یلدز)ی وێرانەماڵ کەسانی وەکو عیزەت و تەحسین و ئەبولهودا و هاوشێوەکانیان دایە بەر ڕەشەبای تف و لەعنەت و نەفرەت، ئەوا ڕابردووی نەجمەدین مەنلاش، بگرە ڕەفتاری ئەم چەند مانگەی بەغداشی گەلێ لەوان زیاتر دەیخاتە بەر لافاوی لەعنەت و چەمۆڵەبێزبوونەوە لایان.

ئێستا قەرەسو ئەفەندی کە لەویْ بۆتە پارێزەر و کاتی خۆی داواکاری گشتی نەجمەدین بوو لە هەموو کردارە زاڵمانە و بێویژدانانەکانی ئاگادار بوو، بەڕاستی ئێستا جێی سەرسوڕمانە چۆن خۆی لە هەموو ئەوانە گێل دەکا و دەکەوێتە بە سەروباڵ هەڵدانی ئەم تاوانبارەدا؟

ئایا قەرەسو ئەفەندی، ئەمە چاکەی ئەو هەموو قازانجەیە دەیداتەوە کە لە سەرینی وەرگرتنی دەعواوە لە نەجمەدین مەنلا و ئاسانکاری کردنی بۆی، وەری گرتبوو، ئایا چۆن توانی ویژدانی خۆی بخاتە بنی پێ و بکەوێتە چەڵتەچەڵتی داکۆکیکردن لێی!

نامانەویْ ئەوەندە ساویلکە بین لەم بارەیەوە، چونکە هیچ مەلبوسێکی عوسمانی تەنانەت هەستی برایەتی و باوکایەتیشی ناتوانیْ بەسەر هەستی کارگوزارییدا زاڵ بێت، بەڵام چونکە پاساوی ترمان نییە، جگە لە داخ خواردن بەو لاوە هیچی ترمان لە دەست نایەت.

ئەم بە درۆ خۆ بە لایەنگری مەشرووتییەت دەرخەرە، کە لە هەموو کردارە دزێوەکانی ئیستیبداد بەشدار بووە، کە لە هەموو دادگاکانی ئەنگیزیسیۆندا ئامادە بووە، لە هەموو ستەمکارییەکاندا بەشدار بووە و دەستی ئافەرینکردنی بە پشتی جانەوەرەکانی دەزگاکانی داپلۆسینەوە بووە، ئایا چۆن دەبیْ ئێستا ببیْ بە خاوەنی پلە و پایەی بەرز و بگەیەنرێتە ئاستی والیەتی بەغدا؟ دەبیْ چ دەستێکی بەهێزی لە پشتەوە بیْ کەوا سەرەڕای ئەم هەموو بەدکارییەی گەیاندیە پایەداری؟.

یەکێك لە ستەمکارییەکانی نەجمەدین، کە لە ژمارە نایەن، ئەوە بوو لەسەر ئەو هەموو ئەشکەنجەیەی کە بەرامبەر چوار کورد کە بە کوشتنی (رضوان) تۆمەتبار بوون ئێستا لە دادگا داوای لەسەر تۆمار کراوە.

ئەگەر دەعواکە لە لایەن ئەوانەوە، کە ئێستا لە والیەتی دەستیان بە باڵییەوە گرتووە، بەردی لەسەر دانەنرایە، ئەوا ئاشکرایە مەسەلەکە بۆ رای گشتی ئاشکرا دەکرا (هەر چەندە ئەگەر پەردەپۆشیش بکریْ، ئیفادەی داواکاران و شایەدی شایەدەکان و ئەو ئامێرانەی لە ئەشکەنجەدا بە کارهێنراون لە کاتی خۆیدا لە لایەن رۆژنامەکەمانەوە دەخرێنە بەرچاوی خەڵك).

لە بەرامبەر ئەو تاوانانەی کە ئەنجامی داون دڵنیام کە ئەوانەی داکۆکی لێ دەکەن کەوا نەجمەدین مەنلا سەد بەردی داوە بە پشتی جەنگیز و حەجاج و هۆلاکۆدا و کە ناوی ئەم بێت بە بار رەحمەت بۆ گۆری ئەوان دەنێردرێ، جا با ئەوانە بزانن کە سەرەنجامی ئەم داکۆکیکردنانەیان لێی تەنها پەنجەی پەشیمانی گەستن بەولاوە چیتر نابێ.

### کوردستان چ سامانێکی لە دەرووندایە

تا ئێستا هیچ سوودێکی ئەوتۆ لە سەرچاوە سروشتییەکانی کوردستان وەرنەگیراوە.

چونکە خەڵك لە ئاسایش و ئەمنییەتی گیان وماڵی خۆیان دڵنیا نەبوون و کوردەکان بە دەستی کارگوزارە دەست و داوێنپیسەکانی دەوڵەتەوە یەخسیر بووبوون و وەکو پەز دایان دەدۆشین، هەرگیز نەبوونەتە خاوەنی سەرمایە و دەرامەت، ئەوەی هەیانبووە هەر بەشی تێرکردنی گەرووی پاشا و بەگەکانی کردووە.

هەرچی سەرمایەدارانی بێگانە بوون، ئەوەندە شتی خراپیان لە بارەی کوردان بیستبوو، بەتایبەتی لەسەر زمانی ئەو هاونیشتیمانانەمانەوە کە هاتبوونە کوردستان، ئیتر بەهیچ جۆرێك زاتی ئەوەیان نەدەکرد سەرمایەکانیان لە کوردستان بخەنە گەڕ و دڵنیاشم هەرگیز بیریان لەوە نەکردۆتەوە.

لەکاتێکدا ئەم سامانە گەورەیە گەر هەروەکو خۆی بێ سوود لێوەرگرتن بهێڵێرێتەوە نەك هەر هەڵەیەکی یەکجار گەورەیە، بەڵکو تاوانێکی زلیشە. لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەتایبەتی لە ویلایەتی وان، خەڵووز، قورقوشم، مس، قەڵای، بۆرەکس و دەیەها جۆری دیکەی کانزا و گۆگرد هەیە، جگە لەو کانیاوە کە ئاوی ساردی پڕ لە بیکاربۆناتی تێدایە.

دارستانی زۆر چڕ لە وڵاتەکە هەبوون، بەڵام بە درێژایی زەمان، هەمووی وێران کراوە. بە هەر حاڵ گەر تۆزێك هیمەتیان بۆ بکرێ بە ئاسانی زیندوو دەکرێنەوە.

لە کاتێکدا ئەم سامانە گەورەیەی کە سروشت بە ئێمەی بەخشیوە لە ئارادایە، دەبێ بۆچی تا ئێستا کەس بیری لە سوود لێوەرگرتنیان نەکردبێتەوە؟ کەچی لە شوێنی وەکو ئەستەموول، ئیزمیر و ئەطەنە و چەندین جێی تر بەدوای ناندا بگەڕێین و ڕەزالەت و سەفالەت بەدوای ژیاندا قبوول بکەین و لە وڵاتی غەریبی داڕزێین؟

ئەوەی راست بێ، گەر لەناو کورداندا یەك تاکە سەرمایەدار بە تەنها بکەوێتە کاریش هیچ شتێکی وای دەست ناکەوێ، بەڵام گەر دە یان بیست کەس بکەونە یەك بە ئاسانی دەتوانن لەم بوارەدا ئەنجامی گەورە بەدەست بهێنن.

پاشماوەی هەیە

## وتە بەنرخەکانی جەنابی عەبدولڕەحمان بەگی کوڕی بەدرخان پاشا
## (ئەم وتارە لە کۆنفرانسێکی تاشناقسوتێوندا دراوە)

هاونیشتیمانە بەڕێزەکان!

ئەو فەلاکەت و لێقەومانە گەورەیەی کە یەڵدز (یلدز کۆشکی فەرمی سوڵتانی عوسمانی بووە و لێرەدا مەبەست لێی سوڵتان و دار و دەستەکەیەتی - وەرگێڕ) لە سەردەمی زۆرداریيدا بەسەر گشت سەرزەمینی عوسمانی، بەتایبەتی ولایەتەکانی ئەنەدۆڵ، کە زادەگای ئێمەن، هێناوە، ئەوە سی و دوو ساڵی ڕەبەقە لە سەرینی دەست بە پشتدادانی تەڵەکەبازانەی دەوڵەتەوە بەردەوامە. باوەڕناکەم هەر کەسێك کە ئاگاداری ئەم کردارە ناشیرین و زشتە بێ لە داخا دڵی پڕ لە خوێن و ژان نەبووبێ.

مەدحەت بەگی برام لە میسر، خۆشم لە ئەوروپا و لە شوێنێك، کە پەنجەی زۆرداری پێمان نەدەگەیشت، لە ڕێگای ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ەوە، کە پێکەوە بڵاومان دەکردەوە، ئەوەی بۆمان کرابێ لە بواری بڵاوکردنەوەی نووسین، بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان کورد و ئەرمەنیدا، درێغیمان نەکردووە، واتە ئێمە بە کردار ئەو ئەرکەمان بەجێ هێنا کە دەکەوێتە ئەستۆمان. هیچ گومانیشم لەوەدا نییە کە براکانی دیکەشم لەم هەستەدا لە ئێمە جیا نین. بەڵام لەبەر پێویستی

زەمـان و بـارودۆخ و چـونکە نەیانـدەتوانی لـە ئەسـتەموولّ دەرچـن لـەم هـەولّ و تەقەلاّیەی ئێمەدا بە کردار بەشدارییان نەکردووە، لەگەلّ ئەوەشدا لـە دەوروبـەری خۆیـان کورتیـان نـەهێناوە. لـە دەی تـەمووزدا قـانوونی ئاسـایی گەڕایـەوە، بەردەستی میللەت. ئەمە بۆ گشت عوسمانییەکان رەحمەتێکی خواییە و بە هەولّ و فیداکاری گەل و سونگی سەربازەکان، پاش ئەوەی سی و دوو سالّ لە دەستمان دەرکـرا و لەلایـەن زۆرداریـیـەوە خرایـە ژێـر بـەردەوە، گەڕایـەوە و لەگـەلّ خۆیـدا مژدەی ئازادی هێنا.

زۆرداری کە ئەم هەموو ڕۆڵەیەی نیشتیمانی داڕزاند، لابردن و سڕینەوەی ئـەم زۆرداریـیـە کـە سەرچـاوەکەی لـە سـەرای یلـدزەوە سـەر دەردەخـا بـۆ هـەموو عوسمانییەکان بۆتە دەردێکی گەلێك لە ڕشانەوە و کولێرا و پەتا خراپتر، وا ئێستا قسە و فەرمانەکانی وەکو نەبوویان لێ هـاتووە، بـەم کـردارە دیـوارێکی ئەسـتوور لەبەردەم زولّم و زۆرداریدا دروست کرا. ئیتر وا کـورد و ئەرمـەنی کـە لەسـەردەمی حوکمفەرمایی یلدزدا دەستیان چووبووە خوێنی یەکدا، ئێستا وا پێك هاتن و بوون بە یەك، بوون بە برا، بەلاّم ئەی هاولاّتیانی بەڕێز، ئەی ڕۆڵەکانی هەمان نیشـتمان، هەمان خـاك یـا باشـترە بلّـێم، ڕۆڵـەکانی هـەمان دایك، ئامـادەبووانی بـەڕێز، لـەم پێکەوە گردبونـەوەمان مەبەسـتمان ئـەوە نییـە دروسـتکردنی پەیوەنـدی نێـوان کورد و ئەرمەنی تەنها لە چوارچێوەی قسەدا ڕابگیرێ، مەبەستمان ئەوەیـە ببێتـە بەندی برایەتی، یا دەبێ بە کردار ببین بە بـرا، بـەو پەیوەنـدی برایەتییـە سـوودی ئەرمەنی سوود بێ بۆ کـورد، زیـانی ئەرمـەنی زیـان بـێ بـۆ کـورد، دەمانـەوێ بـە ڕاستی، بە دلّ و گیان، بە کردار ئەم قسەیە بهێنینە دی!

ئامـادەبووان! ئـەوەی کـە ئینسـان بـە ئینسـانەوە شـەتەك دەدا بریتییـە لـە (**نیشتیمان**)، (**زمان**)، (**ئاین**)، ئەمانە پەیوەندی یەکجار گرنگن. جا با لەبارەی ئەم بابەتە گرنگانەوە نەختێك بدوێین:

با لەپێشدا باس لە نیشتیمان بکەین، نیشتیمان واتە هاوکاری کە مایەی هەرە سـەرەکی بەختـەوەریی مرۆڤەکانـە، مرۆڤـەکان، نـەك تـەنها لـە ئاسـتی نـاو هاونیشـتمانییەکانی خۆیانـدا، بـەڵکو لـە ئاسـتی هـەموو مرۆڤایەتیـدا، گـەر بێتـو دەستی یارمەتی و یاریدەکردن بۆ یەکدی درێژ بکەن، ئەوا بەوە گەلێك خزمەت بـە

سوود و قازانجە تایبەتییەکانی خۆشیان دەکەن. لەبەر ئەمە زۆر سروشتییە گەر کورد و ئەرمەنەکان، کە لە دامێنی هەمان چیاکان و لە کنار هەمان ڕووبار و گۆمەکان و لەژێر هەمان ئاسماندا لە دایك بوون و پێگەیشتوون، پێکەوە دەست بخەنە ناو دەست و شان بدەنە شان و ژیانێکی پڕ ئاسایش و بەختەوەری ببەنە سەر. ئەو پێکەوە ژیانە برایانەیە بێگومان ئاسوودەیی و سرەوتیشیان بۆ دەستەبەر دەکا. هیچ گومان لەوەدا نییە ئەو مرۆڤانەی کە لە سیمادا هاوشێوەن لە هەڵسوکەوتی رووحیشدا لە یەك دەچن، ئێوە بنۆڕنە سیمای کوردان و ئەرمەنییان بزانن چەند لێك دەچن. کەواتە ئەم دووانە لە هەست و نەستیشدا چون یەکن. هەموومان دەزانین کە سەرکەوتن و پێشکەوتنی هەر گەلێك کاتێك دێنە دی کە ئەندامەکانی لە بوارە رووحییەکاندا لێك بچن. لێرەوە دەتوانین بڵێین کە نیشتیمانەکەتان ئێوەی چون یەك ئافراندووە. لەیەك هەوێر دروستی کردوون، بۆیە سوود و زیان و چاکە و خراپەشتان هەریەکە. با بێینە سەر زمان: هەموو کەس بە ئاشکرایی دەزانێ کە وێکچوونێکی زۆر لە نێوان هەردوو زمانی کوردی و ئەرمەنیدا هەیە، بەڵام تەنها بۆ ئەگەر، با بڵێین دوو زمانی تەواو لێك جیان، ئایا پێکەوە هاوکاریکردنمان، دەست خستنە ناو دەستمان بە سوودی هەردوولامان ناشکێتەوە، ئایا ئەمە نابێتە مایەی بەرپابوونی ئاشتی و خۆشگوزەرانی بۆ هەردوو لامان! بەکورتی، ئەگەر هەردوولایەن بە تەبایی و برایانە لە پەنای یەکدا بژین ئیتر کەس ناتوانێ لەجیاتی (بەگ) بە کورد و ئەرمەنی بڵێ (مەگ)، و هیچ شتێکی ئەوتۆ نامێنێ بۆ هەر کەسێك کە تۆزقاڵێك مێشکی لە کەللەدا، ئیتر ناکۆکی و دووبەرەکی بخاتە نێوانمانەوە.

ئێستا، با بێینە سەر مەسەلەی (ئاین) کە هەندێ جار دەبێتە بابەتی ناکۆکی و هەندێ جاری تر دەبێتە بابەتی جیاکاری لە نێوانماندا.

ئێمە لە سەرەوە باسی سوودەکانی پێکەوەژیانی تەبا و ئاسوودانەمان کرد لە نێوان هەموو مرۆڤەکان، بەتایبەتی هاونیشتمانانندا، بەڵام با بزانین ئایا ئاین بەربەستە لەبەردەم ئەم کارە پیرۆزەدا کە دەبێتە مایەی بەختەوەری و شادیی هەموو بەشەرییەت؟ بێگومان نەخێر! بەربەست نییە!

له ئاینی ئیسلامدا، به هیچ جۆرێك دەستدرێژیکردن بۆ سەر ماڵ و گیانی برایانی کریستیانمان ڕەوا نەبینراوە. لەم ڕووەوە تەنانەت بچووکترین کەلێن بوونی نییە. بە پێچەوانەوە هیچ جیاوازییەك لە ئیسلامدا نییە لەنێوان مافی مسوڵمان و کریستیاندا، و هەموو دەستدرێژییەك بۆ سەر مافی کریستیانێك بە قەی دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافی مسوڵمانێك ناڕەوا و نەکردەنی و نەفرەت لێکراوە و بە گوناهی گەورە دادەنرێ.

هیچ گومانم لەوە نییە کە ئەو ئاینەی برایانی کریستیانم پەیڕەوی دەکەن بە هیچ کلۆجێك ڕێگا بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافی مسوڵمانان نادات و هەمیشە ئاین و مەزەب مافی هەموو مرۆڤەکان بە پیرۆز و پارێزراو دادەنێن.

ئایا هاتوچۆکردنی ئەرمەنییەکان بۆ کڵێسەکانیان چ زیانێك بە کەسێکی کورد دەگەیەنێ؟ نەخێر! لە بەرامبەردا ئایا هاتوچۆکردنی کوردان بۆ مزگەوتەکانیان چ زیانێك بە ئەرمەنێك دەگەیەنێ؟ دیسان، نەخێر!

کەواتە، ئەو فیتنە و فەسادیەی لە نێوان مرۆڤەکاندا دەخولقێنرێ هیچ پەیوەندییان بە ئاینەوە نییە، بەڵکو دەرهاتەی جەهالەت و نەزانیی هەندێ کەسە.

هاونیشتیمانە خۆشەویستەکان!

بەم جۆرە ئاشکرا دەردەکەوێ کە جیاوازی ئاین و زمان هیچ هۆ نین بۆ لێك ترازانمان. ئێمە کە ڕۆڵەی یەك نیشتیمانین، قازانج و دواڕۆژی هەموومان لە پێکەوە ژیانی ئاشتییانەماندایە، جا ئەوەی کە بۆتە مایەی تێکدان و چرژانی بارودۆخەکە و، لێککردنی کوڕ لە باوك و کچ لە دایك و برا لە برا، چەپەڵییەکانی سەرایە، بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەم فیتنەیە ئەرمەنی و کوردەکان کە زادەی یەك ڕەگەزن، دەبێ دەست بخەنە ناو دەست و بە دڵ و بەگیان تێبکۆشن بۆ کۆتاییهێنان بەم هەموو ستەم و تاوانەی کە سی و دوو ساڵی ڕەبەقە بەرامبەریان ئەنجام دەدرێ و پێکەوە بکەونە خەمی ئاوەدانکردنەوە و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی نیشتیمانە خۆشەویست و وێرانەکەیان، ئێمە هیواداریین ئەم ئومێدەمان بێتە دی.

دوابەدوای عەبدولڕەحمان بەگ، هەر یەکە لە نوێنەری وان پاپا زیان ئەفەندی بە زمانی ئەرمەنی، حوسێن پاشای کوڕی بەدرخان پاشا بە کوردی و مەعلومان ئەفەندی بە ئەرمەنی و خاچادۆر ئەفەندی بە تورکی، وتار خوێندرایەوە. خاچادۆر ئەفەندی هیوای دەربڕی کە خراپکارییەکانی سەردەمی زۆرداری و ئیستیبداد جارێکی تر ڕوونەدەنەوە و کورد و ئەرمەنی پێکەوە دەست لەناو دەست بکەونەوە بۆ تێکۆشان و هەوڵدان بۆ ئاوەدانکردنەوە و ئاسوودەیی نیشتیمان. پاشان سوپاسی خۆی بۆ بەدرخانییەکان دەرخست لەسەر ئەوەی هەمیشە لە کۆنفرانسەکاندا ناڕەزاییان دەربڕیوە بەرامبەر هەر جۆرە دەستدرێژییەك بۆ سەر گیان و ماڵ و موڵکی ئەرمەنییەکان و لەو بوارەدا چەندین تەلگورافیان بۆ هەندێ سەرۆك و گەورە پیاوانی کوردستان ناردووە و داوای دەست پارێزی تەواویان لێیان کردووە. هەروەها ستایشی ئەوەی کرد کە عەبدوڕەحمان بەگ لە دوانزە ساڵ لەوەبەرەوە لەڕێی ڕۆژنامەی کوردستانەکەیەوە هەمیشە ئامۆژگاری ئینسانییەتکارانەی کوردەکانی کردووە و چ بە تورکی و چ بە کوردی بەو بابەتانەی لەوێدا دژ بە حوکمی زۆرداری سوودێکی زۆر بە ئەرمەنییەکان گەیاندووە و بە ناوی ڕێکخراوی تاشناقسوتیۆنەوە دەستی برایەتی بۆ عەبدوڕەحمان بەگ درێژ کرد.

لە بەرامبەردا، عەبدوڕەحمان بەگ دیسانەوە چووەوە سەر مینبەر و وتی بە ناوی ئینسانییەت و برایەتی و دۆستایەتی و دوارۆژی پرشنگدار بۆ موڵك و میللەت، ئەوا بە شانازییەوە دەست دەخەمە ناو ئەو دەستە برایانەیەوە و لە ناخی دەروونما بە گەرمی دەیگوشم. دانیشتوان بەم قسانە ئەوەندە بە گەرمی هاتنە جۆش، کە گشتیان هەستانە سەر پێ و کردیان بە چەپڵەڕێزان.

### عەزمانێ مەیێ کرمانجی

دەولەت سەری خوندینێ و زانینێ فەلا زوودە ئازای بەرینە ژ زولم و ئەسیرییا شاە و پادشاهان ئازابوونە ژی مال و جان و عەرضی خو ئەمین بوونە، ژ تو تشتا ترسا وان نەما ژی خورا مەکتەب و مەدرەسە ڤەکرین حەمو بوونە خودی هونەر و مەعریفەت وەکو هسترا نەمانە لبن بارا شکر ژی خدێرا ئازای ئیدی گهاشت مە ژی

وەکو ئەم ژی رییا دەولەت نك خۆ بگرن دەستێ خو ژی زولم و کوشتنا بکشین مالی کەس نەدزین ل حەلالی خو رازی بیبن مەکتەبا ڤەکن علم و هونەر و مەعریفەت و صەنعەتێن قەنج ژی خورا بکرن بزانن کو علم و هونەر و مەعریفەت و صنعەت ل دنیای و ئاخرەتی مرۆڤا ژی عەزاب و سەفالەت و رەزیلی دژواری مە ها دکت دەما مرۆڤ نەسڤیل نە ژاریەن دڤێ سەرفراز و نامدار بە. ئەی قەومێ نەجیبێ کوردان، ئەی کوردێن خوەی ناموس و حەمیەت و سەخا و شەجاعەت، سەرفرازی ژی رەبینی ژ فەقیری چەترە، سەرفرازی ژی چدبە ژی علم و خوندینێ قەنجیا ئاخرەتی ژی چە حاصل دبت ژی علم و خوندینی رەضا خدێ مرۆڤ ژی چەوزانت ژی خوندینێ ئیدی جەهل بەسە ژبۆ خدێ مەکتەبا ڤەکن زارۆکا بدن خوندن بعەلمینن صەنعەتا و حەتا حەدیثا فەخری عالەم (اطلب العلم من المهد الى اللحد) روس خدای پێغەمبەر ژی تەحصیلا علمی ژی مهەتکی حەتا تربی فەرمان دکت ئەف رییا نەزانا کریتی نە رێکەك قەنجە ئیدی ریا خدی و پێغەمبەر بکرن نە ریێ بەسە ئەی مەلا و سەیدای مین خودی وقار ئەی فوضەلاو سەیدای مین سەرفراز وەلات، وەلاتێن مە ئەو کوردێن دلپاك، ئەو کوردێن خوەی بەخت و نەجیب گەلەك هێسانی تێن ل سەر رییا راست، فەضل و کەمالا وە، راستیا وە ئەم دزانن ژی وەلاتیانرە بژین ریا قەنج نیشانی وان بکن ئەڤ شبا ژی سفلی سەیدای مای خودان کەمالن ئون هیمەت بکن تەوفیق ژی ژ خودێیە پاشی رۆژا قیامتی ل حضورا خدێدە مەلا و سەیدا شەرمسار دین بزانین.

لاوێ ئەمیر بەدرخان
حسێن کەنعان

## کوردستان

مالباتا ئەمیر بەدرخان ژ قەنجیا کوردان دلخۆش ژ خراپیا کوردان دلناخۆش دبن، مەقصەدا دەرخستنا ڤی جەریدەیێ ژی سەلامەتا وەلاترایە چە قەنجیا ژ دەستی مالباتا ئەمیر بەدرخان بیت وی بیکن هون ژی حالی ولات ژ مەرا بنویسین دا ئەم بزانین چاوە خدمەتی ژ ولاتی خورا بکن.

## ئاری كرن هەر ئاری كرن
## شیرەتەك ژ كوردا رە

ئاری كرن لناڤ حەمی خەلكیدە لازمە، لناڤ وەلاتیا زێدەتر لازمە، وەكی ئاری كرن لناڤ ملەتادە نەبت خۆشییا كەسی نامینت خەلك ژار دبن، خەلك هەڤدو دكوژن، دبت سەبەبا خەسارا ئاخیرەت و دنیایێ، زارۆك ژنك ژار و پەرێشان دبن، نەیاری حەتا مرنێ نەیاری دبت.

ژبەر ڤان حالی خراب چڤا كتێبی ژ ئالی یێ خودی هاتنە ئاریكارییێ ئەمر دكت، ئیتاعەت كرنا ڤی ئەمری لسەر مە فەرضە، دڤێ ڤی ئەمری تو جارا ئەم ژبیر نەكن وەكی ئاری كرن لناڤ خەلكیدە هەبیا سی و هەوڤا سال پەریشانی، غەریبی، فەقیری، زەلیلی، كوشتن نەدبی، مالا خەلكی خراپ نەدبی، حەمدی ژ خودێرە بكن ئازادی كەت دەستی مەدە. پاش نهو ئاری كرن و تفاقی خوشتر ژی دبت، دڤێ ئەم حەمی قەدری ڤی ئازادیێ بزانین نەبێژن ئەڤ ئەرمەنیە ئەڤ قتولیكە.

فەرقی نەكن هون حەمی مرۆڤی ولاتەكینە ل ناڤ وەدە دائیما تفاق و ئاری كرن هەبت وەكی هون هەر ئاری هەڤدو بكن وەلاتی دە بێشك حەتا قیامەتی مەعمور و مەسعود بت زولم و ئیستیبداد توجا نابت ژاری و فەقیری نامینت وەكی تفاقی و ئاری كرن ناڤ بینا وە دبیت صەنعەت و مەعریفەت ژی وی حاصل ببت هون حەمی ژی دەولەمەند بن محتاج كەسی نابن ڤی حاجەتی صاغی هەبت ئاری كرن هەر ئاری كرن تفاقی هەر تفاقی.

ڤێجا ئەم پیچەكی ژی بەحثا سەبەبا ئاری كرنێ بكن كا ئاری كرن چاوە حاصل دبت.

وەك ئەز زانم كەس مالی كەسی نەخوت كەسی تەعدایێ ل كەسی نەكت، كەسی دلی كەسی نەشكینت، كی مرۆڤی دەوری ئیستیبدادی مالی یەكی خواربت یان حەقی وی بدت یان دلی وی چێكت دا ئەو حەق لێ حەلال ببت، دلێ خۆدە نەیاریی نەهەبت چڤا قەنجی ژ دەست مرۆڤ بیت ئاریكاریا هەڤدو بكیت ئەمری خودێ و پێغەمبەر قانونا عوسمانی توجا ژ بیر نەكیت وەلێ ئیتاعەتی بكین د یەك دل و جان بن.

دڤێ ئەم بەحسا ئاری کرنا عمومی ژی بکن ئـەم قـەنج بـزانن تفاقـا عمـومی ژ مەرە فەرضە، کەسی نەبێژە ئەڤ ترکە کەسی نەبێژە ئـەڤ عەرەبـە کەسـی نەبێـژە ئەڤ ئەرتودوکنەبێژە ئـەڤ چەرکەسـە، کـەس نەبێـژە ئـەڤ لازە، کـەس نەبێـژە ئـەڤ بۆشناقە، کەس نەبێژە ئەڤ فەلەیە، بێژن ئەم حەموو برانە، ئاریکـاری ڤـان حـەمیا بکین، حەمی ملەت بنی ناڤی عوسمانیدە خویی تفاق و محەبەت بـبن کـەنگی یـەك دوو ملـەتا خـو دان ئـالیکی ئیسـتیبداد و پەریشـانی زولم و تەعـدا وەك بـەری مـە حەمیا خراپ و ژار بکیت. ژبـەر ڤـی سـەبەبی تفـاقی هـەر تفـاقی حـەتا عاقیبـەتێ وەکی تفاقی هەبت تەوفیقا خودی ژ وی هەر هەڤال بت.

لاوێ ئەمیر بەدرخان

ئەمین عالی

## ل کوردستانێ چی هەنە

بەلێ وەلاتێ خوە بجڤینن: پەرا بدن هۆ. گەلەك مەردێن کورد هەنـە خونـدایی و ژێ هاتینە، عومرێ خـوە لغوربـەتا بوراندنـە، حـەمی تشـتا دزانـن، ئێکـی ژ وان وەلاتییە خوەرە خێرەکی رێکن، بخوازن وێ دەرێ، ئەوی بچە، فکـرە چ مەعـدەن هەنـە ل نـاو ولات دە صـەرف دبـە. ئیـی نهـۆ رە ئیمتیـازا وی بخـوازە و بدەسـت دەرئانینا وی تنە بکە ژ وێ ژی فائیدا مەزن ئەوە پەرەیێن وەلاتیا ل وەلاتـدە ئـێ بمینە. ژارێن کوردا ژی ئێن ل وەلاتە ئیشا ببینن، ئیدی خوە ناوێژن غوربەتا، نابن ئەسیری نەئەوا.

پاشی ژی ئێ رۆژەك بێ، دەولەتی وان حـەمیا چـێکە، هـەر ئالیـا وەلاتـی وی شەمەندوفەر بچتێ.

مەڤەلا نهۆ ل وانیٚ فابریقەك یا ئاری و یا قوماشی چیێکن، نێزیك وانـدەرا ژی مەعدەنیکی کمـوری ببیـنن، بشـوغلینن. پـەز زەحفـە ژ هوریـا وی پـەزی قوماشـا چێکن. شونا قوماشی جلێن خوە ژ دەر بینن بکرن، هندە پەرە بدن، هونی هوریـا پەزی خـوە بفرۆشـن، ژوی فائیـدا وەیـێ ببـە. زارویـێن ژارایـی دەرکـەون دەشـتی گیاهن بویایی ڤیك بدن بفرۆشن ئەوژی ژوی ئێ پەرا بدن هۆ. میرێن بێ شوغل ئێن ل وان فابریقا بشوغلنن نەفـەقا رۆژا خـوە وێ دەرێخـن. وە بـەلکی زێـدە دەرێخـن

ڕۆژەك ببن خۆی مال و نەوال، كونجی هونێ لوێدەری بقنج بفرۆشن هـونی قومـاش و ئاری ژ نهۆ ئەرزان بكرن، ئەو حەمی فائیدەیی وە نەكی ولاتیا بزمانەكی هندكدە دلخند دكن.هن عەردێ وەلیت نە ئـێ چـاندنیە لـێ بـارا مـەزن ڤـی چـاندن و قـەنج مەحصـول ددە، عـەردێ لنـاڤ فـورات و دجلـەیی، عـەردێ جـەزیرە وە قـابیلی زراعەتییە، ژ نەوالا نیلی چێترە، لێ چـاندنی قـەنج نـزانن، بعـادەتی بـەری دكـرن، دڤێ ئەم وان عادەتا بەردن، نهۆ عادەتێن قـەنج و ب فائیـدە هەنـە، ئـەم وان یـەك بدن و چاندنی ولی بكن، هنكە هەكە نهۆ لسەری سەدا دە بیت یـێ ل سـەدا پنجـی بیت.

عەجـەبا حكومـەت ژی كـەنگی وێ ببینـت بـیرا خـوە لـوەلاتی كـوردا ژی مەكتەبێن صەنعەت و چاندنی ڤەكت.

هەكە دەولەتی مەكتەب لواندەرا ڤەكر، كوچـە ژی بعەلماندنا، چـاندن گەلـەك ببیا، هنەكی فائیدا حكومەتی ژ وەلات ژ نهۆ زێدەتر، گەلەك زێدەتر نەدبی.

بوی كیرەژی ئەو ئیشێ مە گوتی، بێ ئاریكاریا حكومەتی نابت، دوێ دەولەت ئاری كوردا بكت. هنگی ئەو حەمی ئێ ببن و قەنج چێ ببن.

## وەلاتی دڤی چاوە بن

بـەری چـەند ڕۆژەكـی عەبـدوڵڵا زوهـدی بـەگ خـوەیی یكـی غەزەتـەیی: ب ئینگلیزیكی خون قەلەم خورت شـتغلیە، ئینگلیزیـی گـوتی یـی: (هەكـە مـرو بـوی خراپ ژ باژارا دەركەوت و ولات تەرەقی بكن. بەری حەمیا دڤێ هشی ولاتیا تەربیە بكن و مەزن بكـن، ئینگلیـز بپـاپۆرینی خـوەیی شـەری ناودانـە لنـاڤ دەولـەتادە ژ حەمیا خورتر بن. ئەو دەولەتا خورت و مـەزن ژ پـاپورینی خـو زێـدە پشـتا خـوە بهشی خەلكێ خوە قایم دكت و بهشێ وان سەربلند دبت. ئـێن ئیشـێ وی دەولـەت چێدكت. یی چاڤ لئیشێ وی وەدكت و ددە چێكرن حـەمی هشـی خـەلكی و چـاو و گرینا خەلكی وینە. لوی دەری وەكی ناظرەك ژ وان روتینـە مـەزلا ئیشـی خـوەدە دوشغلە دزانە كی چاوی خەلكی حەمیا لسەر وی ڤە كری یە. دە ئیدی یەكی هۆلی بزانە كو حەمی خەلك بهشن و چاڤ دانە سەر حەرەكەتێن وی. توجا دكـارە تشـتی خراب بكە. ئەو پێكاهاتنا مەزن ژ وی دەولەتا خورت و مـەزن تـنێ ڕەیـە. خـەلكی

دەولەتا فرانسز گەلەك مروڤین بلـەزن.، ژ تشـتەك كچك خـوە دیـن دكـن، ژ هشـی خورت پترپی لزبینە دکەون. خرابیێن ها تێ سەرێ وی دەولەتی حەمی ژویکی بـی لێ ئەوان ژی ئەو خرابی لخوە دی وزانی.

دەست هلانینی، شوغلێن دابردن، رێك قـەنج و بفائیـدە بكرنـی. نهۆ ئیـدی ژ حەمی تشتا رە قەنج فکر دكنی، بێ خێری ناکەون. بەرینهۆ یەك ژوانی قەنج بێژە، ئان قەنج بنڤیسە ئەدەبی ژ خرابیا ناظر كی دشـتغلی، دنویسـی، هـەما ئـەو خـەلك لهۆ دكەتنێ، تێكەلهۆ دبین، ناظرینی خوەخمی دگاهرتنی، نهۆنەوەی، کـی بـوی و کەدوی بێژە، دنویسە ئەو ژی گوە ددنـی، هەکـە خەبـەری دی راسـت بـت، دبێـژن راستە، ژ دەولەتا خوە وی تشتی دخوازن، هەکە وان خەبەر پشتوە داڤێژن و گوە نادنێ.

دەولەتا ئالمانیایێ ژی دەولەتەکی ژ قەنجیا خەلکێ خوە و ژ بلندیا حکومـەتا خو رە گەلەك دشوغلە، وی دەولەتی هەر هشی خـەلكی لسـەر مێـرا نییـە و لسـەر عەسـکەرتییە خـویی کریـە، مـرووان ببینـە دبێـژە ڤـی حـەمی عەسـکەرن، قوماندارێرانژی حکومەتە، لێ نهۆ ئـەو ژی سـەر خـو وە هـاتن. زانـین کـی مێرانـی تەنێ ئیش ناکە، خوەبهش کرن، دا ئیش بمرانی یە ژی نەبت بکارینی بکـن. ئیـدی هون عوسمانلی ژی محتاجی هش و حکمەتێ نـە، دڤـێ هـون هـەر دەسـت هلیـنن، بێژن بشغلن واهشی ولاتـی یـە خـوە روخـایی بکـن، قـەنجی و خراپـی یـە بـزانین، بزمانەکی سیس گوندی و بازاری بزانن.

پاشیا وی هەیە

**ئاگاداری**

ئەو کتێبانەی ئەمجارە لە چاپخانەی (اخوت) چاپکراون.

| | |
|---|---|
| نخبة الفكر وەرگێڕان | لەبارەی ئوسوولی حەدیسەوەیە |
| هەزار و دووسەد حەدیسی شەریف | یەکێکە لە کتێبە کەم هاوتاکان |
| روض ورد | شەرحی ئەسمای حوسنا |

ئەحمەد سوڕەیا

چاپخانەی ئوخووەت

پاشكۆی ژماره (٢)

ژماره ٢٦٤ — ٤ ( اون بیرنجی سنه- سالا یازدەییْ) حەب ــ٤



هەفت رۆژا جارەكی دەردكەڤە ژبەر خوەشبوراندن و عەلماندنا صەنعەت و مەعریفەتێیە

**رۆژنامەیەكە بۆ گەیشتن بە زانست و هونەر و بۆ هاندانی كوردان هەفتانە بە زمانی توركی و كوردی دەردەچیْ**

**٥ مارت ٣٢٤ ١٨ی ئاداری ١٩٠٩ ٢٦ صەفەر ٣٢٧**

وینەی ئەو داوایەی پێشكەش بە نەزارەت (وەزارەتی) دادی بەڕێز كراوە:

لەسەر كوشتنی ئەمینداری هەرە پێشووی شار رەضوان پاشا لە (١٠)ی مانگی مارتی ساڵی (هەزار و) سێسەد و بیستەوە، ئەمین ئەسعەد ئەمین عەبدوڵلا كە پیاوێكی كوردە كە بە گومان گیراوە. نەجمەدین مەنلا و تاقمەكەی ڕەزا بەگ و سەدرەدین بەگ، بە تەجاوزكردنی دەسەڵاتی یاسایی، كەوتوونەتە لێكۆڵینەوە لەگەڵیدا، نەجمەدین بە دەسەڵاتی رابردووی لە پۆستی پێشووی وەكو داواكاری گشتی دادگای پێداچوونەوەی دەری سەعادەت ئەم كارەی كردووە. ئەوان دەستی ئەمینیان خستۆتە نێوان مەنگەنەوە تاكو ئەوەی خوێن لە پەنجەكانیەوە فچقەی كردووە، دوایی گۆشتی لەشیان بە گاز پارچە پارچە لێكردۆتەوە، دوایی بەڕووتی لە ناو تەڵانگەوە هەڵیانواسیوە و پاش ئاوی ساردڕشتن بەسەریدا داركاری دڕاندانەیان كردووە تا لە هۆشی خۆی چووە، كە لە لێدانی ماندوو بوونە ئینجا ناردوویانە بۆ نەخۆشخانە، تا بێتەوە سەرخۆی و دووبارە كەوتوونەتەوە ئەشكەنجەدانی لەو ناوەدا، چەندجار بەرامبەر ئێمە قسەی ناڕەوا و نەشیاویان كردووە.

لـەو کاتـەدا، میرەلایـەك کـە بەرپرسـی بەندیخانـەی دەری سـەعادەت بـووە، هەروەها بەڕێوەبەر رەزا بەگ و وەردیان فەرهاد ئاغا و حوسێنی چاوشی ژاندارمـە هەموو ئەمەیان بە چاوی خۆیان بینیوە، جگە لەمە کەسێك کـە لـەو سـەروبەندەدا مەئمووری خەستەخانەی بەندیخانەی گشتی بووە و ئێستا ناوی نازانین و بێگومان لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەردەکەوێ، هەموو ئاگاداری کارەساتەکەن.

هــەر لـەو سـەرو بەنـدەدا، بەنـدە و چـەند هـاوەڵێکم پـاش ئـەوەی نراینـە پاپۆڕەوە، دوای بەدوای گرتنمان لە هەمان شەودا، یەکسـەر بـۆ تەرابلۆسـی رۆژاوا دوورخراینەوە. ئەم رەفتارە لە سەردەمی زۆرداری و ئیسـتیبدادا کـارێکی یـەکجار باو بوو. نەجمەدین مەنلای نـاوبراو و سـێ پیـاوی تـر کـە ناویـان نـازانین لـە دەی نیسـانی ئـەو سـاڵەدا گەیشـتنە تـەرابلوس و دەسـتیان کـرد بـە داپشـکنین و لێکۆڵینـەوە لەگەڵمانـدا. بـە رۆژەوە بێوچـان لـە دواندنمانـدا بـوون لـە مەرکـەزی فەرمانداریەتی تەرابلوس، شەوانیش لەو ماڵـەدا کـە لەلایـەن شـارەوانییەوە بۆیـان تەرخان کرابوو سەرگەرمی ئامادەکردنی پلان و پرسیاری رۆژی دوایی بـوون. بـەم جۆرە ئەم هەیئەتە دە رۆژی رەبەقی لـە پرسـیارکردن و داپشـکنین و لێکۆڵینـەوە بردەسەر. لەو ناوەدا ئیفادەیەکی زۆریان شێواند و بەندوباوێکی زۆریان هۆنییەوە، هـەموویان رازانـدەوە وە بـۆ ئیمـزای موستەنتیقێکیشـیان خسـتە پـاڵی فایلەکـە، هەرچەندە ئێمە ئەوەی ناوی موستەنتیق بێ بە چاوی خۆمان نەمانـدی، ئەوەنـدە نەبێ نووسرابوو: مستەفا ئەفەندی. دوای بیسـت رۆژ تێگەیشـتین کـە هـەموو ئـەم فایلەیان بە هەڕەشە و ترساندن پڕ کردبووەوە و ئیمزا بەندیشیان بۆ رازاندبوەوە. لەبەر ئەوەی کە لە کـاتی لێکۆڵینـەوە لەگەڵمانـدا نەجمـەدین مـەنلا و تاخمەکـەی لەگەڵ هەندێکیاندا جنێو و قسەی سووك و ئەزیەتدانیان بەکارهێنا و لـە دەرەوەی بەندیخانە لە ناو زیندانەکانـدا، ئـەم کارەیـان دەکرد و لەبـەر ئـەوەی هـەموو ئـەو فایلـەی رێکیـان خسـتوو سـاختە و بـێ بنـەما بـوون، بـە زۆر بـێ خوێندنـەوە بـە حەسەن ئەفەندی وەکیلی سەرۆکی هەیئەتی تاوانبارکردن واژۆیان کردبوو، چونکە ئەو وتبووی من لەم کارە ئاگادارنیم و ئیمزای ناکەم. ئەو مەزبەتەیـە بـە ئاگـاداری عوسمان ئەفەندی، کە ئەوکات یاریدەدەری داواکاری گشتی تەرابلوسی غەرب بـوو و دوایی لە پاداشتی ئـەو یاریدەیـەی کـە لـە مەسـەلەکەی ئێمـەدا بـە نەجمـەدینی

دابـوو، ئـەم کردبـووی بـە سـەرۆکی دادگـا، هـەروەها بـە ئاگـاداری چـەند دار و دەستەیەکی ئەو عوسمـان ئەفەندیـەوە بـە ئێمـە راگەیـەنرا. لـەم کاتـەدا ئێمـە لـە زینداندا بووین و دیداری گشت کەسێکمان لێ قەدەغە کرابـوو و ئـەم قەدەغەکردنـە ئێستاش هەڵنەگیراوە.

لەو بەینەدا، زاتێکی خاوەن ویـژدان کـە سـەرۆکی دادگـای پێداچـوونەوە بـوو لەوێ و ئێمە ناوی نازانین، و لەو رەفتـارە بێدادانەیـەی لەگەڵمانـدا کرابـوو ئاگـادار بـوو، بـۆ ئـەوەی نـاوی نەچـێتە نـاوی ئـەو تاخمـە دڕندەیـەوە دەسـتی لـە کـار کێشابووەوە.

بەڵام نیعمەتوڵا ئەفەندی کە ئەندامی دادگای تاوانەکانی دەری سەعادەت بـوو و بۆ ئەو جۆرە کارە ناڕەوایانە سەری بە خۆیە نەبوو، یەکسەر ڕەوانەی تەرابلوس کرا و هەر بە گەیشتنی دادگای خستە گەڕ و بۆ هـەموومانی مـەرگ و زینـدانکردنی هەتاهـەتایی و کـاتی بڕییـەوە، جگـە لـە قەڵابەنـدکردن، دوایـی گەڕایـەوە دەری سەعادەت و لەوێ دوای گەڕانەوەی سەرکاری خۆی پلـەی بـەرز کرایـەوە جگـە لـە پارەیەکی زۆر کە بە ناوی خەرجی ڕێوە رژێنرایە باخەڵیەوە.

هەروەکو جەنابتان دەزانن بە گوێرەی یاسا و شێوازی دادگاییکردن، تاوانبـار دەبێ پێش ئامادەبوونی لەبەردەم دادگا و لە کاتی لێکۆڵینەوەشدا وەکیلێك دابنێ و لەگەڵ وەکیلەکەیدا راوێـژکاری بکـا. ئێمـە لـە هـیچ یـەکێك لـە قۆناغـەکان ئـەم مافـەمان بـۆ دابـین نـەکرا. نیعـەتوڵا ئەفەنـدی بـە هەڕەشـە و ترسـاندن هـەموو ئەوراقەکانی بە ئیمزاکردن دابوو. کاتێ کە لە مەسەلەکە ئاگادار بووین ناڕەزاییمان دەربڕی، بەڵام ئەوان بە درۆی (بە تەلغوراف پرسیار ئەکـەین و دوای دوو سـێ ڕۆژ وەڵامتان دەدەینەوە) دەمکوتیان کرد. بەم جۆرە ئەم ناهەقییە گەورەیە بەرامبەر ئێمە کرا و پاش زەوتکردنی مافی یاسایی وەکیل دانان، دادگایی کراین.

بـە هـەمان شـێوەی بـە نـاڕەوا حـوکم درایـن، وتـا ئاشـکراکردنی قـانوونی ئەساسـیی "دەسـتوور" تێکـەڵاوبوونمان لەگـەڵ خـەڵکانی تـر لـێ قەدەغـە کـرا، هەروەهابە هەمان شێوەی کە لە کاتی دادگاییکردندا نەهێڵرا چـاومان بـە پـارێزەر (وەکیل) بکەوێ قەڵەم و کاغەزمان لێ قەدەغە کرا، وچۆن نیعمە توڵا و نەجمەدین نەیانهێشت هیچ یـەکێك لـە وەکیلـەکان تەنانـەت ئەوراقەکانیشـمان بخوێننـەوە، و

دوایی براینە بەردەم دادگا بەو شێوە سەیرو سەمەرەیە دادگایی کراین، هەروەها چۆن کاتێ وەکیلەکان لەم پەردەبازییە ئاگاداربوونە وە کەوتنە ڕێکخستنی داکۆکینامە بۆمان، بەڵام نەجمەدین خۆی لە دەستی سەندن و بە هەڕەشە دووری خستنەوە، هەر بەو شێوە لە مافی دوایین داکۆکیکردن بێبەش کراین و مافی ئەمەشمان لێ زەوت کرا هەروەکو جەنابی پایە بەرزتان ئاگادارن، ئەم کارە ناڕەوایەی نەجمەدین و هاوەڵەکانی دەچێتە ئاستی تاوان و گوناهەوە و چەندین تاوانی لێ دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیە، ئەم کارەی ئەوان بە دەستدرێژی دادەنرێ بۆ سەر مافی کەسیەتیمان.

هەر وەکو ناڕەواییەکانی ئەو هەیئەتە لای حەپسخانەی دەری سەعادەت و نەخۆشخانەکەشی ئاشکرا و ڕیسوا بوو لە کاتی لێکۆڵینەوە و داپشکنین و دادگاییکردنمانیش لە تەرابلۆس چەند کەسێك ناڕەزاییان دەربڕی و دەستیان لە کار کێشایەوە، یەکێك لەوانە ئەو زاتە بوو کە سەرۆکایەتی دادگای پێداچوونەوەی تەرابلوس دەستی لە کارکێشایەوە و ناوی لەلای وەزارەتی (نەزارەتی) داد زانراوە. هەروەها مستەفا ئەفەندی کە لەگەڵ ئەو زاتەدا کاری دەکرد و (مستنطق) بوو، بەڵام ئێستا نازانین لە کوێیە، هەروەها ئەحمەد بەگی قوماندانی عەسکەری، کە فەرماندەی مەرکەزی تەرابلوس و وەکیلی فەرماندەی ژاندرمەش بوو، هەروەها بەڕێزان قەدری و ئەحمەد و عوبێدان کەڕوش کە ئەندامی دادگای پێداچوونەوەی تەرابلوس بوون و لەلایەن دادگاوە بە وەکیلی ئێمە دانرابوون، هەروەها عوسمان فکری ئەفەندی کە لەسەر ئەو کردەوە نامەردانەی لەگەڵ ئێمەدا دەیکرد نەجمەدین چەند پلەی پێی بەخشی، هەروەها محەمەد ئەفەندی باشوەردیانی بەندیخانەی تەرابلوس، هەروەها تگین ئاغا کە لە پاداشتی ئەڵقە لە گوێییدا بۆ نەجمەدین کردی بە مولازمی یەکەم، گەلێك کەسی تریش کە گەر بێتو لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکەی ئێمە بکرێ دەتوانین ناویان بدەین و ئەمانە دەکرێ ببن بە شایەتحاڵ لەسەر کردەوەکانی نەجمەدین بۆ ئەوەی بە گوێرەی یاسا ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ. ئێمە لێرەدا داوای ئەوە دەکەین کە کرداری یاسایی لەم بارەیەوە بخرێتە کار و نەجمەدینی ناوبراو و ئاوەڵەکانی بە سزای یاسایی بگەیەنرێن.

کوڕانی میر بەدرخان: حەسەن، خەلیل، مەدحەت، عەبدوڕەحمان

## حیلمی بەگ و نیعمەتوڵلا ئەفەندی

لــە یەکــەم دانیشــتنی دادگــاییکردنی نــەجیب مەلحەمــەدا، لەبــەر ئــەوەی بەرەوانت، کە یەکێك بوو لە داواکارەکان ناڕەزایی بەرامبەر سەرۆکی دادگا حیلمـی بەگ دەربڕی، لە دانیشتنی دووەمدا، لە جیاتی ئەو سەرۆکایەتی بـە وەکالـەت درا بە نیعمەتوڵلا ئەفەندی. ئەم کارە ئەوەندەی تر سەرسوڕمان بوو بۆ ئێمەمانان.

ئاخر حیلمی بەگ ئەو کەسە بوو، کە لەو مەسەلەیەدا و بە گوێرەی فەرمانی چەپەڵ و ئیستیبدادگەرانەی یلدیز چەندەها کەسی ئازادیخوازی کە گشت لایەك لە بێگوناهی ئەوان دڵنیا بوو، حوکم دا، و بەوە خۆی وەکو داردەسـتێکی رسـتکراوی دەورانی ئیستیبداد ناسـاند، ئێسـتا هـەموو کـەس دەزانـی ئـەو بـە خـۆڕایی و بـێ بەرامبەر نەبووە بە سەرۆکی دادگا. بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، میللـەت کـە تاقە هیوا و ئومێدی سەرەتاکانی مەشرووتیەتە، ئیتر چۆن دەبـێ لـە ژێـر سـایەی دەسـتووردا ئـەم جـۆرە کارانــە بکـرێن کــە بــە تــەواوەتی پێچــەوانەی گشــتی ستوونەکانین.

بابێینە سەر نیعمەتوڵلا ئەفەندی...... لەو ڕۆژەوە ئەو کابرایـە پـای ناوەتـە ناو مەسلەکی عەدلییەوە تا ئەمڕۆ لە هەموو ئەو مەئمووریەتانەی کردوونـی، تـەنها بـە دوای سـوود و قـازانجی تایبـەتی خۆیـدا گـەڕاوە. لـەم چوارچـێوەدا چـەندین ماڵوێرانی و ملشکانی بەرەنگاری خەڵك کردووە. هەروەها لەبەر ئـەوە یـەکێك بـوو لــە دەســتوپێوەندەکان عەبــدوڕەحمان پاشــای وەزیــری هــەرە پێشــووی داد، بەرزکردنەوەی پلەوپایەی هەمیشە پەیتا پەیتا لە برەودا بووە... جا لەبـەر ئـەوە پێویست ناکا کە بڵێین ئەم لە خراپەدا حەوت بەردی بە پشـتی نەجمەدینـدا داوە، ئیتر چۆن دەبێ لە شوێنێکی ئەوها هەستیاردا دانرێ؟!

ئـەو سـاڵی سێسـەد و بیسـت کـە بـۆ سـەپاندنی حـوکم بەسـەر کـوڕانی مـیر بەدرخاندا، ئەوە لە کاتێکدا بە هۆی عەبدوڕەحمان پاشای هەرە پێشـووی دادەوە لە لایەن مابەینەوە بڕیاری حوکمەکە خرابووە باخەڵی، هات بۆ تەرابلوس. تۆ بڵێی ئێستا لەم کارە نامەردانەیەی کەوتبێتە شەرمەوە و هەر نەبێ یەك دڵۆپ ئارەق لە ناوچەوانی هاتبێتە خوارەوە؟! نەخێر، هەیهات!!

ئەو تەنانەت بۆ گەیشتنی بەو پلە و پایە و نیشان و پارانەی کە دەستی کەوتوون نەك تەنها ئامادەیە دەیەها کەسی بێگوناه بپەستێتە کونجی زیندانەوە، بەڵکو ئامادەیە بە زیندوویی لە گۆڕیشیان بنێ. ئەمە چ لای ئێمە چ لای ئەوانەی دەیناسن مەسەلەیەك نییە کە بچێتە خانەی گومانەوە.

نەفرەت لە مەشرووتیەتی ئەوها!

ئەگەر ئەکرێ چاوپۆشی لە جینایەتەکاتی پیاوگەلی وەکو حیلمی و نیعەتولا و نەجمەدین بکرێ، ئیتر بۆچی نەجیب و مەلحەمە و نەجمەدین لەسەر ئەو هەموو ئەشکەنجەیەی کردوویانە ئافەرین و دەستخۆشی وەرنەگرن؟

بەڵێ، ئەگەر ئەوانەی لەسەر کرداری بەری پێش (١٠) ی تەمووزیان ئێستا دەستی ئافەرینیان بە پشتدا بدرێ و بەم جۆرەی کە بوو پلەوپایەی سەرووتریان پێ ببەخشرێ، ئیتر ئایا میللەت بۆی هەیە دڵنیا بێ کە دەرفەتێك هاتۆتە پێشی بۆ ڕزگاربوونی لە دەستی بکوژەکانی؟

ڕاستییەکەی، کاتێك میللەت دەبینێ ئەم گورگ سیفەتانە کە بۆ مشتێك زێڕ ویژدان و نیشتمان و ناموسی خۆیان کردە ژێرپێ، ئەوها دەگەنە بەختەوەری و ئیقبال، ئیتر برینەکانی نەسارێژ دەبن و نە لە ئازار دەکەون.

ئەگەر مەجلیسی مەبعووسانیش لەمە بێ دەنگ بێ ئیتر کارمان هەر دەمێنێتەوە سەر میهرەبانیی مەولا!

## مەرایی

(پاشماوە)

مەراییکاری هەر بەوەوە ناوەستێ ببێتە مەترسی لەسەر کۆمەڵگای بەشەرییەت، بەڵکو دەکشێتە سەر سامانی گشتی و ئەویش وێران و تەخشان و پەخشان دەکا و بەوە ئەوەی هەیە و نییە لە ناوی دەبا.

پێشکەوتن و بەرزەوە بوون و خۆشگوزەرانیی هەر میللەتێك بەندە بە پاراستنی سامانی گشتییەوە، کە بەرهەمی کاروباری بازرگانییە. بازرگانیش، بەوە پەرە دەسێنێ کە ڕۆڵەکانی گەل پێکەوە لە سەودا و هەڵسوکەوتدا راستگۆ و سەرڕاست بن. ئەم لایەنەش بەندە بە ئاسایشی گشتی خەڵکی وڵاتەوە. ئاسایشی

گشتیش پەیوەستە بە سەر شێوازی هەڵسوکەوتی، بێ قۆرت و ئاستەنگ و فرۆفێڵی کارکەرانی ئەم کەرتە، واتە کەرتی بازرگانی و ساتوسەوداگاری لەگەڵ یەکدا.

لێرەدا کە سەرڕاستی و دەستپاکی و نیەتپاکی سەرخەتی کارکردن بێ ئیتر پێویست بە مەراییکردن و هەڵخەڵەتاندن نامێنێ. بەڵام ئەگەر مەرایی و مەراییکەری ببێتە شێوە و شێوازی رەفتار و هەڵسوکەوت ئیتر جێگا بۆ سەرڕاستی و پاکیزەیی نامێنێت، و باوەڕبەیەك کردن لە ناودەچێ و کۆمەڵگا لەنگ و لەق دەبێ و سەرەنجام کاروباری بازرگانیش شلۆق دەبێ و شیرازەی تێکدەچێ و دەبێتە کردەیەکی ئاڵۆزی پڕ لە ناڕاستی و نادروستی و بێ پەیمانی و باوەڕبەیەك نەبوون، هەربۆیە سامانی میللیش بەرەبەرە دەپووکێتەوە و خەڵك دەکەوێتە ناو تەنگانە و دەستکورتی، تا بارودۆخی گشتی بەرەو دواکەوتن دەکشێ و میللەت و وڵات لە خەڵکانی تر دادەبڕێن و دەکەونە داوی دواکەوتوویی و ناکۆکی پچڕ پچڕیەوە.

دیارە تاکی ناو کۆمەڵگا، بە تایبەتی ئەوانەی بەشێکن لە گرووپێکی هاوشێوە، هەمیشە لە ڕەوتی ژیاندا پێویستییان بە یارمەتی یەکدی دەبێ، لەو حاڵەدا، ئەو تاکە چاوەڕێی جیدییەت و پەرۆشە لە بەرامبەرەکەی. لێرەدا، وەڵامدانەوە بە بەڵێ یان نا لەلایەن داوالێکراوەوە بەرامبەر بە داواکەر شێوەی پەیوەندییەکان دیاری دەکا. جا زمانی شیرین و رەفتاری نەرم لێرەدا پێویستن، بەڵام دوور لە هەڵخەڵەتاندن بە وشەی لووس وەکو بەسەر سەر، ئەمر ئەکەی و جۆری دیکەی وادەی درۆ کارێکی دزێو و ناشیرینە.

چونکە کەسێك کە خاوەن پێویستیە کە ڕوو دەنێ لە مرۆڤێکی ڕاستگۆ چاوەڕێی هەوڵێکی جیدییە. ئەو ناچار لە هەر دەرگایەك بدا تا بگاتە ئامانج، سەرەنجام یان سەرکەوتوو دەبێ، یان ناسەرکەوتوو، لەوانەشە بێ ئومێد نەبێ و هەر هەوڵدا. بەڵام گەر فێڵی لێ بکرێ و بەسەر سەروسەرچاو وەڵامی درۆی بدرێتێ، ئەوا هەوڵی لای تریشی لە دەست دەچێ و دەبێ تا کۆتایی بە ئەژنۆی خۆیدا بکێشی بۆ بە گفتی درۆی ئەو کەسە هەڵخەڵەتا!

ئـەوەی جێـی داخـە، گـەلێکمان لـەو جـۆرە ڕەفتـارە دەس بڕانانـە دەرس وەرناگرین، و لەو هەموو ڕەنج و هاتوچۆیەی کردوومانە پەشـیمان نابینـەوە، هـەر بە قسەی لووس و گفتی درۆ هەڵدەخەڵەتێین و بەو جۆرە لەو تەرزە کەسـە درۆزن و تەڵەکەباز و بێبارانە واز نـاهێنین و هـەر لـە ریـزی کەسـانی گـەورە و گرانـی نـاو کۆمەڵگادا دایان دەنێین.

بـۆ نیشـاندانی زیـان و خراپـی مـەراییکاری بـا ئـەم نموونەیـەی خـوارەوە بێنینەوە:

کابرایەك دێتە لامان و خواستێك دەخاتە ڕوو. گەر بڵێین: (**ئەم ئیشـە ناکـەم، سـەبرکە بـا سـبەینێ چـاوم بـە فـلان بکـەوێ، تـۆش وەرە بـۆ ئـەوێ قسـەی لـێ دەکـەین**) ئـەوا لـەو دەموسـاتەدا لـە کـۆڵی خۆمـانی دەکەینـەوە. سـبەی کـابرای بەسەزمان لەسەر وادە دێت، سەرمای بێ یان گەرما ناچارە بیکێشـێ. ئێمـە بـەوە بێ ئەوەی بەو زیانەی ئەو دەربەست بین، تـەنها بـۆ قورتـاربوون لـە دەسـتی ئـەو درۆیەی بۆ دەکەین، لە دڵی خۆشمان بەسەرکەوتوو دەزانین چـونکە لـە جاڕشـتێك ڕزگارمان بووە.

یەکێکی دیکە دێ بۆ لامان، هاتنەکە لە کاتێکدا دەبـێ کـە ئێمـە لـە گەرمـەی سـەرقاڵی و دەسـتگیراوییدابن. چـونکە ڕەگـی مـەراییمان تێـدا داچەسـپاوە، پێـی ناڵێین برام بـەخوا سـەرگەرمی کـارێکی ئـەوها و ئـەوها گـرنگم، تکایـە هاتنەکـەت بخەرە کاتێکی تر، دەست لە کارەکەمان هەڵدەگرین و ناچـار دەکەوینـە خـۆش و بێش کـردن لەگـەڵ ئـەودا و لـە کاتێکـدا لـە دڵـدا نـەفرین بـۆ بابـەلبابی دەنێـرین، ناچارین بە ڕوویەوە پێبکەنین بەو جـۆرە بـە لەدەسـتدانی ئـەو کاتـە بـە نرخـەیان تووشی زیانێکی زۆر دەبین.

بەڕاسـتی جێـی سەرسوڕمان و لـە هـەمان کاتـدا داخیشـە، کـە ڕەگـی قـوولی مەراییکاری و موجامەلە ئەوەندە نەفسمانی لەوتاندووە، کە ئیمڕۆکـە نەجیدییـەت نە ڕاستگۆیی مەگەر بە ئاستەم ئەگینا ئاسەواریان لە سروشتماندا نەماوە، ئـەوەی کەسێك بێت و ڕاستەوخۆیانە و بێ پێچوپەنا ڕەفتار بکا ئەوا گاڵتەی پێ دەکەین و بە ناو و ناتۆرەی سەیر سەیر سووکی دەکەین.

ئەوەتا ئیمڕۆکە گەلێك لە لاوانی تازەپێگەیشتوو هەن کە بۆ ئـەوەی نەکەونـە بەر تانە و تەشەر سروشتی راستگۆیانەی خۆیان دەگـۆڕن و ناچـار لەگـەڵ ئـاوازی زوڕنای کۆمەڵگادا دەکەونە رەقس و سەما.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ئێمـە ئەوانـەی پـێ لەسـەر ئـەم ڕێبـازە دادەگـرن بـە بەدرەفتار و چەوت کردار ناویان دەبەین. ئەمانـە جێـی گلـەیی و سـەرکۆنەکردنن، چونکە مەسەلەکان بە گوێرەی پێوەری هەق و دادپەروەری ناپێون. گەر بێتـو بـە تـەرازووی ڕاسـتی و دروسـتی کارەکـان بکێشـین. ئـەم جـۆرە ڕەفتارانـەمان لا دەبێزرێ و بێتام دەبن.

چونکە ئەو کەسەی خۆی بە هەڵگری بیروباوەڕی ڕاستی و پـاکیزەیی و دڵ و دەروون پاکی دابنێ، هەرگیز هاوڕ لەم تڕوهاتانە ناداتەوە و لەسەر ڕێبازی ڕوون و ئاشکرای خۆی هەنگاو دەنـێ بـێ ئـەوەی گـوێ بداتـە هەڵـەوەڕی و چەڵتەچـەڵتی بـەدکاران و نـەزانان، بەمـە بونیـادی فیکـری و ڕەوشـتی خۆیـان بـەرز دەپـارێزن. ویژدانی خۆیان لەکەدار ناکەن، بەو جۆرەی خودا پەسندی کردووە بەرەوپێشـەوە بە هەنگاوی دروست و چەسپاو چوست و چـالاکانە دەڕۆن، بـێ گومـان ڕۆژێـك دێ کە هەموو خەڵك دەسـتی ئافـەرینیان بـۆ هـەڵبڕێ و زمـانی دەستخۆشـی و هیـوای سـەرکەوتنیان بـۆ بخـوازێ. هـەر ئەوەشـە پاداشـتی سـەر ڕاسـتی و ملنـەدان بـۆ ڕەفتاری چەوت

صالح بەدرخان

(پاشماوە)

**لە کوردستان**

بۆ سوود وەرگرتن لەمانە بەر لەدانانی سەرمایە، دەبێ بیر بکرێتەوە لەوەی چـۆن بـۆ شـوێنی مەبەسـت دەگوازرێتـەوە. ئێمـە دەزانـین ڕێگاوبـانی کوردسـتان ئەوەندە سەختن، ئەوا شەمەندەفەر هەر هیچ، عارەبانە و ئۆتۆمبێلیش پێیاندا ڕێ ناکەن.

لەم حاڵەدا دەبێ چی بکەین؟ لەبەر ئەوەی ڕێگـا نییـە، دەبـێ دەسـت لـەم خێر و بەرەکەتە هەڵگرین. ئەم جەواهێراتە هەروا لە ژێر خاکدا بەشارراوەیی بەجێ بهێلین؟ نەخێر ئەوەش کاری کردن نییە.

دەبێ پانزە بیست دەستڕۆیشتووی کورد کۆببێتەوە سەرمایەکانیان ڕیکخەن، کۆمپانیایەك دامەزرێنن. بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کۆمپانیایەش دەتوانن لە تاقیکردنەوەی هاولاتییەکانی خۆیان کە لە ئەوروپا دەژین، باشترین کەلك وەرگرن. دەبێ ئەم کۆمپانیایە سوود لەو کانزایانە وەرگرێ کە لە کوردستان هەن و هەر ئەوانیش بەکاربێنێ. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ گەڕان و پەیجووری پێویست ئەنجام بدا. بەر لەوەی بکەوێتە کار. بێگومان ئەمرۆ یا سبەی ئەو رۆژە دێ کە کوردستانیش بە ڕێگاوبان بتەنرێتەوە و لە هەمان شێوەی ئەڵمانیادا شەمەندەفەر بەمسەرە و ئەو سەری ولاتدا تەڕاتێن بکا.

بۆ نموونە، گەر لەوان کارگەی کوتاڵ و پەردە، کە بە هەڵم کاردەکا، دابمەزرێ و بۆ ئەم مەبەستە لە کانە خەڵووزەکانی دەوروبەری وان سوود وەرگیرێ، ئەو هەموو خوریەی لەوێ هەیە بۆ ئەوەی گیانی برەنگێنێ، ئەوا بەو کوتاڵە بەنرخ و سفتوسۆڵەی دروست دەکرێ هەموو پێویستی پۆشاکی خەڵکی کوردستان دەکرێ. ئەوەندەی بەرەو ئەستەموول و ئەوروپاش بەڕێ دەکرێ.

یاخۆ دەبێ بڵێین بۆ ئەم مەبەستە لە کوردستاندا وەستای شارەزا و کارامەمان نییە، ئیتر دەستەوئەژنۆ دانیشین؟ کورد ئەوەندە زیرەك و زوو وەرگرن، کە لە کورتترین ماوەدا جڵەوی باشترین داهێنان دەگرنە دەست. تەنها پێویستیمان بە بڕیار و دەستپێکردنە، ئەو کات بزانن کورد چ زێڕنگرێکە؟

دوای کانزاکان نۆرە دێنە سەر دارستان و لێڕەوارەکانمان. هەر ئێستاکە خەڵکی ولاتەکەمان باشترین سوود لەم سامانە وەردەگرن.

هەر چەندە هەندێ لە زەوی کوردستان بۆ کشتوکاڵ دەست نادات، بەلام زۆربەی هەرە زۆری زەوییەکانمان ئێستا سەرچاوەی بەرهەمی بەسوود و پڕ بەرەکەتن. لە دۆڵی جزیرەدا کە لە باوەشی هەردوو ڕووباری دیجلە و فوڕات دان بە قەرایی دۆڵی نیل بە فەڕ و پیت و بەرەکەتە. بەلام دەبێ دەست لە شێوازی کۆنی کشتوکاڵ هەڵبگرین تا بتوانن بە باشترین شێوە سوودی لێوەربگرین. ئەگینا ئەم ڕێوشوێنەی ئێستا هیچی لێ هەڵناوەرێ. ئاخۆ دەبێ کەی دەوڵەت بکەوێتە خەمی کوردستانەوە و قوتابخانەی سەنعەت و کشتوکاڵی تێدا دروست بکا.

ئایا گەر قوتابخانەی کشتوکاڵی لە کوردستان بکرێنـەوە، خـێڵ و هۆزەکـان نیشتەجێ بکرێن و فێری شێوە و شێوازی پیشەسازی و کشتوکاڵ بکـرێن دەوڵـەت چەند بە قەدەر ئێستاکە دەستکەوت و داهاتی بۆ دادەڕژێ؟

کوردستان پڕە لە مێگەلە مەڕ و بزن و ڕەوە ئەسپ و ماین و گاگەلی مانگا و هی تـر. ئەمانـە سەرچـاوەی بـژێوی خـێڵ و هۆزەکـانن. هەوڵـدان بـۆ چـاککردن و پەرەپێدانی ئەم سامانە، ئایا بۆی نییە ڕۆژێ لە ڕۆژان بمانخاتە سەروو ئـەوروپاوە لە بەرهەمهێنانی سپیاتی و ڕۆن و شـیر؟ زۆر شـتی تـر لـە کوردسـتان هـەن. گـەر دەوڵەت بە نیازی پاکەوە دەستی یاریدە بۆ میللـەت درێـژکا هـەموو ئـەم ئاواتانـە دێنەدی. بەڵام گەر گوێی لێ بخەوێنێ تەنها چاوی لە دەسـتی دانیشـتوان بـێ ئـەوا تـۆزی لێ هەڵناسـتێ. چـونکە خەڵکەکـەمان هێشـتا نەگەیشـتوونەتە ئـەو ئاسـتە بەرزەی لە مەیدانی مەدەنیەتدا.

## بۆ پایەبەرزان بەڕێوەبەرایەتی بەڕێزی ڕۆژنامەی کوردستان

عەرزبێ لە خزمەتتاندا

ئێمە هەمیشە بە ناوی بەرز و پڕ بەهای ئێوەوە شانازی دەکـەین. هەمیشـە دەستی نزامان بۆ ئاسمان پەل کردۆتەوە خودا تەمەنتان درێـژکا و تەندروسـتیتان پێ ببەخشێ. ڕاستە ئێمە بە خزمەتی ئێوە ڕووبەڕوو شـەرەفیاب نەبووینـە، بـەڵام بڕوا بکـەن ئێـوە هەمیشـە لـە دڵـی ئێمـەدان. تـەنها هیمـەتی مەردانـەی ئێـوە بـۆ دەرکردنـی ڕۆژنامـەی (**کوردسـتان**) بەڵگـەی حاشـا هەڵنـەگرە بـۆ دڵسـۆزی و بـە تەنگەوە بوونتان لە ئاستی پێشـکەوتن و سـەربەرزی و یـەکگرتوویی گەلـدا. ئێمـە هەمیشـە چـاومان لـە ڕێنمـایی و سەراسـۆیی ئێوەیـە. ئێمـە لێـرە لەگـەڵ برایـانی ئەرمـەنیمان پێکـەوە یانەیـەکمان کردۆتـەوە بـۆ خزمـەتکردن بـە پێشـکەوتن و سەرفرازی نیشتیمانەکەمان. بەڵام پێویستیمان بە ئامۆژگاری و ڕێ نیشاندانە لـەم بوارەدا. ئەگەر لوتف بکەن لە وەڵامی ئەم نامەیەدا بەرچاوڕوونیمان پـێ ببەخشـن ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێین لـەم ئەرکـەدا سـەرکەوتووانە سـەر دەردەکـەین. ئێمـە چاومان لـە یارمـەتی بـرا گەورانـەی ئێوەیـە تـا فرمانـەکانمان بـە تـەواوەتی ڕوون ببنەوە و بزانین چی بکەین و چی نەکەین.

تاقە داوامان لە خزمەتتاندا ئەوەیە، هەندێ لە خەڵکانی وڵاتی دەرسیم کە لە سەردەمی ئیستیبداددا لەبەر ئەو زوڵم و زۆرەی لێیان کراوە ئێستاش بەڕاکردوودیی کەوتوونەتە شیو و دۆڵ و ناو چیاکانەوە. ئەمانە لەو ڕۆڵانەی عوسمانیین کە گیرۆدەی داوی جەهالەت بوونە و زۆربەیان پەستراونەتە کونجی زیندانەکانەوە و لەوپەڕی ڕەزالەت و پەرێشانیدا ژیان دەبەنە سەر. هێنانەوەی ئەمانە بۆ ناو خزم و کەسوکار و وڵاتی خۆیان هەم لە قەوارەمان زیاد دەکا و هەم دەیانگەڕێنێتەوە ناو باوەشی مەدەنییەت. هیواداریین بە لێبووردنێکی گشتی لەم حاڵە ڕزگار بکرێن. لەم ڕووەوە هەموو بە چوار چاو سەیری دەستی هیمەتی ئێوە دەکەین. دیسانەوە ئێمە لە ئەرزنجان چاوەڕێی ڕێنومایی ئێوەین تا پێشمان کەون و ڕێگای کارمان نیشان دەن. هیواداریین لەم ڕووەوە درێخیمان لەگەڵدا نەکەن. لە کۆتاییدا ئەمر و فەرمان وان لە دەستی پیرۆزتاندا.

چوقەدارزادە خەیرەدین ـ لە سەرۆکەکانی هۆزی قوڕەیش. مستەفا زادە بەکر بەدری ـ لە سەرۆکەکانی هۆزی قوڕەیش. خەلیل ئاغا زادە خەلیل عەلی ـ سەرۆکی هۆزی بالان ئیسماعیل.

**کوردستان**

زۆر سوپاسی ئەو لوتف و نەوازشە دەکەین کە دەربارەی هەم ڕۆژنامە و هەم خانەوادەکەمان دەربڕراون. ئەو پرۆگرام و ڕێنماییيانەی داواکراون بە پۆستەدا نێرران. بۆ مەسەلەی لێبووردنی گشتییش بە بایەخەوە بابەتەکە دەخەینە بەر دیدی وەزارەتی ناوخۆ.

## نەصیحەتا ماڵباتا ئەمیر بەدرخانە
## ژبۆ حەموو کوردا تفاقی

تفاق پیرۆزییە سەبەبی خۆشیێ و راحەت و قووەت و سەرفرازی و سەلامەتا وەلاتییە تفاقی نەیارا ژار دکەت بێتفاقی سەبەبێ خرابیا مال و دین دنیایێ ولاتە و قەوم و عەشیرەت و ملەتایە کەسی تەوەجوها ضە رەر ژی تفاقی نەدیتیە

عاقلانژی هۆلی گۆتینە ئەگەر قەوم و عەشیرەت بە تفاقبوونا سەرا یەلدزی هۆلی ئەم بە تالانییێ و کوژتنای وی بدانا.

هن رتبەی ڤر دانە وە هون بەردانە هەڤ وەکو دیکلوکا هون ژی خرابییێ پێڤە تو فائیدە نەگەهشت وەو نەگها ولات.

تفاقی مرۆڤا ژی ظولما خونکاران ئەمین دکت حەتا سید الصادقین فەرمان کرییە (یدالله علی الجماعة) مەقصەدا فەرمانا پێغەمبەرێ مە حەضرەتی فەخری عالەم عە ظە مە ت و قودرەتا خودێ هەڤالێ تفاقایە فێجا چرا ئەم دەستگیریێ و هەڤالی و ئەمری خودێ بەردن رییا شەیتانی بگرن رەضا خودێ و یا عڤدا ل تفاقیدایە ژی بێتفاقی ولاتدە تونەمایە حەموو غەریب و ژار بوونە کەتنە ولاتە و گوندێن خەلکیدە ژی ناکەسانرا حەمالی دکن ژن و زاروك ژار و رەبەن بوونە ئەدبارا مە گەهشتیە کەمالی ژبۆ خودێ ئینصاف بکن.

ئەی گەلی بەگ و مازن و ئاغایێن کوردا تفاق بکن، نەهلن شیقاق و نیفاق ببە ئێدی بەسە هونژی وەکو خەلکی مەکتەبا ڤەکن زاروا بعەلمینن صەنعەت و خوەندنێ قەدرێ سەیدا و مەلا بزانن، بێی سەیدا رییا قەنج وندا دبت، جەهل و نەزانین زێدە دبت نەهلن کەمی بت ویقار و کەمالا سەیدا هەر ژی زدەیا وانرا بشوغلن قەدری زێدە بدن وان سەیدا رەهبەری دین و قەنجیا دنیاینە (العلما ورثة الانبیا) سەیدا و مەلا وارثی ئەنبیانە، خودێ ژی قەدرێ سەیدا بگرن فەرمان دکت.

ئەو شوغلێ دەرحەقا مفتی جەزیرەیێدە بوویە عارە بێ فهیتەك مەزنە ژی بۆ حەموو کوردان، تو دین و ناموس قبول ناکن خودێ ژی نە راضییە ئەو شوغلێ نەقەنج بوویە سەبەبی شەرمیا حەموو کوردا.

ئەی قەوم و قەبیلە و عەشیرەتێن کوردا رییا باب و باپیرا بەر نەدن حەمییەت و شەجاعەت و ناموس و جامێری و صەداقەت، عەدالەت و راستی ژی باب و باپیرا ژی مارە میراثە مازین خو دڤ مروڤ هەر بزانت مازن ژی کچکا وەکو زاروی خو بزانن ئاریکارییا ژارە بکن ظولم و خرابیێ لسەر وان راکن نەهلن لبن لنگا ژارتربین.

باب کوری کوربابی دکوژە برا برای خو مام برازی، برازی مام خو دکوژە، کەس کەسی ناپارێزە، رەحما کەس ل کەسی تونە ئەڤ نەشوغلی مرۆڤانە ولات

خراب بوویە نەزان زەحف بوونە بەخت و باوەری رابوویە ئەدەب و مەعریفەت نەمایە ئەڤ رییاها نە رێکەك قەنجە نە لایق نەجابەتا کوردانە.

ڤیجا دڤێ ئەم دەستێ خو ژ کوشتینیێ ژ تالانیێ و خرابیێ بکشن فەرقا کەسی نەکن، کورد حەموو کوردن، یەك قەومن، وەلاتی و گوندیێ خۆرە خۆش ببوورینن، دەست درێژیا نەکن مال و عە رض و ئاخ و زەڤیی هەڤودو نەبن یەك دل بن غیرەتا هەف دو بکشن ظولمی نەکن بلا خودێ ژ بۆ ظالمن ظولم دکن لسەر ژارا حاضرە یا دافع البلا.

**غەزەل**

ئیسمی تەیە مەکتووب، د دیوانێ قیدەمدا
حەرفەك قەلەمی علمی ب تەقویمێ رەقەمدا
ئەشکال و خەطێ دائیرەی نوقطەی عەشقن
ئەڤ نەقش میثالی دخەیالات عەدەمدا
میم موطلەق شەمسا ئەحەد، ئایینە صفەت کر
لامع ژ عەرەب، بەرقێ ل غنمار عەجەمدا
شاهد د سەمائی بهمە وجە بناسینی
یەك مەست صەمەد کر ب یەکی نەقش صەنەمدا
یەك گرتی بە زولفێ، ب یەکی خال نومائی
ئایینە ب ئەسکەندەر، هەم جامی جەمدا
ئەرواحێ موقەدەس شەبێ قەدر، تە دخوازن
نورا تەیە مصباح، د قەندیلێ حەرەمدا
دا وەقتێ لقائی ب تەحەی بن د بقائی
من نەقد، دل و جانی زمنائی بسەلەمدا
یاقوت فرۆشان شکست ب کەف ئالماسی
ئەڤ صەفحەی ئەلماسە کو نەقاش، قەلەمدا
شوکری ژی خدائی کە ب عەبدێ خوە (ملا)ئی
ئەکسیر غەمیێ عشقە د دینار و دەرەمدا

مەلایێ جزیری

***

مەتبەعا میرا ما بە ل ئیفتیخارا کوردانە قەلبی هەرپیای کوردان قـەلبی وانـا و پر مەسرور کیر یەکی حەتا نوها ئەڤ سـروره نەدیتـە و قـەدەرا کـوردان و علویـەت شەرەفا وانا بتەمامی رویا هەر ملەت دایە حالبونی حەتا ڤی وەقـت ملـەتا کـوردان بـەر چـاڤێ هـەر ملـەتان و پـر حـەقیر بونـەکی ئـەحماقی وانـان تشـبها کـوردان دیکرین... مەثەلا کورت میش (کورز کبی) و پر ضەربا مە ثـە ل دهـانین حالبوکـە عـەقل و زەکـاوەت و علـم و درایـەت و زوهـد و صـەلاحیەت و سـەخا و شـەجاعەتا کوردان نەظە ر ئینکار نینە، وەفا کەلاما ژی لیٚ درایەتا وانە دەلالـەت دیکـە کـی.. العقل عشرة واحد للاقالیم وتسعة لورائي مانهر، وورائي مانهر ژی مەسکەنا کوردانـە ئیشتە حەمو کوردان ل مەتبەعا میران تەشەکورا مەزین دیکەنە وەئەزیٚ فەقیر ژی قات قات تەشەکورا خو تەقدیم و تەبریك دیکم.

مەئموری نفوسی عەینتاب

حاجی حەسەن تەحسین

**پاشی**

### وەلاتی دڤیٚ چاوە بن

جەریـدا دەریـنن، کتێبـا چـێکن، دا مـەثـەلا ئـەناتۆلیٚ محەمـەد داییـك، ل کوردسـتانیٚ عـەلۆك، حەسـەنەك لپـاش جـوتی خـوە بچـر و بزانبـە مەحکومـەتی، لئەستەمبۆلی چە دبت، ئەم وەبێژنگی ناظری مالیەیی ئیرۆ ل مەجلیسا مەبعوثانـی ژویر کوو قامچوریرە تشـتن گۆتنـە، جەریـدانویس، هـاتی وەلات، دونـە خونـداییٚن کورداتی بزانین، دوی جوتیار و شوانی پەزی ژی قەنجی و خرابیا وان خەبەر ئەسح بکن.

ئان وەکە بەری هەر چـە ببـت ئـەم بێـژن ئیشـی دەولەتییەلـە سەراسـەر ئـەو سەرچاوا. ئەم توجا نابن مەرو وەلات ژی مـەرە نامینـە. ئـەمیٚ بکـەڤن بـن لـنگ و صەحی هەسبیٚ دژمنادا.

گەلی کوردینۆ : پێغەمبەریٚ مە صلی الله تعالی علیه وسـلم گۆتییـە مـە هـون کریکن، لـیٚ هـەر یـەك ژ وە شـوانی وی کریەیـە، دویٚ ئـەم چـاو کـن، ژویٚ ئـەمریٚ پێغەمبەر ئەم بزانین کو، کچەك مەزن هرا یەك ژ مە دڤیٚ حەج خرابیا بینـە بێـژە و قەنجیا وەلات و وەلاتیارە چە چە هەبە نجازە. هەکە مە وە کر، حکومەت ژی ئـیٚ

بزانه کی مه چاڤێن خوه ڤەکری یه ئەم بهش بینه، ئەبەدی کەس نکاره خرابیێکی لمه بکه ژ قەنجیا مه چه هەبت وی بدن مه.

ژ خوه لسەر وی کی مه ئەو جەریدا هه بکرمانجی دەردانی و نهۆ ژی مه دەرانی، گوه بدن مه، مه ژ قەنجیا وه ره دەست هلانیه. هەکه هون ژی گوه بدن مه، خدێ تەعالا ئینشائەللا ئەی جنسێ مه کوردا ژی وەکه قەومێن دی بلند و سەرفراز بکه، لێ هەکه نه ئەمی هەر ژار و رەبەن لبن دەستێ خەلکی ده وەکه خلامان بن.

صالح بەدرخان

### ئاگاداری

### شەرحی قەصیدەی بوردیە بە تورکی

ناوی بە خۆیەوەیە، لە هەمان کاتیشدا توانای شیفابەخشینی لەو وزەی کزەبا نەرمەدایە کە لێیەوە شنە دەکا. قەسیدەی بوردیە کە لای هەموو خاوەن ئیمانان ئاشکرایە. ئێستا شەرحی بە تورکی لەلایەن چاپخانەی (اخوّت)ەوە دەرچووە. چاپخانەکە دەستی کردووە بە دابەشکردنی بەسەر ئاشقان و هەوادارانیدا. ئەم شەرحی شەریفە وەکو ئەوانەی پێشوو نییە. تا ئێستا وێنەی نە بە نووسراوی نە بە چاپکراوی دەرنەکەوتووە.

شەرحەکە بەم شێوەیە ڕێکخراوە.

١. بەیتە پیرۆزەکانی قەسیدەکە
٢. وشە بە وشە ئیعرابکردنی
٣. مانای پیرۆزی بە تورکی
٤. بەیتێك بە فارسی
٥. بەیتێك بە تورکی

(٤–٥) *لەگەڵ وەرگێڕان و بەراوردکردنیان*

هەموو خوێنەران و شاگردان دەتوانن سوود لە خوێندن و خوێندنەوەی وەربگرن و لە ماناکانی بگەن. لەم ڕووەوە بۆ هەموو ئەوانەی خوازیاری خوێندن و سوود وەرگرتن و تەبەڕوکن لێی دەرفەتێکی بێ هاوتایە.

ئەحمەد سوڕەیا
چاپخانەی ئوخووەت

